









# جیهانی جنۆکەو شەیتانان

وەرگێڕانی

ژیوانی گەلاڵی

مەبەست لەم زنجیرەیە

# زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداریی و رابوونی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت وبەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتیی و تاکڕەویی و رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خودای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستووریشمان لەوەرگرتن فەرمایشتەکەی خودای پەروەردگار بێت.

﴿ الذِّينَ يَسْتَمعونَ القَولَ فَيَتَّبِعونَ أَحسَنَهُ؛ أُولئكَ الذِّينَ هَداهُمُ اللهُ وَأُولئكَ هُمْ أُولوا الألباب﴾ .

(زمر - ١٨)

نووسینگەی تەفسیر



بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی

قورئان و سوننەتدا

# جیهانی جنۆکەو شەیتانان

نوسینی

دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر

وەرگێڕانی

ژیوانی گەلاڵی

زنـــجـيرەی: بیروباوەڕ لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان‌و سوننەتدا
ناوی کتێب بە عارەبی: عالم الجن والشیاطین
ناوی نوسەر: دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر
نۆرەی چاپ: شەشەم
ساڵی چاپ: ١٤١٢ك – ١٩٩١ز
ناوی کتێب بەکوردی: جیهانی جنۆکەو شەیتانان
ناوی وەرگێڕ: ژیوانی گەلاڵی
ئەرکی چاپ: پرۆژەی وەرگێڕان
پیتچنـین: نووسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ١٤٢٠ك – ٢٠٠٠ز
چاپکردن: چاپخانەی پەروەردە
تـــــیراژ: ١٥٠٠
ژمارەی سپاردن: ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠

## پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارترو بەرهەمی بەپیزترو پیزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کە گەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی خستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێویو داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی رەهاکرد، باڵی بەزەیی‌و دادگەری بەسەر جیهاندا راهێڵاو سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت وبڕو تالان و بڕۆ و بەرهەڵدایی‌و بێئابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەری‌و رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاری‌و خۆشی‌و دادو رێزو هێمنی‌و خۆشگوزەرانی‌و ئازادی‌و سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە دێتەدی، بەڵام تەقینەوەی بورکانی وێرانی‌و خراپەکاری‌و ناخۆشی‌و ستەم و بێهودەیی‌و نیگەرانی‌و تاڵگەردی‌و ژێر دەستەیی‌و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامییەوە بەرپادەبێ، چونکە هەمویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندیناسی و هزری کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانەو وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیات نان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە

سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی ، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کەبەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ (مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانیو سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دوجەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی؟!، ئەدی هەر بیروباوەڕە شەیتانیەکان نیە کە وای کردوە هەموو رۆژی بۆمبای ئەتۆمیو هایدرۆجینیو نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتیو زەوی وەبەرهەم بێ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی بزاڤێکەوە دەبێ کە لەسەر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێو لەقورئان و سوننەت هەڵێنجرا بێ، ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپادەبێو مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتوە، کاریگەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکارو دڵڕەق و بێبەزەییو وێرانکاریش بێ، سەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هەمو لایەنەکانی بگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ئیسلامی چارەسەرو ئامۆژەکانی بۆ رەگ و ریشاڵی مرۆڤە، هزرو ئاوەزو دەرونی

ڕێك دەخاتەوەو تەپ و تۆزی شەیتان و هەوەست و خۆپەرستی لەسەر دەرونی لادەدات و پاکی دەکاتەوە، ئەمجار ڕێوشوێنێکی ڕاستاڵی بۆ ڕادەنوێنیێو پێی دەڵێ فەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنەو نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروباوەڕەوە یان لەهەر گۆشەنیگایەکەوە تێی ڕوانیبێو خزمەتێکی پێشکەش کردبێ و متمانەی بەسەرچاوەی بێگەردو دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ، هەڵبەت کارێکی گەورەی ئەنجام داوەو خزمەتەکەی بەشێکە لەم ڕزگاربونە سەرتاسەریەی کە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەوداڵە. دیارە ئەم زنجیرەیەی کە دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر نوسیویەتیو ناوی ناوە ((العقيدة في ضوء الكتاب والسنة)) بەشداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیە، کە متمانەی کردۆتە سەر سەرچاوەو ژێدەرە ڕەسەنەکانی بیروباوەڕو بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێو ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوەو پاك و پوختەکەی ڕاگەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لەڕانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادەو ڕێك و پێك و زانستیانەی بەکارهێناوە بەتایبەتی لەپەرتوکەکانی دواییدا، ناوەڕۆکی پەرتوکەکەش پڕ ئایەت و فەرمودەو دەقی زانا بەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەرتیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی ڕۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسەریش لە نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ چاکیو سودی ئەم

زنجیرەیـە، بـەم پێودانگـە پێمـان وایـە وەرگـێڕانی ئـەم زنجیرەیـە گـەلێك پێویسـت بـو بـۆ رابونـی ئیسـلامی لەکوردسـتان. تـا گـەلی کوردیـش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خـۆی حالّی بێت و لاڕێ نـەبێ، لەبـەر گرنگـیو لەبەر چاکیو بەهرەی ئەم زنجیرەیە، پشت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی. لەوەرگێڕانەکەدا هـەوڵمان داوە ئاستێکی زمانـەوانی باشـی پـێبدەین و ئیشـکالات بـۆ خوێنـەر بەجێنـەهێلین، وا بەرهەمـەکان لەبەردیدی خوێنەرانەو ئەوان دەتوانن وەرگێڕانەکە هەڵسـەنگێنن ، لـەخوا داواکارین لەکارەکەماندا سەرکەوتووبین و توانیبمان خزمەتێك بەم رابونـە پـیرۆزەی کوردسـتان بکـەین، خـوا پاداشـتی بەرهـەراوی خـۆی بەئێمـەو ئێوەش ببەخشێ.

ئارامی گەلاڵی          ژیوانی گەلاڵی

# پێشەکی

ان الحمد لله نحمده ونستعينه و نستغفره ونستهديه ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا، من يهده الله به فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمداً عبده ورسوله، وبعد:

هەندێ کەس وا گومان دەبەن، نوسین لەم بابەتە وەبەر زێدەڕۆیی زانستی دەکەوێ جا ئەوانە وایان پێ چاترە هەر بە خێرایی بەم بابەتەدا ڕەتبن و بڕێکی کەم بیرکردنەوەی بۆ تەرخانکەن. ئەو کەسانە وا دەزانن ئەم تۆژینەوەیە تەنها قیچە سودێکی دیاریکراو دەبەخشێ و، هیچیشی لێ نەزانن چ زیانێکی نیە.

ئەز گەلێك دور ناڕۆم، جیهانی مرۆڤ ئەمڕۆ هێندە ماڵ و سامان خەرج دەکەن بۆ لێکۆڵینەوەی ئەگەری بونی ژین و

زیندەوەران لەو هەسارە نێزیکانەی خۆمان. کە شارو وڵاتانی پێ بنیات بنێ و ئاوەدان کاتەوەو، هەزاران ملیۆن هەژار و دەستکورتی لە دنێدا پێ قوتارکا. جا زانایان کۆشش و ماندو بونێکی مەزنیان کێشاوە بۆ گەڕان لە دو شونی ژین لە هەسارانەدا کە کات و پارەیەکی زۆر و زەبەندی تێچوە. ئەدی بۆ جیهانێکی زندوی ژێر چ دەڵێن کە لەزەوی دا هاوژینمانن و. لە ماڵ و نشینگەمان دەخۆن و دەخۆنەوە و، رەنگە ئاوەزو دڵمان ئاڵۆز بکەن و، جار هەیە بەرەو ئەوەمان دەبەن هەر بەخۆ خۆمان بڕۆخێنین و، خوێنی یەکتری بڕێژین و، رەنگە بمانکەن بەبەندەی خۆیان یا هەر ئافەریدێکی دیکە، تاکو پەروەردەگارمان لێ تۆڕە بێ و غەزەبمان لێ بگرێ، پاشان ئەوانەی وێڵ و گومڕا دەبن لە پەروەردگار دوچاری ئاگری دۆزەخ دەبن.

ئەو زانیاریانەی دەقەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمودە پتەوەکانی پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە بۆیان هاوردوین؛ بەهیچ سامانێك هەڵناسەنگێن. چونکە ئەو دەقە پیرۆزانە، رازو نهێنیەکانی جیهانی جنۆکانمان بۆ ئاشکرا دەکەن و، بە لێشاوێك زانیاری وا وەها نامان دێن، کە هەمو لایەنەکانی ژیانی ئەوانمان لا ئاشکرا دەکات. هەروەها ئەوەشمان پێ دەڵێن کە هەندێك لەوان چ دژایەتیەکیان بەرانبەر مرۆڤ و دڵی داگرتوە و. لە چ کردو کۆشێکی بەردەوام و نەپچڕاودان تا لە راستە ڕێمان وە دور بێخن و گومڕاو سەگەردانمان بکەن.

هێندەش بەسە تا لە گرنگی مەسەلەکە وە ئاگات بێنێ؛ چاو بەو ئایەتە پیرۆزانەدا بگێڕی کە لە بابەت جنۆکەو شەیتانان دەدوێن. تا بزانی ئەم دەقانە روبەرێکی چەند فراوانیان لە کتێبی خوا داگرتوە.

ئەوجا هەرکەسێکی سەربەو دەقانەدا بگرێ، دەزانێ ژیانی مرۆڤ تەنیا زۆرانێیە لەگەڵ شەیتاندا. شەیتان لە هەوڵی ئەوە دایە بەسەریدا زاڵ بێ و بیفەوتێنێ. ئەو مرۆڤەی کە خوای گەورەش بە روناهی خۆی هاتۆتە هانای دەکۆشی تا لە شاڕێ ی پەروەردگاری سەقامگیرو بەردەوام بێ و خەڵکیش لەسەر ئەم شاڕێیە دامەزرێنێ. لە پێناو هەندێش دەبێ لە ناخی دەرون و ترپەی دڵ و، هیواو خەون و ئاواتەکانی‌دا، کێشەو زۆرانێ لەگەڵ ئەم دوژمنە بەرپا بکا. دەبێ هەر زو زو، بەردەوام ئامانج و مەبەستە دورو نزیکەکانی بپشکنێ و بەسەریانکاتەوە. تا دوری و نزیکی خۆی لە پەروەردگارەوە، بۆ دەرکەوێ. بشزانێ تا کوێ خۆی لەو دوژمنەی دەرباز کردوە کە دەیەوێ وەك کەری جوتیاران جڵەو گیری بکاو بیهاژوا.

منیش ئەو دەقانەم کۆ کردۆتەوە کە لە بارەی ئەم جیهانە دەدوێن، لەگەڵ قسەی پێشەوا دیارو ناودارەکان و لە هەموشیان راماوم. لە ئەنجامدا ئەم کتێبە لەشەش بەندان پێك هات، بەندی یەکەم ناساندن و رونکاری ئەم جیهانەیە و ئەم بابەتانە

دەگرێتـەوە: بنـەڕەتیان، ئـەفراندنیان، ناوەکانیـان،جۆرەکانیـان، خواردنیـــان، خواردنـــەوەیان، هاوســـەرێتیان، نشـــینگەیان، چارەوێکانیان، ئەو تواناییانەی کە خودا پێی بەخشیون. هەر وەك لە میانـەی ئەو بەندەدا، ئـەوان بـەڵگانیش بەسـەر دەکەینـەوە کـە هەبونیان دەسەلمێنێ و، وەڵامی بێباوەڕان دەداتەوە.

لە بەندی دوەمیشدا مەبەستی ئافەریدکردنیان رون دەکەینەوە، لەگەڵ چۆنێتی راگەیاندنی دەستورە خواییەکان و تێکڕای پەیامی موحەممەدیشﷺ بەم جیهانە.

هـــەرچی بـــەندی سێیەمیشـــە کرۆکـــی کتێبەکەیـــەو چـــەند تۆژینەوەیەکی تێدایە:

یەکەم: هۆکانی دژایەتی لـە نێـوان مـرۆڤ و شـەیتانو، بەڵگـە هاوردن بۆ توندیو قوڵی ئەو دژایەتیـەو. ئاگادارکردنـەوەمان لـە لایەن خوداوە لەو دوژمنە.

دوەم: ئامانجە نزیك و دورەکانی شەیتان.

سێیەم: شێوازەکانی شەیتان بۆ گومڕاکردنی مرۆڤ.

چوارەم: سەرکردایەتی کردنی بۆ جەنگ و، سەربازەکانی.

پێنجەم: ئەو تەڵەو داوانەی شەیتان بۆ مرۆڤیان دەنێتەوە.

جا ئەم بەندە بە باسی وەسوەسەی شەیتان کۆتایی هاتوە، کە چەك و جبەخانەی شەیتانە بۆ گەندەڵ کردنی دەرونان و، چاندنی گەندی لە دڵاندا.

هەروەها لە بەندی چوارەمدا، باسی چەند دۆزیکم کردوە کە شەیتانەکان بەندەکانی پێ گومرا دەکەن:

یەکەم: خۆڕانواندنی شەیتانان و قسە کردنیان لەگەڵ هەندێك بەنداندا، لەگەڵ ئەو گەندەڵیانەی بەم هۆیە دێنە ئارا.

دوەم: هێنانی گیانان و رادەی دروستی ئەم مەسەلەیە و پەیوەندی بە شەیتانانەوە..

سێیەم: بڕی شارەزایی جنۆکان لە جیهانی پەنهان و، ئەو گەندەڵیەی دێتە ئارا بە هۆی بڕوای هەندێ کەس بەوەی کە جنۆکە پیوار دەزانن.

چوارەم: جنۆکەو دەفرەفڕیوەکان.

لە بەندی پێنجەمیشدا ئەو چەکانە دیاری دەکەین کە دەبێ بابای موسڵمان هەڵیانگرێ کە دەچێتە شەڕی شەیتان.

لە بەندی شەشەم ودواییندا لە بارەی حیکمەتی ئەفراندنی شەیتان دواوم.

له خودای بەرز داوا دەکەم، بەم کتێبە سود بە نوسەرو، بڵاوکارو. خوێنەری بگەیەنێ و، پاداشتی بێپایانی خۆی بە هەموان ببەخشێ و پەنامان بدا لە شەیتان و، بە یاریدەرو چاودێری خۆی پشتیوانیمان بکا. خودا باشترین پشتیوان و سەرخەرە. درودو سڵاوی خوداش پێشکەشی موحەممەدی بەندەو پەیامبەری خۆی و هەمو خانەوادەو یارو هاودەم و شوێنکەوتوانی.

عومەر سلێمان ئەشقەر

کوێت ٢٨/ شەوال/١٣٩٨ ك

٣٠/ سێپتەمبەر/١٩٧٨

# ناساندن و رونكاری

## جنۆكه چین؟

جنۆكه جیهانێكی دیكەن جودا له جیهانی مرۆڤ و له جیهانی فریشتان، لەگەڵ مرۆڤدا بڕێكی هاوبەشیان له نێواندا هەیەو هەردولا سیفەتی ئاوەزو پەیبردنیان هەیەو، توانای هەڵبژاردنی رێگەی خێرو شەڕیان تێدا. لەزۆر شتانیش له مرۆڤ جوایەزن، گرنگترینیان ئەوەیە سەرچاوەو بنەڕەتی جنان له هی مرۆڤ جودایه.

ناوی جنۆكەكانیش لە(اجتنان)ەوە هاتوە كەمانای ونبون لەبەرچاوان دەگەیەنێ. ﴿ إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ: بەراستی شەیتان و هاودەستانی لەلایەكەوە ئێوە دەبینن كەئێوە ئەوان نابینن ﴾ (سورة الأعراف/٢٧).

## نەژادو بنەڕەتیان:

خوای گەورەو بەرز پێی راگەیاندوین كە جنۆكە لە ئاگر ئەفرێنراون، دەفەرموێ ﴿ وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ: وە لە پێشدا هۆزی جنۆكانمان لە ئاگری گەرم و سوتێنەر هێنا ئەفراندن ﴾ (سورة الحجر/٢٧)..

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ: وە خودا جنۆكەی لە بلێسە ئاگری پاك و چاك ئافەریدە كرد ﴾ (الرحمن/١٥)، هەر وەك لە(البداية والنهاية ٥٩/١) وا هاتوە كە ئیبنی عەبباس و عیكریمە و موجاهید و حەسەن

و هی دیکەش وا دەڵێن. هەروەها نەوەوی لەشەرحی موسلیمدا دەڵێ(مارج) واتە: بڵێسەیەکی تێکەڵ بەڕەشایێ ئاگر.

لە فەرموودەیەکیش کە موسلیم تەخریجی کردوە، لە عائیشەوە، لە پێغەمبەرﷺ، فەرموی ((خلقت الملائكة من نور، وخلق الجان من نار وخلق آدم مما وصف لكم: فریشتە لە روناهی ئەفرێنراون و جنۆکەش لە ئاگر ئەفرێنراون و ئادەمیش لەوەی بۆتان وەسف کراوە هاتۆتە ئەفراندن)).

**کەینێ ئافەریدە کراون؟**

گومان لەوەدا نیە جنۆکە لە پێش مرۆڤ ئافەریدەکراون چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ۝وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ: بەراستی ئێمە مرۆڤمان لە گڵێکی ویشکی پێکهاتو لە قوڕێکی رەشی رزیو ئافەریدەکردوەو، جنۆکەشمان بەرلەوە لە ئاگری گەرم و سوتێنەر وەدی هێنا ﴾ (سورة الحجر /٢٦-٢٧).

جا ئاشکرایە بە پێی ئەم ئایەتە کە جنۆکە پێش مرۆڤ ئەفرێنراون. هەندێك لە پێشینان دەڵێن کە ئەوان دو هەزار ساڵ پێش مرۆڤ هاتونەتەدی، بەلام ئەمە هیچ بەڵگەیەکی لە قورئان یا لە سوننەت لەسەر نیە.

**ناوی جنۆکان لە زمانی عەرەبی:**

ئیبنی عەبدولبەڕ دەڵێ: جنۆکە لە لای زمانزانان چەند پایەکیان هەیە:

١- ئەگەر بەڕەهایی مەبەستیان جنۆکە بێ، دەڵێن (جنّي).

٢- ئەگەر مەبەستیان ئەوانە بن کە هاونشینی مرۆڤن، دەڵێن(عامر)، بە کۆمەڵیش دەڵێن(عمّار).

٣- که باسی ئەوانە دەکەن کە بەگژ مندالأندا دێن، دەڵێن ( ارواح).

٤- ئەگەر پیس و ناپاك بون و بەگژ خەڵکیشدا چون، دەڵێن (شیطان).

٥- ئەگەر زیاتریش پێی لێ هەڵبڕی و بەهێزتر بو، پێی دەڵێن (عفریت).

**جۆرەکانی جنۆکان:**

پێغەمبەرﷺ لەم بابەتە دەفەرموێ:(( الجن ثلاثة أصناف؛ فصنف يطير في الهـواء، وصنف حيات وكلاب، وصنف يحلـون ويظعنـون: جنۆکە سێ جۆرن: جۆرێکیان بەحەوادا دەفڕن، جۆرێکی مارو سەگن و، جۆرێکیشیان دێن و دەچن، نیشتەجێ دەبن و گەشتیش دەکەن )) رواه الطبراني، والحاكم، والبيهقي في الأسماء والصفات بأسناد صحيح(صحيح الجامع ٨٥/٣).

**هیچ بوارێك بۆ وەدرۆخستنەوەی جیهانی جنۆکان نیە:**

کەمینەیەك لەخەڵکی بەتەواوی هەبونی جنۆکان رەت دەکەنەوە و باوەڕی پێ ناکەن، هەندێك لە موشریکانیش دەڵێن: مەبەست لە جنۆکان گیانی هەسارەکانە (مجموع الفتاوى ٢٨٠/٢٤).

کۆمەڵە پیتۆلێکیش دەڵێن: مەبەست بە جنۆکان نەستە خراپەکانی ناخی مرۆڤ و هێزە ناپاك و پیسەکانێتی، هەروەك مەبەست بە فریشتانیش چاکەکانیانە.(مجموع الفتاوى ٣٤٦/٤).

هەندێك تازەگەریش دەڵێن: جنۆکە ئەو میکرۆبانەن کە زانستی نوێ دۆزیتیەوە.

هەروەها دکتۆر موحەممەدولبەهی لە راڤەی سورەتی(الجن)دا دەڵێ مەبەست بەجنۆکان هەر فریشتەیە. واتە لەلای ئەو جنۆکەو فریشتە یەك

جیهانن و جیاوازییان نیه. ئەوەیشی بەبەڵگە هاوردوە کە فریشتەکان لەخەڵکی بزرو داپۆشراون، کەسانێکیشی لەجیهانی مرۆڤان وەبەر جنۆکان خستوە کە لەنێوانی باوەڕو کوفرو لەنێوان چاکەو خراپەدا خۆ بزر دەکەن.(تفسیر سورة الجن ل٨)

**نەزانین بەڵگە نیە:**

ئەوپەڕی زانینی ئەوان کەسانی جیهانی جنۆکان وەدرۆ دەخەنەوە ئەوەیە کە هیچ دەربارەی هەبونیان نازانن. نەزانینیش بەڵگە نیە[1]. بۆ عاقڵ و هۆشمەندانیش ناشرینە شتێك رەت کەنەوە کە دەربارەی بونی نازانن و شارەزاییان نیە.

خوای گەورە ئەوەی بە سیفەتێکی کافران داناوە:﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ: بەڵکو ئەوان شتان بەدرۆ دێخنەوە، کە بە خۆیان زانستیان دەربارە نیە ﴾ (سورة یونس/٣٩).

ئایا دەبوا کەسێکی پێش سەدان ساڵ ژیابێ باوەڕ بە هاتنە دی ئەو داهێنراوە نۆێیانە نەکا کە ئێستا کەسێك ناتوانێ لە بەرامبەریان مل بادا هەرچەندە راستگۆیەك هەواڵی پێ دابێ؟

ئەگەر گوێمان لەو هەمو دەنگە نابێ کە هەمو کەلەبەرێکی گەردونی گرتۆتەوە بەڵگەیە لەسەر نەبونی دەنگەکان. هەتا(رادیۆ) داهێنراو دەنگەکانی چنینەوە ئەوجا باوەڕی پێ بکەین؟!

---

[1] جا ئەوانە بۆیان نیە ئەوە بکەنە بیانو کە لە صەحیحی بوخاریدا لە ئیبنی عەبباسەوە هاتوە کە نکوڵی دەکرد لەوەی پێغەمبەرﷺ. جنۆکەی دواندبێ و دەگەڵیان ئاخاوتبێ، چونکە لێرەدا ئیبنی عەبباس ئینکاری راستەوخۆ ئاخاوتنی کردوە نەك هی جنۆکان. لەگەڵ هەندێشدا کەسانی جگە لە ئیبنی عەبباس وەکو ئیبنی مەسعود ئاخاوتنە روبەروەکەش دەسەلمێنن.( ئەوەی بەڵگەیەکیشی ئەزبەربێ بیانوە لەسەر ئەوەی هیچی ئەزبەر نیە).

**راستیەکەی:**

راستی قسان ئەوەیە جنۆکە جیهانێکی سێیەمن جگە لە جیهانی فریشتەو مرۆڤان، ئافەریدەی ژیرو هۆشیارن و تێدەگەن، نە ئاهۆن و نە میکرۆبن، بەڵکو جیهانێکی ئەرکبارن و فەرمانیان پێ کراوەو نەهیان لێ کراوە.

**بەڵگەکان:**

**١-تەواتور:**

ئیبنی تەیمیە لە( مجموع الفتاوی ١٩/١٠)دا دەڵێ: هیچ یەکێك لە تایەفەکانی موسڵمانان نەنکوڵییان لە هەبونی جنۆکان هەیەو نەلە هەناردنی موحەممەدﷺ وەك پەیامبەری خوا بۆ جنۆکان، جەماوەری هەمو تایەفەکانی کافرانیش بونی جنۆکان دەسەلمێنن، هەرچی کتێبیەکانیشن لە جولەکەو دیانان ئەوا وەکو موسوڵمانان دان بە هەبونی جنۆکاندا دەنێن.

لەگەڵ ئەوەی کە تێیاندا هەیە باوەڕی پێ نیە. هەروەکو لە نێو موسوڵمانانیش هەوا هەیە وەکو جوهمیەکان و موعتەزیلەکان، لەگەڵ ئەوەی جەماوەری تایەفەکەو پێشەواکانی دانی پێدا دەنێن.

ئەمەش چونکی هەبونی جنۆکان بە تەواتورێکی تەواو و زانراوەوە لە هەواڵی پێغەمبەرەکاندا هاتوە. ئەوەشیان دەربارە زانراوە کە زندوی ژیرو خاوەن هۆشن و کارای خاوەن ویستن، بەڵکو فەرمانیان پێکراوە و نەهیشیان لێ کراوە، هەروەها ئاهۆ و سیفەتی پابەند نین بە مرۆڤ و غەیری مرۆڤ. هەروەکو هەندێك بێباوەڕان وادادەنێن، جا کاتێك مەسەلەی جنۆکان بە تەواتورێکی وا لە پێغەمبەرانەوە هاتوە کە زاناو نەزان دەیزانن، هیچ کۆمەڵێك کە خۆیان بدەنە پاڵ پێغەمبەرە پایەدارەکانەوە، نەیان توانیوە بێباوەڕی لە ئاست بنوێنن.

هەروەها لە لاپەڕەی (١٣)دا دەڵێ: (سەرجەم کۆمەڵانی موسوڵمانان دان بە بونی جنۆکاندا دەنێن، هەروەها جەماوەری کافران وەکو تێکڕاو ڕەشۆکی ئەهلی کیتاب، هەروەها تێکڕای هاوبەشدانەرانی عارەبان و بێجگە لەوانیش لە منداڵانی حام و، هەروەها جەماوەری کەنعانییان و یۆنانیەکان لە منداڵانی یافث، کەواتە جەماوەری هەمو تایفەکان دان بە بونی جنۆکاندا دەنێن.

٢- دەقەکانی قورئان و فەرمودە:

هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ: بڵێ: سروشم بۆ کرا کە تاخمێك جنۆکە گوێیان بۆ قسەکانم ڕاگرت﴾ (سورة الجن/١)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا: بەڕاستی پیاوانێك لە مرۆڤ پەنایان وەبەر پیاوانێکی جنۆکان دەبرد، جا ئەوانە دەبونە هۆی زێدە بونی لاڕێیی و مل بادانیان﴾ (سورة الجن/٦). دەقی دیکەش گەلێك زۆرن، خودا یار بێ زۆربەیان لە میانەی ئەم کتێبەدا دێنە بەرباس.

٣- دیتن و چاوپێکەوتن:

خەڵکێکی زۆر لەسەردەمی ئێمەو لە پێشوشدا شتێکی لەم بابەتەیان بینییوە، ئەگەرچی زۆر جار ئەوانەی دەیانبینن یان دەیانبەن نازانن ئەوان جنۆکەن، جا دەڵێن ئەوانە ئەرواحن یا پیاوانی غەیبن یا پیاوانی بۆشایی ئاسمانن.

جا کەسانێکی متمانەدار لە زوەوەو لە ئێستادا باسی چاوپێکەوتنی جنۆکانیان بۆمان گێڕاوەتەوە. هەروەك زانایەکی هێژاو پایەدار کە ناوی

نەلئەعمەشە دەلیّ: جنۆکەیەك ھاتوچۆی دەکردین، من پێم گوت: چیتـان لـە ھـەمو خواردنێك لا خۆشترە؟ گوتـی برنـج، گوتـی: ئـەوجا برنجمـان بـۆ ھێنـان، دیتم ھەر پاروە برنج بەرز دەبتەوەو کەسیش نابینم، گوتم: ئێوەش ئەم جۆرە ھەوەسـبازیانەتان تێدایـە کـە لـە نـاو ئێمـەدا ھـەن؟ گوتـی: بـەڵێ، جـا گـوتم: رافیضەکان چۆنن لەناو ئێوەدا؟ گوتی: خراپترین کەسن.

ئیبنـی کـەثیر پـاش ھێنانـەوەی ئـەو چیرۆکـە دەڵـێ: ئـەم ئیسـنادەم بـە ئەبولحەججاجی ئەلمزی مامۆستام پێشاندا، گوتی: ئەمە ئیسنادێکی صحیحە تا دەگاتە ئەلئەعمەش، پاشـان دەڵێ: ئیبنـی عەسـاکیری حـافیز لـە ژیاننامـەی عەبباسی کوڕی ئەحمەدی دیمەشقیدا دەڵێ: شەوێك کە لە ماڵێدا بوم گوێم لێ بو جنۆکەیەك دەیگوت:

قلوب براها الحب حتى تعلقت

مذاهبها في كل غرب وشارق

تهيم بحب الله، والله ربّهــــــا

معلقة بالله دون الخلائــــــق

واتە: دڵانێك خۆشەویستی دایتاشین ھەتا وای لێھات رو لە ھـەمو خۆرەڵات خۆراوایـان بکـەن. ئـەوان دڵان بـە خۆشـەویسـتی خـودا سـەرگەردانن و خـوداش پەروەردگاریانەو، وە لەھەمو ئافەریدان ترازاون و بەخوداوە پەیوەستن (قسـەی ئیبنی کثیر تەواو)..

منیش دەڵێم: گەلێك کەسی جێمتمانە باسی ئەوەیان بۆ کردوم، کە قسەیان لەگەڵ جنۆکاندا کردوەو جنۆکەیان دیون، جا بەیاریدەی خودا برێکیش لەوانە باس دەکەین کە دێینە سەر باسی توانای خۆ گۆڕینیان بەشێوەی جۆراو جۆر.

٤- ئەو بنەڕەتەی لێی ئەفرێنراون:

پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێداوین کە فریشتە لە روناهی ئافەرید کراون و جنۆکەش لە ئاگر ئەفرێنراون، جا هەردو بنەڕەتی جوایەز کردۆتەوەو، ئەمەش وەڵامە بۆ ئەوان کەسانی جنۆکەو فریشتە لێك جودا ناکەنەوە.

دیتنی کەرو سەگان بۆ جنۆکان:

ئەگەرچی ئێمەش جنۆکان نابینین، گیانەوەری دیکە هەن دەیانبینن وەکو کەرو سەگان. لە موسنەدی ئەحەمەد و سونەنی ئەبو داود بەسەنەدێکی راست و بەمەرفوعی لە جابیرەوە هاتوە:((اذا سمعتم نباح الكلاب، ونهيق الحمير بالليل، فتعوذوا بالله من الشيطان، فانهن يرون مالا ترون: ئەگەر گوێتان لە وەڕینی سەگ بو، یا بەشەو گوێتان لە زەڕینی کەر بو، خۆتان بەخودا پەنابگرن لە شەیتان، چونکە ئەوان شتانێك دەبینن کە ئێوە نایبینن)). ئەمەش شتێکی نامۆ نیە، چونکە زانایان سەلماندویانە هەندێك گیانەوەر توانای دیتنی شتی وایان هەیە کە ئێمە نایانبینین. بۆ نمونە؛ هەنگ تیشکی ژور وەنەوشەیی دەبینێ، هەر بۆیە ئەگەر هەوریش بێ دەتوانێ خۆر ببینێ و، کوندەبۆش لە جەرگەی تاریکی شەودا مشکێك بەدی دەکا..

# شەیتان و جنۆکە

ئەو شەیتانەی کە لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا خودای گەورە باسی بۆمان کردوە، لە جیهانی جنۆکانە، لەسەرەتادا خودای دەپەرست و لەگەڵ فریشتەکاندا ئاسماننشین بو، چوە بەهەشتیش، پاشان لەبەر زلفیزیو خۆ بەرز زانین و ئێرەیی بردن لە پەروەردگار یاخی بو، کاتێك فەرمانی پیکرد سوژدە بۆ ئادەم ببا، ، ئەوجا خودا لە رەحمەتی خۆی وەدەرینا.

شەیتانیش لە زمانی عەرەباندا بە هەمو زلفیزێکی یاخی دەگوترێ، لەبەر فیزداریو یاخیبونی لە پەروەدگار ئەم ناوە بەسەر ئەو ئافەریدەیە دابڕاوە.

هەروەها(تاغوت)یشی بەسەردابڕاوە ﴿ الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا: کەسانێك کە بڕوایان هێناوە لەڕێگەی خودا دەجەنگن و، کەسانێکی کافریش بون لە پێناو تاغوتدا دەجەنگن، جا دژی دۆستان و یارانی شەیتان بجەنگن، بەڕاستی فڕوفێڵی شەیتان کزو کەم هێزە ﴾ (سورة النسأ /٧٦)، تاغوتیش ناوێکە لەلای زۆربەی نەتەوەکانی سەر زەوی بەهەمان بێژە هاتوە، هەروەکو عەققاد لە کتێبی(ابلیس)دا باسی دەکا. بۆیەش بە تاغوت ناوبراوە چونکی سنوری خۆی بەزاندوەو، لە پەروەردگاری یاخی بوەو، خۆی کردۆتە خواوەندێکی پەرستراو.

هەروەها ئەو ئافەریدەیە لەمیهری خوا بێهیوا بوە، بۆیەش خودای گەورە بە (ابلیس) ناوی بردوە، لە زمانی عەرەبیشدا (ابلیس) واتە: کەسێك کە خێرو چاکەی لا نەبێ و(أبلس) واتە بێهیواو پەشۆکاو.

کۆمەڵێکیش لە زاناکانی پێشیش دەڵێن: پێش یاخی بونی ناوی (عەزازیل) بوە، خودای بەرزیش دەزانێ ئەمە تا کوێ راستە.

## شەیتان ئافەریدەیە:

ئەوی چاوێك بەو ئایەت و فەرمودانەدا بگێڕێ کە لەبارەی شەیتانەوە هاتون دەزانێ کە ئافەریدەیەکی ژیرەو توانای پەی پێبردن و جوڵان و... هەیەو وانیە کە هەندێك نەزان باسی لێوە دەکەن: (کە گیانی خراپەکاری وشەڕە لە غەریزە ئاژەڵیەکانی مرۆڤدا خۆی دەنوێنێو ئەگەر پێی بکرێ بەها گیانیە باڵاکان لە دڵدا لادەبا) (دائرة المعارف الحديثة ص٣٥٧).

## نەژادی شەیتان:

پێشتر گوتمان شەیتان لە جنۆکانە، بەڵام هەندێك لە پێشین ولە پاشینان کێشەیان لەبابەت ئەم مەسەلەیە هەبو، بیانوشیان ئەو ئایەتە بوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ: ئەو دەمەی بەفریشتەکانم گوت: سوژدە بۆ ئادەم ببەن. بێجگە لە ئیبلیس هەموویان سوژدەیان برد، ئیبلیس نافەرمانی کردو خۆی بەزل زانیو بوە یەکێك لە کافران ﴾ (سورةالبقرة /٣٤).

هاوشێوەکانی ئەم ئایەتەش هەر بەبەڵگە دێننەوە کە خودا ئیبلیسی لە فریشتان ئاوارتوە و باویش وایە کە هەڵاواردن لە نێوان دو بەشی هەمان جۆر دەبێ.

کتێبەکانی تەفسیرو مێژوش کۆمەڵێك گوتەی زانایانیان بۆمان هێناوە، دەڵێن گوایە ئیبلیس لە فریشتان بوەو، دەرگەوانی بەهەشتێ بوە، یان هی ئاسمانی دونیایێ و لە رێزدارترین و هێژاترینی فریشتان بوە... تا دوایی ئەو گوتانە. ئیبنی کەثیر لە تەفسیرەکەیدا (٣٩٧/٤) دەڵێ: (لە پێشینەکانەوە گەلێك شت لەم بابەتەوە هاتون و زۆربەشیان ئیسرائیلیاتە و بۆ سەیرکردنێ دەهێنرێنەوە، خوداش ئاگادارو زاناترە بەباری زۆربەیان. هی واشی تێدایە بتوانین یەکجاری بە درۆی دابنێین چونکە پێچەوانەی هەقەکەی لای ئێمەیە. ئەوەی لە قورئانیشدا هاتوە مایەی دەستبەردار بونە لە هەمو هەواڵەکانی پێشوتر. چونکە ئەو هەواڵانە لە گۆڕین و زیادو کەمی بێبەش نین و، گەلێك شتیان تێئاخنراوەو، حافیزی لێهاتوی واشیان نەبوە کە لە گۆڕانکاری و زێدەڕۆییو پێهەڵبەستان بیانپارێزی، هەروەکو ئەم ئوممەتە پێشەواو زاناو، سەروەرو، پارێزگارو، چاکەکار و پایەدارانی هەیە لەڕەخنەگرو حافیزی لێهاتو و بە توانا کە فەرمودەیان تۆمار کردوەو، صەحیحەکەیان لە چاکەکەو، ئەو لە لاوازەکەو ئەو لەمونکەرەکەو، ئەو لە هەڵبەستراوەکەو، ئەو لە وازلێهێنراوەکەو، ئەو لە وەدرۆخراوەکە. یەك لەیەکتریان جودا کردونەتەوەو، فەرمودە دانەرو، درۆزنەکان و، نەناسرەوەکان و بێجگە لەمانەش لە جۆرەکانی پیاوانیان ناسیوە، ئەمەش هەموی بۆ پاراستنی زاتی پێغەمبەرو پایەی موحەممەدی دواهینی پەیامبەران و سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ لەوەی کە درۆی بدرێتە پاڵ، یان باسێکی لێ وەگێڕن کەلەوی دانەبێ).

ئەو شتەی دەشێکەنە بیانو، گوایە خودا ئیبلیسی لە فریشتان ئاوارتوە، ئەوە بەڵگەیەکی بڕەر نیە، چونکە رەنگە جۆری ئاوارتنەکە (الأستثناء

المنقطع) بێ، بەڵكو هەر واشە. لەبەر ئەوەی دەق هەیە لەسەر ئەوەی كە شەیتان لە جنۆكانە لەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِنْ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ..: كاتێك بە فریشتانم گوت؛ سوژدە بۆ ئادەم ببەن، جا ئەوانیش سوژدەیان برد بێجگە لە ئیبلیس، ئەم لە جنۆكان بو، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچو﴾(سورة الكهف/٥٠).

بەپێی دەقی صەحیحیش بۆمان سەلماوە كە جنۆكە لە فریشتەو لە مرۆڤ جیاوازن. پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ((ان الملائكة خلقوا من نور، وان الجن خلقوا من نار، وان آدم خلق من طين: فریشتەكان لە روناهی ئافەرید كراون و جنۆكەش لە ئاگر ئەفرێنراون و، ئادەمیش لە قوڕ ئەفرێنراوە )) رواه مسلم. حەسەنی بەصری دەڵێت: تەنانەت بۆ چاوتروكانێكیش ئیبلیس لە فریشتان نەبوە.(البداية والنهاية ١/٧٩). هەروەها ئەوەی ئیبنی تەیمیەش سۆراخی كردوە ئەوەیە؛ شەیتان بە لەبەرچاوگرتنی وێنەكەی لە فریشتان بوە. بەڵام نە بە لەبەرچاوگرتنی رەچەڵەك و نەژادی لەوانە نە بە لەبەرچاوگرتنی نمونەكەی)(مجموع الفتاوى ٤/٣٤٦).

## ئایا شەیتان نەژادی جنۆكانە یا یەكێكە لەوان؟

ج بەڵگەیەكی رونمان بەدەستەوە نیە ئەوە ساغكاتەوە كە شەیتان نەژادی جنۆكانە، یا یەكێكە لەوان، هەرچەندە ئەمەشیان ئاشكراترە چونكە خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِنْ الْجِنِّ: بێجگە لە ئیبلیس كە لە جنۆكان بو﴾ (سورة الكهف/٥٠).

ئیبنی تەیمییەش بۆچونی وایە كە شەیتان نەژادی جنۆكانە، هەر وەك ئادەم نەژادی مرۆڤە (بكەڕێوە بۆ مجموع الفتاوى ٤/٢٣٥،٣٤٦).

**خواردن و خواردنەوەی جنۆکان:**

جنۆکەکان بەشەیتانیشەوە، دەخۆن و دەخۆنەوە، هەر وەك لە صەحیحی بوخاریدا لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد چەند بەردێکی بۆ بێنێ تارەتی پێ بکا، پێی فەرمو: ((ولا تأتيني بعظم ولا بروثة: نە هێسکێکم بۆ بێنە نە پارچە ریخ)). کە پاشان ئەبو هورەیرە پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد لە بارەی نهێنی نەهیکردنی لە هێسك و لە ریخ، فەرموی: ((هما من طعام الجن ، وإنه أتاني وفد نصيبين – ونعم الجن– فسألوني الزاد ، فدعوت الله لهم: أن لا يمروا بعظم ولا روثة إلا وجدوا عليها طعاما: ئەوانە خۆراکی جنۆکانن، وەفدێکی جنۆکەکانی نەصیبین هاتنە لام کە چاکترینی جنۆکانن، داوای زادیان لێکردم، منیش بۆیان لە خوا پارامەوە؛ کەبەسەر هەر هێسکێك یا ریخێك تێپەر بن خۆراکی بۆ وان لەسەر بێ)). هەروەها لە سونەنی تیرمذی بە ئیسنادێکی صحیح هاتوە: ((لاتستنجوا بالروث ، ولا بالعظام ، فإنه زاد إخوانكم من الجن: بە ریخ و بە هێسکان تارەتێ مەکەن چونکە ئەوانە زادی برایانی جنۆکەتانن )) (صحيح الجامع ١٥٤/٢). هەروەها لە صەحیحی موسلیمدا لە ئیبنیمەسعود هاتوە: ((أتاني داعي الجن فذهبت معه، فقرأت عليهم القرآن ، قال: فانطلق بنا فأرانا آثارهم وآثار نيرانهم، وسألوه الزاد فقال: لكم كل عظم ذكر اسم الله عليه يقع في أيديكم لحما، وكل بعرة علف لدوابكم ، فقال النبي ﷺ : فلا تستنجوا بهما فإنهما زاد إخوانكم: بانگهێژی جنۆکان هاتە لام و منیش لەگەلی چوم و، قورئانم بەسەردا خوێندن، دەلێ؛ جا پێغەمبەرﷺ ئێمەی برد جێپێ و شونی ئاگری وانی پیشان داین، ئەوجا داوای زادیان لێ کردبو، ئەویش فەرموی: هەمو هێسکێك بۆ ئێوەیە کە نێوی خودای لەسەر هاتبێ و بەگۆشتێتی دەکەوێتە

دەست ئێوەو، هەمو ڕیخێکیش ئالیکی چارەوێکانتانە. جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: (لاتستنجوا بهما فانهما زاد اخوانکم: تارەتیان پێ مەکەن، چونکە بژێوی برایەکانتانن)[2]))

پێغەمبەرﷺ هەواڵی ئەوەشی پێداوین کە شەیتان بەدەستی چەپی دەخوا، فەرمانیشی پێ کردوین پێچەوانەی وی بین. موسلمیش لە صەحیحەکەیدا لە ئیبنیعومەر ؓ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((اذا أكل أحدكم فليأكل بيمينه، وإذا شرب فليشرب بيمينه، فإن الشيطان يأكل بشماله و يشرب بشماله: ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی خوارد بابەدەستی ڕاست بیخوا، ئەگەر خواردیەوە بەدەستی ڕاست بخواتەوە. چونکە شەیتان بەدەستی چەپە دەخواو بەدەستی چەپیش دەخواتەوە)).

لەموسنەدی ئیمام ئەحمەدیش هاتوە: ((من أكل بشماله أكل معه الشيطان، ومن شرب بشماله شرب معه الشيطان: ئەو کەسەی بەدەستی چەپ خواردی شەیتان لەگەڵی دەخواو، ئەوی بەدەستی چەپیش خواردیەوە شەیتان لەگەڵی دەخواتەوە)). دیسان لە موسنەددا هاتوە: ((اذا دخل الرجل بيته فذكر اسم الله حين يدخل وحين يطعم، قال الشيطان: لا مبيت لكم ولا عشاء ههنا، وان دخل ولم يذكر اسم الله عند دخوله، قال: أدركتم المبيت، وإن لم يذكر اسم الله عند طعامه، قال: أدركتم المبيت والعشاء: ئەگەر پیاوێك هاتەوە ماڵی خۆی و کە وەژورکەوت و کە خواردی ناوی خوای هێنا، شەیتان دەڵێ: نە شێوخواردن نە شەومانەوەتان لێرەدا نەما. بەڵام ئەگەر لەکاتی هاتنە ژورێدا ناوی خوای نەهێنا، دەڵێ: ئێرە شوێن و جێتانە. ئەگەر کاتی خواردنیش ناوی خوای نەهێنا، دەڵێ خواردن و شوێنی خەوتان بو)) أخرجه مسلم.

---

٢ ئەگەر ئێمە نەهیمان لێ کرابێ خۆراکی جنۆکەکان گەند کەین. دیارە ئەوەشمان لێ حەرامە کە خۆراکی مرۆڤ گەندو خراپ بکەین.

ئەم دەقانەش بەڵگەن بۆ ئەوەی کە شەیتانەکان دەخۆن و دەخۆنەوە. جا چۆن مرۆڤ نەهییان لێکراوە گۆشتێك بخۆن ناوی خوای لەسەر نەهاتبێ، جنۆکە ئیماندارەکانیش ئاوا، پێغەمبەرﷺ هەمو هێسکێکی بۆ کردنە خۆراك کە نێوی خودای لەسەر هاتبێ‌و، ئەوەی بۆ بەدروست دانەناون کە ناوی خودایان لەسەر نەهاتوە. ئەوەی(بسم الله)شی لەسەر نەکرابێ بۆ جنۆکەی کافرو شەیتانان جێ دێڵن. چونکە شەیتان ئەو خواردنە بە حەڵاڵ دەزانێ کاتێك ناوی خودای لەسەر یاد ناکرێ. هەر لەبەر هەندێ هەندێك زانا وای بۆ دەچن کە مردار خۆراکی شەیتانە، چونکە ناوی خودای لەسەر نەهاتوە. کە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ: شەراب و قومار وبتەکان و بەختگرتنەوە پیسن و لەکردەی شەیتانن ﴾ (سورة المائدة/٩٠). ئیبنیقەییم لە بابەتی ئەم ئایەتە دەرەنجامی وا بوە کە مەی خواردنەوەی شەیتانە. چونکە بەخۆی لەو خواردنەوانە دەخواتەوە کە بە فەرمانی خۆی دروستی دەکەن و بۆ خۆی لە کارەکاندا بەژداری کردون، بۆیەش بەشدار دەبێ لە خواردنەوەی و گوناهو سزاکەشی.

**هاوسەرێتی و زیادبونی جنۆکان:**

وادیارە جنۆکە هاوسەرداری دەکەن و هەندێك زاناش وەك بەڵگە ئەو ئایەتە پیرۆزە دەهێنینەوە کە خودای گەورە لەبارەی هاوسەرانی ئەهلی بەهەشت دەفەرموێ:﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلاَ جَانٌّ: بەر لەوان هیچ مرۆڤێك یا جنۆکەیەك دەستی بۆ نەبردون ﴾ (سورة الرحمن /٥٦)، هەروەها خاوەنی (لوامع الأنوار البهية) فەرمودەیەکی هێناوەتەوە کە پێویستە چاو بە ئیسنادەکەیدا بگێڕدرێتەوە، دەفەرموێ: (( ان الجن يتوالدون، كما يتوالد بنو آدم، وهم أكثر عددا: جنۆکە زاوزێ دەکەن، هەروەکو ئادەمیزاد زاوزێ دەکەن و، ئەوان ژمارەیان زۆرترە)) رواه ابن أبي

حاتم ، وأبو الشيخ في العطمة عن قتـــادة. **جا ئەگەر ئەم فەرمودەیە صەحیح بێ یان نا، ئایەتەکە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکا  کە جنۆکەش جوتبونیان هەیە، ئەوەش وەك بەڵگە بۆ ئێمە بەسە.**

**خەڵکانیش هەن دەڵێن جنۆکە ناخۆن و ناخۆنەوە و هاوسەرداری ناکەن، بەڵام ئەم قسانە بەتاڵ دەبنەوە بەو بەڵگانەی کە لە قورئان و سوننەت هاوردمان.**

**هێندێك زاناش دەڵێن جنۆکە چەندین جۆرن؛ هی  وایان تێدایە کە دەخواو دەخواتەوە، هی واشیان تێدایە ئاوا نین، وەهەبی کوڕی مونەبیە دەڵێ: (جنۆکە چەند رەگەزێکن؛ ئەوی پاڵاوتەی جنۆکانە ئەمانە بریتین لە (با)یەك نە دەخۆن، نە دەخۆنەوە، نە دەمرن، نە زاوزێ دەکەن، رەگەزو جۆری واشیان هەیە دەخۆن و، دەخۆنەوەو، زاوزێ دەکەن و، دەمرن، گوتی: ئەمانەش  ئەو ئەرژەنگ و دێو درنجانەو هاوشـــێوەی ئەوانەن)** اخرجة ابن جرير (لوامـــع الانـــوار ٢/٢٢٢). **جا ئەمەی وەهەب باسی دەکا بەڵگەی پێویستە، هیچ بەڵگەش نیە. هەندێك زاناش هەوڵیان داوە باسی چۆنیەتی  خواردنیان بکەن. ئایا مژین و قوتدانە، یا بۆن کردن و هەڵمژینە، تۆژینەوەی ئەمەش هەڵەیەکی نادروستە، چونکە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین و خوداو پێغەمبەریشﷺ هەواڵیان پێ نەداوین.**

### هاوسەرێتی مرۆڤ لەگەڵ جنۆکان:

**تا ئێستاش دەکەوێتە بەر گوێمان کە فلانەکەس ژنێکی جنۆکەی هێناوە، یا فلانە ژن، جنۆکەیەك خواستویەتی، جا سیوطی هەندێك شون و هەواڵی لە پێشینەکان و لەزانایان بۆ هێناوین، وا دەگەیەنن هاوسەرێتی لەنێوان مرۆڤ و جنۆکە رودەدات. ئیبنیتەیمییە لە(المجموع ١٩/٣٩)دا دەڵی: (وا دەبێ هاوسەرێتی لە نێوان مرۆڤ و جنۆکە دروست بێ و منداڵیان لێ بکەوێتەوە، ئەمەش زۆرە و ئاشکرایە).**

جا گریمان ئەمە رو دەدا، بەڵام کۆمەڵێك زانا بە مەکروهیان داناوە وەکو حەسەن و قەتادەو ئەلحەکەم و ئیسحاق، هەرچی ئیمام مالیکە ﷺ هیچ بەڵگەیەك نادۆزێتەوە نەهی بکا لە هاوسەرێتی لەگەڵ جنۆکەدا، بەڵام بە موستەحەبیشی دانەناوە، بە بیانوی ئەوەی کە دەڵێ: ( بەڵام من پێم ناخۆشە ئەگەر ژنێك بینم زگی پڕ بێ و لێی بپرسن کێ مێردتە؟ ژنە بڵێ: لە جنۆکانەو بەم جۆرە گەندەڵی زۆر بێ).

خەڵکانیش هەن ئەوە قەدەغە دەکەن. وەکو بەڵگەش بۆ راڕاوەکەیان دەڵێن کە خودا منەتی لەسەر بەندەکانی خۆی کردوە بەوەی لە رەگەزی خۆیان هاوسەری بۆ دانان ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً: لە نیشانەکانی خودا ئەوەیە کە لە رەگەزی خۆتان هاوسەری بۆتان ئەفراندوە تا لە پاڵ ئەواندا ئارام بگرن و، خۆشەویستی و رەحمەتی خستە نێوانتان ﴾ (سورة الروم /٢١).

ئەگەر هاوسەرێتی لە نێوان مرۆڤ و جنۆکەدا روش بدا لەبەر جودایی رەگەز رێکوپێکی و کۆکی لە نێوان هەردو هاوسەر وەدی نایێ و پێکەوە ناگونجێن، بۆیە حیکمەتی هاوسەرێتی لادەچێ، چونکە ئەو هاونشینی و خۆشەویستیەی لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، نایەتەدی.

جا ئەمە مەسەلەیەکەو هەندێك خەڵکی دەڵێن لە ئێستاو لە رابردو روی داوە ئەگەر روشبدا ریزپەرپیەکەو کەم جار وەدەبێ بکەرەکەی لە حوکمی شەرع تێیدا بپێچێتەوە. یا رەنگە بکەرەکەی هیچی لە دەست دا نەبێ و نەتوانێ خۆی لێ رزگار بکا.

ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەگەری رودانی هاوسەرێتی لە نێوان مرۆڤ و جنۆکە، کە خودای بەرز لەبارەی پەریەکانی بەهەشتێ دەفەرموێ: ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ

قَبْلَهُمْ وَلاَ جَـانٌّ: بەرلـەوان هیچ مرۆڤ و جنۆکەیەك دەسـتی بۆ نەبـردون ﴾ (سورة الرحمن /٥٦)، جا ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پەریەکان بۆ مرۆڤ و جنۆکە وەکو یەك دەسازێن.

## ئایا جنۆکەو شەیتانەکان دەمرن؟

هیچ گومان لـەوە دانیـە کـە جنۆکـەکان و شـەیتانەکانیش کەهـەر لـەوانن، دەمرن و، وەبەر ئەو ئایەتە پیرۆزە دەکەون کە دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ۝ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلاَلِ وَالْإِكْرَامِ۝ فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ: هـەرچی لەسـەر زەوی دایـە تـێدەچێ، وەتـەنیا روی خـاوەن شـکۆو بـەڕێزی پـەروەردگارت دەمێنێتەوە، کامە نیعمەتی پەروەردگارتان بەدرۆ دەخەنەوە ﴾(سورةالرحمن٢٦-٢٨).

هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا لە ئیبنیعەبباسەوە هاتوە کە پیغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: ((أعوذ بعزتك الذي لا إله إلا أنت ، الذي لا يموت ، والجن والأنس يموتون: خۆ پەنا دەگرم بە عیززەتی تۆ کە هیچ خودایەك نیە بێجگە لە تۆ، کە نامرێ و، جنۆکەو مرۆڤ دەمرن)).

بەڵام بڕی تەمەنیان لەلای ئێمە نەزانراوە، لەوەی بترازێ کە خودا لـە بابـەت ئیبلیسی نەفرەت لێکراوەوە پێی ڕاگەیاندوین، کەهـەتا ڕۆژی دوایـی دەمێنـێ: ﴿ قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ۝ قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ: شـەی[illegible] گوتـ[illegible] ڕۆژی زندوبونەوە موڵەتم بدەو زندی ڕامگرە، خودا فەرموی: تۆ لە دوا[illegible]انی (سورة الأعـراف/١٤-١٥)، لەو بترازێ بڕی تەمەنی ئەوانی دی نازانین، بەڵام لە مرۆڤ تەمەن درێژترن.

بەڵگەش بۆ ئەوەی کە جنۆکە دەمرن ئەوەیە کە خالیدی وەلید شەیتانە مێیەکەی عوززای کوشت، عوززاش دارێك بو عارەب دەیانپەرست، هەروەها یەکێك لە هاوەڵان ئەو جنۆکەیَ کوشت کە هاتبوە سەر شێوەی مارێك، هەر وەك باسەکەی دێتە پێشیَ.

## نشینگەو شوێنی جنۆکان و کاتی ئامادەبوونیان:

جنۆکە لە هەمان ئەم زەویەدا نیشتەجێن کە ئێمە لەسەریدا دەژین، بە زۆریش لە وێرانەو کاولاندا هەن، لەگەڵ شوێنی پیسی وەکو حەمام و زبڵدان و گۆرستانان. هەر بۆیەشە وەك ئیبنی تەیمییەش دەڵێ؛ زۆر لەو شێخانەی کە لەگەڵ شەیتاناندا هاودەمن، هۆگری ئەو جۆرە شوێنانە دەبن کە نیشینگەی شەیتانەکانن، فەرمودەش هاتون کە نا لە نوێژکردن لە حەمامدا دەکەن، لەبەر ئەو پیسیەی تێیدایەو، چونکە مۆڵگەی شەیتانەکانیشە. هەروەها لە گۆڕستانەکاندا چونکە رێخۆشکەرێکە بۆ هاوبەشدانان، لە پاڵ ئەوەی کە رەنگە گۆڕستانەکان مۆڵگەو نیشنگەی شەیتانەکانیش بن.

هەروەها زۆر کات لەوان شوێنان ئامادە دەبن کە دەتوانن گەندی تێدا بەرپا بکەن وەکو بازاڕەکان، پێغەمبەریش ﷺ ئامۆژگاری یەکێك لە هاوەڵەکانی کردو، گوتی: ((لا تكونن ان استطعت ان تكون اول من تدخل السوق ، ولا آخر من يخـــرج منها ، فانها معركة الشيطان وبها ينصب رايته؛ ئەگەر پێت بکرێ یەکەم کەس مەبە کە دەچیە بازاڕی، هەروەها دوامین کەسیش مەبە کە لێیەوە دەربچی، چونکە بازار جەنگی شەیتانەو بەیداخی خۆی لەوێ هەڵدەدا )) رواه مسلم في صحيحــه. هەروەها شەیتانەکان شەوێ لە ماڵاندا دەمێننەوەو،(بسم الله) کردن و یادی خوداو، قورئان خوێندنەوەو بەتایبەتیش سورەتی (البقرة)و ئایەتولکورسی، لە ماڵێ وەدەریان دەنێ، پیغەمبەریش ﷺ پێی راگەیاندوین، کە شەیتانەکان لەگەڵ تاریك داهاتن بڵاوەی لێ دەکەن و زۆر دەبن، هەربۆیەش فەرمانی پێ کردوین کە

منداڵەکانمان لەم ماوەیەدا دابکەین، ئەم فەرمودەیەش بوخاری و موسلیم دەیگێڕنەوە.

هەروەها شەیتانەکان لە دەنگی بانگێ بانگێ هەڵدێن و ناتوانن گوێ بۆ دەنگی بانگ رادێرن و لە رەمەزانیشدا شەیتانەکان کۆت دەکرێن.

### لەو شوێنانەی شەیتانان لێی دادەنیشن

شەیتانەکان حەز دەکەن لە نێوان سێبەرو بەر رۆژێ دانیشن. بۆیەش پێغەمبەرﷺ نەهی لەوە کردوە مرۆڤ لە نێوان رۆژو سێبەر دانیشێ، ئەمەش فەرمودەیەکی راستە لە سونەنەکان و شوێنی دیکەش گێڕدراوەتەوە.

### چارەوێی جنۆکان

لە فەرمودەیەکی ئیبنی‌مەسعود، لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە کە جنۆکە داوای زادیان لە پێغەمبەرکرد ﷺ، ئەویش فەرموی:((لكم كل عظم ذكر اسم الله عليه، يقع في أيديكم لحماً، وكل بعرة علف لدوابكم؛ هەمو هێسکێك کە ناوی خودای لەسەر هاتبێ بۆ ئێوەیە، بە گوشتێتی دێتە دەستتان و، هەمو ریخێکیش ئالیکی چارەوێکانتانە)).

لێرەدا دەردەکەوێ جنۆکە چارەوێیان هەیەو ئالیکی چارەوێکانیان پاشەڕۆی چارەوێی مرۆڤە.

### ئاژەڵانێك شەیتانەکان هاوەڵێتیان دەکەن

یەکێك لەو ئاژەڵانە حوشترە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ(( ان الأبل خلقت من الشياطين، وان وراء كل بعيرٍ شيطانا؛ حوشتر لە شەیتانان ئافەریدکراون و لەدوای هەر حوشترێك شەیتانێك هەیە) رواه سعيدبن منصور في سننه باسناد مرسل حسن(صحيح

حـمع ٢/٥٢)، هەر لەبەر ئەمە پێغەمبەرﷺ نەهی لەوە كردوە نوێژ لە هەوێزی حوشتراندا بكرێ. هەر وەك لە موسنەدی ئەحمەدو سونەنی ئەبو داوددا هاتوە كە پێغەمبەرﷺ فەرموی:((لاتصلوا في مبارك الأبل، فأنها من الشـياطين وصلـوا في مرابـض الغنـم فانهـا بركـة...: لە هەوێزی حوشتراندا نوێژ مەكەن، چونكە لەشەیتانانەوەیەو، نوێژ لە هەوێزی مەڕدا بكەن چونكە ئەمە پیت و فەڕە ))، هەروەها لە سونەنی ئیبنی ماجەدا بە ئیسنادێكی راست هاتوە: ((ولا تصلـو في أعطان الأبل، فانها خلقت من الشياطين: لەناو عولە حوشتراندا نوێژ مەكەن، چونكە ئەمانە لە شەیتانان ئافەریدكراون)).

ئەم فەرمودانەش ئەو قسەیە رەت دەكەنەوە كە دەڵێ هۆی نەهی كردن لە نوێژكردن لە هەوێزی حوشتران بریتییە لە پیسی میزو پاشەڕۆكەی، بەڵكو راست ئەوەیە كە پاشەڕۆو میزی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان دەخورێ پیس نین.

### دزێوی وێنەی شەیتان:

شەیتان شێوەی زۆر دزێو ناشیرینە، ئەمەش لە زەینی مرۆڤدا مەییوە، خوداش بەری داری ژەقنەبوتی بەسەركی شەیتانان شوبهاندوە، ئەو دارەی كە لە بنەوەی دۆزەخێدا ڕەگی داكوتاوە، ئەوپێك چواندنەش لەبەر ناشرینی وێنەو شێوەكانیانە، ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِلظَّالِمِينَ۞ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ: بەڕاستی ئەمە دارێكە لە قوڵایی دۆزەخ دەڕوێ، خونچەی سەر لقەكانی دەڵێی سەرو سەكوتی شەیتانەكانە﴾ (سورة الصافات /٦٤-٦٥).

دیانەكانیش لەسەدەكانی ناوەڕاستدا شەیتانیان بەشێوەی پیاوێكی ڕەشی ردێن بە گروازە و برۆی بڵند و دەمێكی ئاگراوی و دو قۆچ و سم و كلكێك وێنە دەكێشا.( دائرة المعارف الحديثة/٣٥٧).

**شەيتان دو شاخی هەيە:**

**لە صەحيحی موسليمدا لە ئيبنی عومەر هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:**((لا تحرّوا بصلاتكم طلوع الشمس، ولاغروبها، فإنها تطلع بين قـــرني الشـــيطان: **لە کاتی رۆژهەڵاتدا نوێژ مەکەن، هەروەها لە کاتی رۆژاوا بوندا، چونکە رۆژ لەنێوان هەردو قۆچی شەيتانی هەڵدێ**)).

**هەروەها هەر لە ئيبنیعومەرەوە لە بوخاری و موسليمدا هاتوە:** ((إذا طلـــع حاجب الشمس فدعوا الصلاةحتى تغيب، ولا تحيَّنوا بصلاتكم طلوع الشمس، ولا غروبها فانها تطلع بين قرني شـيطان: **ئەگەر رۆژ کەوتە زەردی لە نوێژێ گەڕين هەتا ئاوا دەبێ، هەروەها نوێژتان مەخەنە کاتی رۆژهەڵات و، کاتی رۆژئاوا، چونکە رۆژ لە نێوان هەردو قوچی شەيتان هەڵدێ**)).

**مانای وايە کە کۆمەڵێك لە هاوبەش دانەران رۆژيان دەپەرست ولە کاتی هەڵاتن و کاتی ئاوابونيدا سوژدەيان بۆ دەبرد، جا لەو کاتانەدا، شەيتان لەڕاست رۆژێ رادەوستێ تا پەرەستنەکەيان بۆوی بێ.**

**جا ئێمە نەهيمان لێکراوە نوێژ لەو دو کاتە بکەين، راستيش وايە کە نوێژ لەو دو کاتەدا دروستە ئەگەر هۆيەکی هەبێ وەکو سلاوی مزگەفت. بەلام بەبێ هۆ دروست نيە وەکو سوننەتی رەها، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ** ((لاتحيّنـوا: **مەيخەنە ئەو کاتە**))، **هەروەها لە فەرمودەيەکی ديکەشدا باسی شاخەکانی شەيتان کراوە، لە بوخاريدا لە ئيبنی عومەر ﷺ دەڵێ: ديتم پێغەمبەری خواﷺ ئامارەی بۆ رۆژهەڵات کردو فەرموی:** ((ها ان الفتنة ها هنا، ان الفتنة ها هنا حيـــث يطلع قرن الشـــيطان: **ئەوەتا ئاشوب وا لێرەدايە، ئاشوب وا لێرەدايە، لێرە کە قۆچەکانی شەيتانی لێوە دەردەچێ**)) **(مەبەستيش لای رۆژهەڵاتە).**

**تواناكانى جنۆكان:**

خودا توانايـەكى داوەتـە جنۆكـان كـە بـە مرۆڤـى نـەداوەو باسـى هێندێـك تواناى وانى بۆمان كردوە، لەوانەش:

**خێرايى جوڵەو جێگۆڕينيان:**

وەك ئەوەى كە دێوێك لە جنۆكان بەڵێنىٚ بە سلێمانى پێغەمبەرى خودا دا كـە عەرشـى شـاژنى يەمـەنى بـۆ بێنێتـە بەيتولمـەقديس لـە ماوەيـەكى وا لـە هەستانەوەى پياوێكى دانيشتو تێپەڕ نەبىٚ، بەڵام ئەوەى كە زانستى لە كتێبىٚ پێبو گوتى: ئەمن بۆتى دەهێنم بەر لەوەى چاوان لێك نێـى: ﴿ قَالَ عِفْرِيتٌ مِنْ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ۞ قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنْ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِنْدَهُ قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي...: ئەرژەنگێك لە جنۆكـان گوتـى: من دەيهێنمـە لات پێش ئەوەى لەجێى خۆت هەڵستى وە بێگومان سەبارەت بەو كارە بەهێزو دەسپاكم، ئەو كەسەى كە زانستى كتێبى لابو، گوتى: پێش ئەوەى چاو بتروكێنى دەيهێنمـە لات، جا كاتىٚ سـولەيمان ديتـى تەختەكـەى لا ئامـادەو جێگـرە، گوتـى: ئەمـە لەفـەزڵى پەروەردگارمە ﴾ (سورة النمل/٣٩-٤٠).

**پێشكەوتنيان لە مرۆڤ لە بوارەكانى گەردوندا:**

هەر لە زووەوە بەرەو شوێنەكانى پێشـەوە لـە ئاسمـانێدا هەڵدەكشـان، جا بەدزى گوێيـان بۆ هەواڵـەكانى ئاسمانـىٚ رادەگـرت، تـا پێـش روودانـى شتێك بيـزانن، بەڵام كە پێغەمبـەرﷺ رەوانە كـرا، پاسـەوانى لـە ئاسـمانىٚ زيـاد

کرا: ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا۝ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا: بەڕاستی ئێمە بە ئاسماندا گەڕاین و دەستمان گەیشتێ، جا دیتمان ئاسمان لەپارێزەری بەهێزو ئەستێرەی سوتێنەر پڕکراوە، ئێمە لەو جێیانەدا دادەنشتین کە بۆ گوێڕاگرتن دەبو، جا هەر کەس ئێستا گوێ بگرێ تۆپەڵێکی ئاگراوی لە بۆسەی خۆیدا گیردێنیٚ ﴾ (سورة الجن/٨-٩).

پێغەمبەریش ﷺ ئەوەن بۆ رون دەکاتەوە کە چۆنیان گوێ بۆ هەواڵان رادەگرت، لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەر ﷺ هاتوە: ((اذا قضى الله الأمر في السماء ضربت الملائكة بأجنحتها خضعانا لقوله ، كالسلسلة على صفوان ينفذهم ذلك ، فاذا فزع عن قلوبهم قالوا ماذا قال ربكم ؟ قالوا الذي قاله الحق ، وهو العلي الكبير ، فيسمعها مسترقوا السمع ، ومستمعوا السمع هكذا، واحد فوق آخر، وصف سفيان بيده، وفرج بين أصابع يده اليمنى نصبها بعضها فوق بعض، فربما أدرك الشهاب المستمع قبل أن يرمي بها الى صاحبه فيحرقه، وربما لم يدركه حتى يرمي بها الى الذي يليه ، الى الذي هو أسفل منه، حتى يلقوها الى الارض، وربما قال سفيان: حتى تنتهي الى الأرض فتلقى على فم الساحر فيكذب معها مائة كذبة، فيصدق، فيقولون: ألم يخبرنا يوم كذا وكذا بكذا وكذا، فوجدناه حقا للتي سمعت من السماء: ئەگەر خوای گەورە فەرمانێکی دەرکرد لە ئاسمانێدا، فریشتەکان وەك مل کەچی بۆ فەرمانەکەی باڵانیان لێك دەدەن، وەك زنجیرێك بەئاوێکی بێگەرددا بدەی ئەوها ناخیان دەسمێ و لەدڵیان دەچەقێ، جا ئەگەر دڵیان وەئاگا هاتەوە دەڵێن؛ پەروەردگارتان چی فەرمو؟ ئەوی فەرموی حەق بو، هەر خودا بەرزو مەزنە. جا ئەو جنۆکانەی هەواڵ دزن و گوێ رادەگرن یەك لەسەر پشتی یەکتر ریز بون و گوێیان لەوەدەبێ، جارەنگە تۆپەڵە ئاگرێك بەر ئەوەی بکەوێ کە گوێی راگرتوە، پێش ئەوەی هەواڵەکە بگەیەنێتە هاوەڵەکەی بیسوتێنێ، رەنگە تۆپەڵە ئاگرەکەشی نەگاتێ تا هەواڵەکە دەداتە

هاوەڵەکەی بیسوتێنێ، ڕەنگە تۆپەڵە ئاگرەکەشی نەگاتێ تا هەواڵەکە دەداتە هاوەڵەکەی کە لەخوارە خۆیەتی تا دەگاتە زەوی، دەخرێتە سەر زاری جادوگەرو ئەویش سەد درۆی لەگەڵدا دەکا، ڕاستیەکیشی تێدایە. جا دەڵێن: ئەدی فلانە ڕۆژی فلان شتی پێنەگوتین، دیتمان ڕاستە، لەگەڵ ئەو هەواڵە ڕێکەوتوە کە لە ئاسمانێوە بیستراوە )) رواه البخاري في صحيحه.

## ئەفسانەیەکی نەفامی:

جا ئەم زانستە لە بارەی تێگرتنی تۆپەڵە ئاگری ئاسمانێ، ئەو ئەفسانەیەی لە نێو برد کە لە نێو کۆمەڵی نەفامیدا ئەم دەم ئەو دەمی پێ دەکرا، لە عەبدوللای کوڕی عەبباسەوە هاتوە، دەڵێ: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کە لە پشتیوانان بو پێی ڕاگەیاندم، کاتێك لەشەوێکدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دانیشتبون، ئەستێرەیەك داڕژاو دونیای ڕوناك کرد، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمون: ((ماذا كنتم تقولون في الجاهلية إذا رمي بمثل هذا: لە کاتی نەفامیدا چیتان دەگوت ئەگەر ئەستێرەیەکیوا هاوێژرابا))؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی زاناترن، دەمانگوت: ئەمشۆ پیاوێکی مەزن لەدایك بو، پیاوێکی مەزنیش مرد. جا پێغەمبەرﷺ فەرموی(( فانها لايرمى بها لموت احد ولا لحياته، ولكن ربنا تبارك وتعالى اسمه اذا قضى امراً سبح حملة العرش، ثم سبح أهل السماء الذين يلونهم، حتى يبلغ التسبيح أهل السماء الدنيا، ثم قال الذين يلون حملة العرش لحملة العرش: ماذا قال ربكم؟ فيخبرونهم ماذا قال. قال فيستخبر بعض أهل السماوات بعضاً؛ حتى يبلغ الخبر هذه السماء الدنيا. فتخطف الجن السمع، فيقذفون الى أوليائهم، ويرمون به فما جاءوا به على وجهه فهو حق، ولكنهم يعرفون فيه ويزيدون: ئەو تۆپەڵە گڕانە نەلەبەر مردنی یەکێك دەهاوێژرێن نەلەبەر ژیانی، بەڵام پەروەردگاری بەرزمان ئەگەر فەرمانێکی دەرکرد، هەڵگرانی عەرش پاکیگاری دەکەن و، پاشان

ئاسماننشینەکانی دوای ئەوان پاکیگاری دەکەن، تا پاکیگاریەکە دەگاتە سەرنشینانی ئاسمانی دنیایێ، ئەو جا ئەوانی دوای هەڵگرانی عەرش بە هەڵگرانی عەرش دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمو؟ چی فەرموبێ پێیان دەڵێن، ئنجا ئاسماننیشیان هەواڵپرسی لێکدی دەکەن، تا هەواڵەکە دەگاتە ئاسمانی دنیا. جنۆکە گوێیان گرتوەو هەواڵەکە دەرفێنن و دەیخەنە دڵی پشتیوانانی خۆیان، جا ئەوی وەکو خۆی بهێنن هەقەو ڕەوایە. بەڵام گۆڕانکاری تێدا دەکەن و بۆی زیاد دەکەن )) رواه مسلم في صحيحه.

**شارەزاییان لە بنیاتنان و پیشەسازی:**

خودا پێی ڕاگەیاندوین کە جنۆکەی رام کردبون بۆ سلێمانی پێغەمبەری خۆی. جا گەلەك كارو كردەوەیان بۆ ئەنجام دەدا كە پێویستی بە تواناو، زیرەکی و، پسپۆری هەبو، ﴿ وَمِنَ الْجِنِّ مَنْ يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَنْ يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ۞ يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِنْ مَحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَاسِيَاتٍ: دەستەیەك لە جنۆکان بەفەرمانی پەروەردگاری کاریان بۆ دەکردو، یەکێك لەوانە لە فەرمانی ئێمە لای بدابا سزای ئاگری سوتێنەرمان پێ دەچێژان، هەرچی دەیویست لە پەرستگاو پەیکەرو قاپ و مەنجەڵی گەورەو پتەومان بۆ سازدا ﴾ (سورة سبأ/١٢-١٣).

هەروەها پێ دەچێ هەر لە زوەوە ئەوان وەکو رادیۆ و تەلەفزیۆنیان داهێنابێ، ئیبنیتەیمیە لە(مجموع الفتاوى ٣٠٩/١١)دا باس لەوە دەکا: (کە هێندێك لەو شێخانەی پەیوەندییان بەجنۆکانەوە هەبو پێیان راگەیاندوە؛ کە جنۆکە شتێکی بریقەداری وەکو ئاو شوشەی پیشان دەدەن، جا هەر شتێکی بیانەوێ ئەو هەواڵەکەی رابگەیەنێ لەوێدا پیشانی دەدەن و بۆی رادەنوێنن،

ئەو شێخە دەڵێ: جامنیش بەخەڵکی رادەگەیەنم. هەروەها قسەی هەر هاوەڵێکی خۆم پێ رادەگەیەنن کە هانام وەبەر دێنن و، کە منیش وەرامی دەدەمەوە وەرامەکەی پێ دەگەیەنن).

**تواناى شێوەگۆرینیان:**

جنۆکە دەتوانن خۆیان بێننە سەر شێوەی مرۆڤ و ئاژەڵ، هەر وەك شەیتان لە رۆژی بەدردا هاتە لای موشریکان لەسەر شێوەی سوراقەی کوری مالیك و بەڵێنی سەرکەوتنی بە موشریکان دا، لە هەندێش ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ: وەکاتێك شەیتان کردەوەی ئەوانی رازاندەوەو گوتی: ئەمرۆ کەس بەسەرتاندا زاڵ نیەو من پشتیوانی ئێوەم ﴾ (سورة الأنفال /٤٨)، بەڵام کاتێك هەردو لەشکر گەیشتنە یەك و دیتی وافریشتە لە ئاسمانێ دێنە خوار، پێی بەغارێ وەنا، ﴿ فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ . .: جا کاتێك دو دەستە روبەڕوی یەکتر بون، شەیتان بەسەر پاژنەی خۆیدا گەڕاوەو گوتی: بەڕاستی من لە ئێوە بێزار و بەریم و من شتێك دەبینم کە ئێوە نایبینن، بەڕاستی من لە خودا دەترسم ﴾ (سورة الأنفال /٤٨).

هەروەها چیرۆکێکی سەمەرە بەسەر ئەبو هورەیرەدا هاتوە، کە بوخاری و هی دیکەش دەیگێڕنەوە؛ ئەبو هوریرە دەڵێ: پێغەمبەری خوداﷺ رایسپاردم کە زەکاتی رەمەزانێ بپارێزم، جا یەکێك هاتە لام و بە گۆڵمان خواردنەکەی دەبرد، منیش گرتم وگوتم: واللە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ دەتبەم، گوتی: نەدار و دەسکورتم، ماڵ ومنداڵم لە ملەو، زۆر پێویستم، دەڵێ: جا بەرەڵلام کرد، بۆ سبەینێ پێغەمبەرﷺ پێی فەرموم: ((یا أبا هریرة، ما فعل أسیرك البارحة ؟:

ئەرێ ئەبو هورەیرە، یەخسیرەکەی دوێنێت چی کرد؟))، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا گازاندەی نەداریەکی زۆرو ماڵ و منداڵی لا کردم، منیش بەزەییم پێدا هاتەوە و بەرەڵام کرد. فەرموی(( أما انه كذبك وسيعود: بەڵام ئەو درۆی لەگەڵ کردی و دەشگەڕێتەوە)). جا من زانیم دێتەوە چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموی دێتەوە، بۆیە خۆم بۆ دانوساند، دیسان هاتەوە و گۆلمی هاوێشتە خواردنەکەی، ئەو جارەش گرتم و، پێم گوت: دەبێ بتبەم بۆ لای پێغەمبەری‌خوداﷺ، گوتی: لێم گەڕێ، زۆر نەدارم و منداڵم لە ملیە، جارێکی دی ناگەڕێمەوە، منییش بەزەییم پێدا هاتەوەو، بەرەڵام کرد. رۆژم لێ بۆوە، پێغەمبەری خواﷺ پێمی فەرمو: (( یا أبا هريرة، ما فعل أسيرك؟: ئەی ئەبو هورەیرە، دیلەکەت چی کرد؟)) گوتم؛ ئەی پێغەمبەری خوا گلەیی ئاتاجیەکی زۆرو منداڵی لەلا کردم و منیش بەزەییم پێدا هاتەوەو بەرم هەڵدا. فەرموی:((أما انه كذبك وسيعود: بەڵام ئەو درۆی دەگەڵ کردی و دیسان دێتەوە)). سێیەم جاریش لێی دانوسام دیسان هاتەوەو گۆڵمی لە خواردنەکەدا. منیش گرتم و پێم گوت: بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ بەرزت دەکەمەوە. ئەمەش دوا جارو سێیەم جارتە دەڵێی نایەمەوەو دەشگەڕێیتەوە! گوتی: لێم گەڕێ چەند وشەیەکت فێر دەکەم کە بەوان وشان خودا سودت پێ دەگەیەنێ، وتم ئەم وشانە چین؟ گوتی: ئەگەر چویتە سەر نوێنەکەت ئایەتولکورسی بخوێنە ﴿ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، ئەوجا تاکو سبەینێ لە خوداوە پارێزەرێکت لەسەر دەبێ و، هیچ شەیتانێك نێزیکت ناکەوێ، جا منیش بەرەڵام کرد، سبەینەکەی پێغەمبەری خواﷺ پێمی فەرمو: ((ما فعل اسيرك البارحة؟: دوێنێ یەخسیرەکەت چی کرد؟)) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، گوایە چەند وشەیەکی فێرکردوم بە هۆیانەوە سودی خودام پێ بگات. فەرموی:((ما هي؟: وشەکان چین؟)) گوتم: پێمی گوت؛ ئەگەر چویتە سەر نوێنەکەت،

ئایەتولکورسی بخوێنە هەر لەسەرەتا تا کۆتایی ئایەتەکە ﴿ اللهُ لا إِلـهَ إِلا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾ پاشان گوتی: ئەوجا تاکو سبەینێ پارێزەرێکت لە خوداوە لەسەر دەبێ و هیچ شەیتانێکت لێ نێزیك نابتەوە. دیارە هاوەڵانیش زۆر مکوڕ بون لەسەر چاکەکاری، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((أما انه قد صدقك وهو كذوب، تعلم من تخاطب منذ ثلاث ليالٍ يا ابا هريرة ؟: راستی پێ گوتی لەگەڵ ئەوەی کە بەخۆی درۆزنە، دەزانی سێ شەوە قسان لەگەڵ کێ دەکەی، ئەبو هوریرە؟)) گوتی: نەخێر. فەرموی ((ذاك شيطان: ئەمە شەیتانێك بو)).

جا ئەو شەیتانە خۆی هێنابوە سەر شێوەی مرۆڤ و، واش دەبێ کە خۆی لە شێوەی ئاژەڵی وەك: حوشتر، یان کەر، یان چێڵ، یان سەگ، یان پشیلە رابنوێنێ.

بە تایبەتیش خۆ دێننە سەر شێوەی سەگی رەش. بۆیەش پێغەمبەرﷺ پێی راگەیاندوین کە بەپێشدا تێپەڕینی سەگی رەش نوێژ بەتاڵ دەکا، بە پاساوی ئەوەی (سەگی رەش شەیتانە)، ئیبنی تەیمییەش دەڵێ: (سەگی رەش شەیتانی سەگانە و گەلەك جاران جنۆکە خۆ دێننە سەر وێنەی وی و وێنەی پشیلەی رەشیش، چونکە رەشاتی لەڕەنگی دیکە زێتر هێزە شەیتانیەکان لەخۆوە دەگرێ، وە هێزی گەرمیشی تێدایە).

## جنۆکەی ماڵان:

جنۆکە خۆ دێننە سەر شکلی مار و خۆیان بەخەڵکی پێشان دەدەن بۆیەش پێغەمبەرﷺ نەهی لە کوشتنی جانەوەری ماڵان کردوە، نەوەکو کوژراوەکە جنۆکەیەکی موسڵمان بێ، لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبوسەعیدی خودریەوە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ((ان بالمدينة نفراً من الجن قد أسلموا، فمن رأى

شيئاً من هذه العوامر فليؤذنه ثلاثاً، فان بدا له بعد فليقتله؛ فانه شيطان: **كۆمەڵە جنۆکەیەك لەمەدینەدا هەن موسوڵمان بوینە، جا هەر یەکێك شتێکی لەو جانەوەرانە دیت با سێجاران موڵەتی بدا، ئەگەر پاشان هەر بۆی دەرکەوت، با بیکوژێ ئەوە شەیتانە))..**

**یەکێکیش لە هاوەڵان جارێك مارێکی نێو ماڵی دەکوژێ و بەوە بە هیلاك دەچێ. موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەگێڕتەوە: ئەبو سائیب هاتە لای ئەبوسەعیدی خودری لە ماڵەوە، دیتی وا نوێژ دەکا، دەڵێ: جا دانیشتم و چاوەڕێم کرد تا نوێژەکەی تەواو دەکا، لەنێو گەڵا دارخورمایان لەلای ژورێ گوێم لە خشپەی جوڵەیەك بو، ئاوڕم داوە، دیتم مارێکە، پازم دا بیکوژم، ئەبوسعید ئاماژەی بۆ کردم دانیشم، دانیشتمەوە، کە تەواو بو ئامازەی بە ماڵێك کرد لە خانوەکە وگوتی: ئەو ماڵەی دەبینی؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: گەنجێکی تێدا بو تازە ژنی هێنابو، گوتی: جا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەرچوین بۆ خەندەق. ئەو گەنجە نێوەڕۆیان مۆڵەتی لە پێغەمبەرﷺ وەردەگرت و دەهاتەوە لای خێزانی، رۆژێك موڵەتی خواست، پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو:** ((خذ عليك سلاحك فاني أخشى عليك قريظة: **چەکەکەت لەگەڵ خۆت ببە، ترسی تۆم لە قورەیظە هەیە)). جا گەنجەکە چەکەکەی بردو پاشان گەڕاوە، دیتی وا ژنەکەی لەنێوان هەردو دەرگان راوەستاوە، غیرەتی بزاوت و رمێکی درێژ کرد ویستی لە ژنەکەی بدا، ژنەکەی گوتی: رمەکەت لابەو بڕۆ ژۆرێ تا ببینی چی منی وەدەر ناوە، کە چوە ژورێ بینی وا مارێکی گەورە لەسەر نوێنەکەدا پەپکەی کردوە، جا رمەکەی هاوێشتێ، لەمارەکەیداو سمی، پاشان تەنگیان پێك هەڵچنیو مارەکە خۆی تێئالاند، نەزانرا کامەیان زوتر مردن؛ مارەکە یان گەنجەکە؟ دەڵێ؛ جا هاتینە لای پێغەمبەرﷺ و باسەکەمان بۆی کرد و، گوتمان لە خودا بپاڕێوە تا بۆمانی زندو بکاتەوە فەرمووی:** ((استغفروا لصاحبكم: **داوای**

**لیخۆشبون بۆ هاوەڵەکەتان بکەن)). پاشان فەرموی:** ((ان بالمدينة جناً قد أسلموا ، فاذا رأيتم شيئاً فآذنوه ثلاثة أيام ، فان بدا لكم بعد ذلك فاقتلوه ، فانما هو شيطان: **مەدینە جنۆکەی وای تێدایە موسوڵمان بون ؛ جا ئەگەر شتێکتان لێیان بینی سێ رۆژان دەستوریان بدەن ئەگەر پاش هەنگی هاتنەوە بەر چاوتان بیکوژن. چونکە ئەمە شەیتانە)).**

**چەند ئاگادارییەك:**

**١) ئەم حوکمە، کە نەهی کردنە لەکوشتنی ئەم گیاندارانە، تەنێ بەماران تایبەتە.**

**٢) بۆ هەمو مارێکیش نا، بەڵکو ئەو مارانەی لە ماڵاندا دەیانبینین، هەرچی ئەوانەشن کە لە دەرێی ماڵان دەیانبینین ئەوا ئێمە فەرمانمان پێ کراوە بیانکوژین.**

**٣) ئەگەر مارێکمان لە ماڵێکدا دیت فەرمانی پێ دەکەین بچێتە دەرێ. وەك ئەوەی بڵێین: بە خودا سوێندت دەدەم کە لەم ماڵە بچێتە دەرێ و، شەڕی خۆتمان لێ وەدور بێخی، ئەگینا دەتکوژین. جا ئەگەر پاش سێ رۆژان دیترا دەکوژرێ.**

**٤) هۆکاری کوشتنیشی لە پاش سێ رۆژان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێمە دڵنیا بوین لەوەی جنۆکەیەکی موسوڵمان نیە، چونکە ئەگەر وابوایە ماڵەکەی جێ دەهێشت. جا ئەگەر مارێکی بەڕاستی بێت ئەوا شایانی کوشتنە. ئەگەر جنۆکەیەکی کافرو یاخیش بێ هەر شایانی کوشتنە، چونکە خانەوادەی ماڵەکەی ترساندوە و ئازاری داون.**

**٥) جۆرێك هەن لە جنۆكەی ماڵان دەرداوێژرێن و بێ دەستوردان دەكوژرێن، هەر وەك لە صەحیحی بوخاری‌دا هاتوە كە پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((لا تقتلوا الجنان، الا كل أبتر ذی طفیلتین ؛ فانه یسقط الولد، ویذهب البصر فاقتلوه: **جنۆكەی ماڵان مەكوژن. جگە لە هەمو مارێكی كلك قوتی شاخدار، چونكە ئەمە منداڵان لەبار دەبا و چاوان كوێر دەكا، جا بیكوژن)).**

**جا ئایا هەمو مارێك جنۆكەن یان تەنها هەندێكیان؟ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:** (( الحیات مسخ الجن صورة، كما مسخت القردة والخنازیر من بنی اسرائیل: **مارەكان رموزنی جنۆكانن هەروەكو كە مەیمون و بەرازیش رموزنی بەنی ئیسرائیلن))** (رواه الطبراني و أبو الشيخ في العظمة باسناد صحيح)، (راجع الأحاديث الصحيحة ٣/١٠٤).

**چۆن خوێن بە دەماراندا رەت دەبێ، شەیتان ئاوا بە ئادەمییان تێپەڕ دەبێ:**

**لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا لە ئەنەسەوە هاتوە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموی:** ((إن الشیطان یجری من الانسان مجری الدم: **شەیتان لە مرۆڤ دا بە ڕاڕەوەی خوێنیدا دەچێ)).**

**دیسان لە هەردو صەحیحاندا لە صەفیەی كچی حویەی خێزانی پێغەمبەرﷺ دەڵێ؛ پێغەمبەری خواﷺ لە خەڵوەتدا بو، شەوێك هاتمە سەردانیو، قسەم لەگەڵی كرد، پاشان هەستام بگەرێمەوە. ئەویش هەستا لەگەڵم تا رەوانەم بكا. صەفیە لەماڵی ئوسامەی كوڕی زەید نیشتەجێ بو، جا دو پیاو لە پشتیوانان تێپەڕین، كە پێغەمبەریان ﷺ دیت پێیان هەڵێنا، پێغەمبەرﷺ فەرموی:** (( علی رسلِكما إنها صفیة بنت حیي: **لەسەرەخۆ، ئەوە صەفیەی كچی حویەیە)). گوتیان: سبحان الله ئەی پێغەمبەری خوا!! فەرموی** ((ان الشیطان یجري من ابن آدم مجری الدم، و إني خشیت أن یقذف في قلوبكما شراً، أو

قنَ شـــيئاَ: شەيتان لـە مرۆڤدا بە ڕاڕەوی خوێنـدا دەچێ، منیش لـەوە ترسام شتێکی خراپتان بخاتە دڵ)).

**لاوازی و ناتەوانیان:**

جنۆکەو شەیتانەکان لایـەنی هێزیان تێدایـە و، لایـەنی لاوازیـش، خـودای بەرز دەفەرموێ:﴿ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا : بەڕاستی فروفێڵی شەیتان کزو کەم هێزە ﴾ (سورة النسأ /٧٦).

جـا هـەندێك لـەو لایەنانـە دەخەینـە بـە رچـاو کـە پیغەمبـەرﷺ پێـی ناساندوین.

**دەسەڵاتیان بەسەر بەندە چاکەکانی خودا نیە:**

خودای پەروەردگار توانای ئەوەی نەداوەتە شەیتان کە خەڵکی ناچار بکاو بەخورتی توشی گومڕایی‌و کوفریان بکا،﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً: بەراستی تۆ هیچ دەسـەڵاتێکت بەسـەر بەندەکانی منـدا نیە، ئەوان هێندەیان بەسـە کە پەروەردگــارت پـارێزەرو پشـتیوانیانە ﴾ (سورة الاسراء /٦٥)، ﴿ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَنْ يُؤْمِنُ بِالآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ: وەشەیتان دەسەڵاتێکی بەسەر ئەواندا نەبو تا بەزۆر بەدوای خۆیان بدا، تەنها تا بزانـین کێ لــەوان بـڕوایی بـە دوایــین هەیـەو کێیــان لـە گومـان دایـە ﴾ (سورة سبأ/٢١). مانای وایە شەیتان هیچ رێیـەکی نیە بەسەریاندا زاڵ بێ، نـە لـە روی هەنجەت و بیانو و نە لە روی تواناوە. جا شەیتان چاك دەرك بەو راستیە دەکات، ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لأَزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمْ الْمُخْلَصِينَ: گوتـی ئـەی پـەروەردگارم، لەبـەر ئـەوەی گومـڕات کــردم! بــەهرەی

دنیایان له زەویدا لەبەر چاوان دەڕازێنمەوەو هەموویان له ڕێگه لا دەدەم، مەگەر بەندە پاك و دڵڕاست و هەڵبژاردراوەكانت نەبێ ﴾ (سورة الحجر /٣٩-٤٠).

شەیتان تەنها بەسەر ئەو بەندانە زاڵ دەبێ كە بە بیری وی ڕازین و، بەویست و ڕەزامەندی دوای دەكەون: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنْ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ: تۆ دەسەڵاتت بەسەر بەندەكانی مندا نابێ مەگەر ئەو لاڕێیانەی كە وەدوای تۆ كەوتبن ﴾ (سورة الحجر /٤٢).

له ڕۆژی قیامەتیشدا شەیتان بە شوێنكەوتەكانی خۆی دەڵێ كە گومڕای كردون و فەوتاندونی: ﴿ وَمَا كَانَ لِي عَلَيْكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ إِلاَّ أَنْ دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي: من هیچ دەسەڵاتێكم بەسەر ئێوەدا نەبو، هێندە نەبێ كە بانگم كردن و ئێوەش بەپیر بانگەوازەكەمەوە هاتن ﴾ (سورة ابراهیم/٢٢).

له ئایەتێكی دیكەش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ: دەسەڵاتی شەیتان هەر بەسەر ئەوان كەساندا هەیە كە ئەو دەكەنە دۆستی خۆیان و هاوبەش بۆ خودا دادەنێن ﴾ (سورة النحل/١٠٠).

دەسەڵاتیش ئەوەیە بە هۆی فریواندن و گومڕاكردن بەسەریاندا زاڵ بێ و دەستیان لێ بستێنێ بە شێوەیەك بۆ كوفر و شیرك دنەیان دەداو هەڵیان دەنێ و لێ ناگەڕێ وازی لێ بێنن هەر وەك خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَى أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا: ئایا نەتدی كە ئێمە شەیتانەكانمان ناردە سەر بێبڕوایان تا بیانگۆڕن و ڕایانتلەكێنن ﴾ (سورة مریم/٨٣).

دەسەلاتی شەیتانیش بەسەر دۆستەکانیدا چ بەلگەو بیانویەکی لەویەوە تێدا نیە، بەڵکو تەنها بە بانگەوازەکەی بەپیریەوە هاتون و وەڵامیان داوەتەوە، کاتێك لەگەڵ ویست و ئارەزوەکانیاندا رێك کەوتوە، ئەوان هەر بە خۆیان یاریدەی شەیتانیان داوە دژی خۆیان و، وایان کردوە دوژمنەکەیان بەسەریاندا زاڵ بێ بەوەی کە لەگەڵی رێك کەوتون و شوێنی کەوتون، جا کاتێ کە خۆیان داوەتە دەست و تەسلیم بوینە، وەکو سزایەك بەسەریاندا زاڵ کراوە، چونکە خودا هیچ دەسەڵاتێك لەسەر بەندە ناداتە شەیتان، تاکو ئەو بەندەیە رێگە خۆش نەکا بە هۆی گوێڕایەڵی شەیتان و شیرك بەخوا، ئا لەو کاتەدا خودا زاڵیو دەسەڵاتێك بە شەیتان دەدا لەسەر بەندەکە.

### رەنگە بەهۆی گوناهەکانیان بەسەر باوەرداران زاڵبێ:

لە فەرمودەیەك داهاتوە: (( ان الله –تعالى– مع القاضي مالم يَجُر، فاذا جار تبرأ منه ، وألزمه الشيطان: خودای بەرز لەگەڵ قازی دایە تا ستەمی نەکردوە، کە زوڵم و ستەمێکی کرد لێی بێبەری دەبێ و، شەیتانی پێوە دەلکێ)) رواه الحاكم، والبيهقي باسناد حسن (انظر صحيح الجامع ٢/١٣٠).

ئەبولفەرەجی ئیبنیجەوزی لە (تلبيس ابليس/٤٣)دا چیرۆکێکی سەمەرەمان لە حەسەنی بەصریەوە (رحمه الله) بۆ دەگێڕێتەوە، جا بە چاوپۆشین لە ئاست راستی چیرۆکەکە، توانای مرۆڤمان دەخاتە بەرچاو لە زاڵبون بەسەر شەیتان ئەگەر لەدینی خودا دڵڕاست بو، هەروەك ئەوەش رون دەکاتەوە کە چۆن شەیتان مروڤ دەگەوزێنی ئەگەر گومڕاو لاڕێ بو، حەسەن دەڵێ: (دارێك هەبو خەڵك دەیانپەرست، پیاوێك هاتە لایو گوتی: دەبێ ئەم دارە ببڕمەوە، لەبەر تورەیی لەپێناو خودا هات دارەکە ببڕێ. ئیبلیس بەشێوەی مرۆڤێك هاتە لای و پێی گوت: چیت دەوێ؟ گوتی: دەمەوێ ئەو دارە ببڕم کە خەڵکی لەباتی

خودا دەیپەرستن. گوتی ئەگەر تۆ نەیپەرستی، ئەوی دەیپەرستی چ زیانێك بە تۆ دەگەیەنێ؟! گوتی: هەر دەیبڕمەوە. شەیتان پێی گوت: بۆ نایەی کارێك بکەی بۆ تۆ خێری زیاترە؟ مەیبڕەوەو هەمو ڕۆژی لەخەوێ هەڵبستی دو دینار لەلای بالیفەکەت دەبێ، گوتی: لەکوێ ئەوم بۆ دێ. گوتی: من بۆت دێنم. جا گەڕاوە، کە سبەینی هەستاوە دیتی دو دینار لەلای بالیفەکەیەتی، ڕۆژی پاشتر کە سبەینی هەستاوە هیچی نەدیتەوە. بە توڕەیی هەستاو چو دارەکەی بېڕێ. شەیتان بە وێنەی خۆی هاتە لای و پێی گوت: چیت دەوێ؟ گوتی: ئەمەوێ ئەو دارە ببڕم کە لەباتی خودا دەپەرسترێ. گوتی: درۆ دەکەی، ناتوانی ئەو کارە بکەی. کابرا چو بیبڕی. شەیتان گرتی و بەعەردی داداو دەستی لە خنخنۆکی نا هێندەی نەمابو بیکوژی، گوتی: دەزانی من کێم؟ من شەیتانم، یەکەم جار هاتی لە پێناو خودا توڕە بوی، جا من دەرەقەتت نەهاتم، بە دو دینارەکەی هەڵم خەڵەتاندی و تۆش وازت هێنا. ئێستاش لە توڕەیی دو دینارەکەی هاتی بۆیە بەسەرتدا زاڵ بوم ).

هەروەها خودای گەورە لە قورئانێدا باسی کەسێکمان بۆ دەکا کە خودا ئایەتەکانی خۆی بۆ ناردو، لێیان شارەزا بو و، ناسینیو پاشان وازی لە هەموی هێنا، بۆیە خودا شەیتانی بەسەردا زاڵ کرد تافریوی داو گومڕای کردو بو بە پەندێك بگێڕدرێتەوەو چیرۆکێك ئەم زار ئەو زار بکا﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ۞ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ ذَلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ: جا بەسەرهاتی ئەو کەسەیان بۆ بخوێنەوە کە ئایەت و نیشانەی خۆمان پێدا بو، پاشان لە

ـحستورەكانیان دەرچـو، ئینجـا شـەیتان دەسـتی گـەیاندیّ و بەمـە چـوە نێوجەرگەی گومڕایـان. وە ئەگـەر بمانویستبا پلەو پایـەی ویمـان بـەو ئایەتـە بـەرز دەکردەوە، بەڵام ئـەو مـەیلی مـانی سـەر زەوی کـرد و بـەدوای ئـارەزوی خۆیدا چو. وێنەی وی هەر وەك سەگێکە، ئەگەر هێرشی بۆ ببەی ددانە چیڕەت لێدەکاو زمانت لیّ دەردێنیّ، ئەگەر وازیشی لێبینی هەر زمان دەردێنیّ، ئەمە نمونەی ئەو تاقمەیە کە نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دادەنا، جا ئەم چیرۆکـەیان بۆ وەگێڕە، بەڵکو بیربکەنەوەو بێدار بنەوە ﴾ (سورة الاعراف/١٧٥-١٧٦). ئاشکرایە ئەمە بۆ جۆرە کەسانێکە کە هـەق بناسـن و کوفـری پـیّ بکـەن وەك ئەوانـەی دەزانن موحەممەد لەپەروەردگارەوە رەوانـەکراوە، پاشان کوفری پـیّ دەکـەن و باوەڕی پیّ ناهێنن.

بەڵام ئەوەی کە خـودای بـەرز لـێرە مەبەسـتێتی، هـەندێك دەڵـێن: بـەلعامی کوڕی باعورایـە، کە پیاوچاکێك بـو دوایـی کـافر بـو. دەشڵێن ئومەیـەی کـوڕی ئەبو صەلتـە کەلەنەفامیدا خواپەرست بـو. گەیشتە سـەردەمی پێغەمبـەرﷺ و لەئێرەییان باوەڕی پیّ نەهێنا، چونکە وا بەتەمابو بەخۆی ببتە ئەو پێغەمبـەرە نێردراوە، هیچ دەقێکی صەحیحیشمان نیە کە بەتـەواوی پێمان بڵـیّ مەبەست لەم ئایەتە چیە. جا ئەم جۆرە کەسە کە بەڵگەو نیشانەکانی خودایان بۆ دیّو پاشـان بێـبڕوا دەبـن، زۆر ترسـناکن و لەگـەڵ شـەیتانی پێـك دەچـن، چونکـە شـەیتانیش پـاش ناسینی حـەق کـافر بـو، پێغەمبـەریشﷺ ترسـی ئـەم جـۆرە کەسەی بۆ سـەر ئوممەتەکـەی خـۆی هـەبوە، ئەبویـەعلی حـافیظ لـە حوذەیفـەی کوڕی یەمان دەگێڕێتەوە، کە دەڵیّ پێغەمبەری خوداﷺ فەرموی: ((ان مما أتخوف عليكم رجل قرأ القرآن حتى اذا رئيت بهجته عليه، وكـــان رداءه الاســـلام اعـــتراه الى ماشاءالله انسلخ منه ونبذه وراء ظهره وسعى على جاره بالسيف ورماه بالشرك ) قـــال:

قلت يارسول الله: أيهما اولا بالسيف: الرامي أم المرمي؟ قال ( بل الرامي): یەك لەو شتانەی کە ترسم لێی هەیە بۆتان؛ پیاوێکە قورئان بخوێنێ هەتا گەشی لە روی بەدی دەکرێ و تا خودا حەزکا ئیسلام بپۆشێ. دوایی لێی دابشۆرێ وبیخاتە پشت گوێ و بە شمشێرەوە بەرەو هاوسێکەی بچێ و بەهاوبەشدانان تۆمەت باری بکا. دەڵێ: گوتم ؛ ئەی پێغەمبەری خوا، کامیان شایانترن بۆ شمشێرەکە؛ شێروەشێنەکە یان ئەوی دی؟ فەرموی: شێر وەشێنەکە.

## ترسان و هەڵاتنی شەیتان لە هەندێك بەندەی خودا:

ئەگەر بەندە لەئیسلامدا قوڵ بۆوە و ئیمان لە دڵیدا رەگی داکوتاو، هەرگیز سنورەکانی خودای نەبەزاند، شەیتان لێی جوێ دەبێتەوەو، لەبەری هەڵدێ. هەر وەك پێغەمبەرﷺ بە عومەری کوری خەطابی گوت: ((ان الشيطان ليفرق منك يا عمر: بەڕاستی شەیتان لە تۆ هەڵدێ ئەی عومەر)) رواه احمد، والترمذي باسناد صحيح(صحيح الجامع ٢/٧٤). هەروەها دەربارەی عومەر فەرمویتی: ((إني لأنظر شياطين الجن والأنس فرّوا من عمر: من دەبینم شەیتانەکانی جنۆکەو مرۆڤ لەعومەر هەڵدێن)) رواه الترمذي باسناد صحيح (صحيح الجامع ٢/٣٢٩)، ئەمەش شتێکیتایبەت نیە بە عومەر ﷺ بەڵکو هەرکەسێك باوەڕی بەهێزبێ، شەیتانەکەی دەبەزێنێ و ریسوای دەکا. هەر وەك لە فەرمودەیەکدا هاتوە: ((ان المؤمن لينصي شيطانه كما ينصي احدكم بعيره في السفر: بڕوادار جڵەوی شەیتانەکەی دەگرێ. هەر وەك یەکێکتان لەسەفەردا جڵەوی حوشترەکەی دەگری)) رواه احمد. ئیبنیکەثیر لە (البداية ٧٣/١)دا پاش هێنانەوەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ:" مانای(لینصی شیطانه) جڵەوی دەگرێ و دەیبەزێنێو بەسەریدا زاڵ دەبێ، هەر وەکو حوشترێکی کە بەرەڵابێ و پاشان بگیرێتەوە".

جاری واش دەبێ کە بگاتە رادەیەك موسڵمان کار لە جنۆکە هاودەمەکەی بکاو موسوڵمان بێ، ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی تەخریجی کردوە، موسلمیش لە صەحیحەکەی لە ئیبنی مەسعودەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی:

ما منكم الا وقد وكل به قرينه من الجن، وقرينه من الملائكة: هەر یەکێك لە ئێوە ئەسپاردەی هاودەمێك بوە لە جنۆکان و هاودەمێکیش لە فریشتان)).. گوتیان: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: (( وإيّاي، ولكن الله أعانني عليه فلا يأمرني الا بخير: بەڵێ منیش، بەڵام خودا یاریدەی دام بەسەری داو، بە خێر نەبێ فەرمانم پێناکا))..

لە ریوایەتێکی ئیبنی عەبباسیش لە ئیمامی ئەحمەدەوە بە ئیسنادێك لە سەر مەرجی صەحیحدا هاتوە (( ولكن الله اعانني عليه فأسلم: بەڵام خودا یاریدەی دام لەسەری و موسوڵمان بو))، لە ریوایەتێکی عائیشەوەش لە موسلیمدا (( ولكن ربّي أعانني عليه حتى اسلم: بەڵام پەروەردگارم یاریدەی دام لەسەری هەتا موسوڵمان بو))..

## کەوی کردنی جنۆکان بۆ سلێمان:

لە تێکڕای ئەو شتانەی خودا بۆ سلێمانی پێغەمبەری خۆی رام و کەوی کردن؛ جنۆکەو شەیتانەکان بون. چی بویستبا بۆیان دەکردو یاخیەکانیشی ئەشکەنجە دەدان و زیندانی دەکردن: ﴿ فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ۝ وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ۝ وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ: جا ئێمە (با)مان بۆ رام کرد، تا بە فەرمانی وی، بۆ کوێی بویستبا بەنەرمی دەڕۆی و، هەمو

شەیتانەکان کە بنیاتنەر و مەلەوان بون لەگەڵ کۆمەڵە شەیتانێکی دیکە کە بەکۆت و زنجیر پێکەوە بەستراون ﴾ ( سورة ص /٣٦-٣٨).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ الْجِنِّ مَنْ يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَنْ يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ۞ يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِنْ مَحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَاسِيَاتٍ: وەدەستەیەك لە جنۆکەمان بۆ رام کرد بە فەرمانی پەروەردگاری کاریان بۆ دەکرد ئەگەر یەکێك لەوانە لە فەرمانی ئێمە دەرچوبا ئەشکەنجەی ئاگری سوتێنەرمان پێ‌دەچێژان، هەرچی دەیویست لەپەرستگاو پەیکەرو قاپی‌وەك حەوزی‌گەورەومەنجەڵی پتەویان بۆسازدەدا ﴾(سورةسبأ١٢-١٣).

ئەم شێوە رام کردنەش وەرامی خودای بەرز بو بۆ سلێمانی بەندەی کە لێی پاڕاوەو فەرموی ﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي: موڵك و حکومەتێکم پێبدە کە دوای من بۆ کەس شیاو نەبێ ﴾ (سورة ص /٣٥).

ئەم نزایەش بو رێی لە پێغەمبەری ئێمە موحەممەد ﷺ گرت ئەو جنۆکە ببەستێتە کە تۆپەڵە ئاگرێکی هێنا بو دەیویست بە رویدا دا، لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبوددەردائەوە هاتوە دەڵێ: پێغەمبەری خودا ﷺ هەستا بۆ نوێژکردن، گوێمان لێ بو فەرموی: ((أعوذ بالله منك: خۆم بەخودا پەنا دەگرم لە تۆ)). پاشان فەرموی: ((ألعنك بلعنة الله ثلاثاً: بەنەفرەتی خودا نەفرینت لێ‌دەکەم سێ جاران))، جا دەستی خۆی درێژ کرد وەك ئەوەی شتێك بگرێ، کە لە نوێژەکەی بۆوە گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا گوێمان لێ بو شتێکت لە نوێژدا

گوت، پێشتر چ جاری دی نەتگوتبو، دیتمان دەستیشت درێژکرد، فەرموی: (( ان عدو الله ابليس جاء بشهاب من نار ليجعله في وجهي، فقلت : أعوذ بالله منك ثلاث مرات، ثم قلت: ألعنك بلعنة الله التامة ، فلم يستأخر، ثم أردت أخذه، والله لولا دعوة أخينا سليمان لأصبح موثقا يلعب به ولدان أهل المدينة: ئیبلیسی دوژمنی خوا تۆپەڵە ئاگرێکی هێنابو تابە رومی دادا، گوتم: خۆم بە خودا پەنا دەگرم لە تۆ سێ جاران، پاشان گوتم: بەنەفرینی تەواوی خودا نەفرەتت لێ دەکەم. نەیویست بکشێتەوە، پاشان ویستم بیگرم، سوێند بەخوا لەبەر نزاکەی سلێمانی برامان نەبا، بەپەتك كراوی منداڵە هورتکەی شاری مەدینە گەمەیان پێ دەکرد)). ئەمەش چەند جارێك دوبارە بۆتەوە. دیسان لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (( ان عفريتا من الجن جعل يتفلت علي البارحة ليقطع علي الصلاة، وان الله أمكنني منه، فذعته، فلقد هممت أن أربطه الى جنب سارية من سواري المسجد حتى تصبح تنظرون اليه أجمعون، أو كلكم، ثم ذكرت قول أخي سليمان ﴿ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي ﴾ فرده الله خاسئا: دوێنێ ئەرژەنگێکی جنۆکان تفی پێدا دەکردم تاکو نوێژم پێ ببڕێ، خودا وای کرد دەرەقەتی بێم و گرتم و ویستم لە پاڵ یەکێك لە کۆڵەگەکانی مزگەوتێ بیبەستمەوە، تا سبەینەتان لێ دادێ و هەموتان سەیری دەکەن، بەڵام پاشان فەرمودەی سلێمانی برام بیرکەوتەوە کە دەیفەرمو: پەروەردگارم بم بەخشەو موڵك و حكومەتێکم بدێ کە دوای من بۆکەس شیاو نەبێ، جا خودا ئەو جنۆکەیەی بەشەرمەزاری رەت کردەوە)).

**درۆ هەڵبەستانی جولەکان بە سلێمان پێغەمبەر (عليه السلام):**

جولەکەو شوێنکەوتوانیان لەوانەی بە هۆی جادو و ئەفسون جنۆکە بەکار دێنن، دەڵێن سلێمانی پێغەمبەری خواش هەر بەهۆی جادو جنۆکەی بەکار دەهێنان. زیاتر لە یەکێکیش لە زانایانی پێشین باسیان لەوە کردوە کە دوای مەرگی سلێمان، شەیتانەکان کتێبی جادو و کوفریان نوسیوەو، لە ژێر کورسیەکەی وییان داناوەو، گوتویانە سلێمان بە هۆی ئەوانەوە جنۆکەی بەکار دەهێنان، جا هەندێك گوتیان ئەگەر ئەوە رەواو دروست نەبوایە سلێمان نەی دەکرد، بۆیە خودای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزان: ﴿ ولما جاءهم رسول من عند الله مصدق لما معهم نبذ فريق من الذين اوتو الكتاب كتاب الله وراء ظهورهم كانهم لا يعلمون : کاتێك نێردراوێك لەلایەن خوداوە هاتە لایان وکتێبی ئەوانی بەراست دانا. هەندێك لەوانی ئەهلی کتێبن، کتێبی خودایان خستە پشت گوێ، وەك شتێك کە نەیانزانیبێ ﴾ ( سورة البقرة / ١٠١).

دوایێ ئەوەشی رون کردەوە کە ئەوان شوێنکەوتەی ئەو شتانە بون کە شەیتانەکان لەسەر دەمی موڵکی سلێمان دەیانخوێندو، سلێمانی لە جادو و لە کوفر بەری کرد: ﴿ وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا . . . . . الآية: بەنی ئیسرائیل پەیرەوی ئەوەیان دەکرد کە شەیتانەکان لە سەردەمی سلێماندا بۆ خەڵکیان دەخوێندەوە. سلێمان جادوی نەکردو کافر نەبو، بەلاّم شەیتانەکان کافر بون ﴾ (سورة البقرة/١٠٢).

## ناتەوانی جنۆکان لە هێنانی پەرجوان:

جنۆکە ناتوانن وەك ئەو پەرجوانە بێنن کە پێغەمبەران وەك بەڵگە لەسەر راستێتی پەیامەکانیان هێناویانە.

کاتێك کە هێندێك لە بێباوەڕان گوتیان قورئان دەسکردی شەیتانانە، خودای بەرز فەرموی: ﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ۞ وَمَا يَنبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ۞ إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ: شەیتان ئەم قورئانەی نازل نەکردوە و، ئەمانە شیاوی ئەمە نین و هێزی ئەم کارەشیان نیە. بەراستی شەیتانەکان لە گوێگرتن و هەواڵ دزینی ئاسمانێ دور خراونەتەوە ﴾ (سورة الشعراء /٢١٠-٢١٢).

هەروەها خودا بە قورئانێ بەرەنگاری مرۆڤ وجنۆکە بۆتەوە: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا: بلێ؛ ئەگەر مرۆڤ و جنۆکە هەمو کۆ ببنەوە تا وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن بیهێنن هەرچەندە لەم کارەدا یارمەتی و کومەکی وپشتگیری یەکتر بکەن ﴾ (سورة الاسراء /٨٨).

## ناتوانن لە خەونێدا خۆ بێننە سەر شێوەی پێغەمبەرﷺ:

شەیتانەکان ناتوانن لە خەوناندا خۆیان بێننە سەر وێنەی پێغەمبەرﷺ، لە فەرمودەیەکدا هاتوە کە تیرمیذی لە سونەنەکەیدا بە ئیسنادێکی صەحیح دەیگێڕێتەوە: (( من رآني فأني أنا هو، فانه ليس للشيطان أن يتمثل بي: ئەوی بمبینی ئەوە من خۆمم، شەیتان ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر شێوەی من)).

لەهەردو صەحیحانیش بەم بێژەیە هاتوە: ((من رآني فقد رأی الحـــق ، فـــان الشیطان لا یتزیا بي: ئەوی من ببینـی هـەقی دیتـوە، چونکـە شـەیتان نایەتـە سـەر شێوەی من)) (الجامع الصحیح ٥/٢٩٣).

لە رواڵەتی فەرمودەکان ئەوە دیارە کە شەیتان ناتوانێ بێتە سەر شێوەی راستەقینەی پێغەمبەرﷺ، بەڵام ئەمە رێی لێ نـاگرێ کـە خـۆی بهێنێتـە سـەر شێوەیەکی دی‌و بشڵێ من پێغەمبەری خوام.

بۆیە دروست نیە ئەم فەرمودەیە بکرێتە بیانو بۆ ئەوەی هەر کەسێك لـە خـەوندا پێغەمبـەری دیبـێﷺ، بەراسـتی دیتیتـی، تەنـها مەگـەر سـیفەتەکانی هـەمان ئەوانـە بـون کـە کتێبـەکانی فـەرمودە لـەبارەی پێغەمبـەرﷺ بۆمانیـان گێڕاوەتەوە. دەنا خەڵکێکی زۆر هەن دەڵێن پێغەمبەرمانﷺ دیوە بە شێوەیەکی جودا لەوەی کە لە کتێبە متمانەدارەکان دەیانگێڕنەوە.

**ناتوانن سنورێکی دیاریکراو لە ئاسمانێدا ببەزێنن:**

خودای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿ یَامَعْشَـرَ الْجِـنِّ وَالإِنسِ إِنْ اسْـتَطَعْتُمْ أَنْ تَنفُـذُوا مِـنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ فَانفُذُوا لاَ تَنفُذُونَ إِلاَّ بِسُلْطَانٍ۞ فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ۞ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِنْ نَارٍ وَنُحَاسٌ فَلاَ تَنتَصِرَانِ: ئـەی کۆمـەڵی جنۆکـە و مـرۆڤ ئەگـەر دەتوانـن لـە کـەنارەکانی ئاسمـان و زەوی دەرچـن؛ بـرۆن دەرچـن دەرناچن مەگـەر بە هێزو دەسـەڵات نـەبێ جا بـەکام نیعمـەتی پـەروەردەگارتان بێبڕوان. زبانـەی ئاگرو مسـی تـواوە دەنێردرێتـە سـەرتان کە نـاتوانن یارمـەتی یەکدی بدەن و لەخۆتان دوری خەنەوە ﴾ ( سورة الرحمن /٣٣-٣٥).

**جا لەگەڵ ئەو هەمو تواناو خێراییەیاندا، بوارێکی دیاریکراویان هەیە ناتوانن لێی تێپەڕن ئەگەر نا دەفەوتێن و بە هیلاك دەچن.**

**ناتوانن دەرگەیەك بکەنەوە داخرا بێ و ناوی خوای لەسەر هاتبێ:**

**پێغەمبەرﷺ ئەو هەواڵەی پێداوین کە دەفەرموێ:** (( أجيفوا الأبواب واذكروا اسم الله عليها، فان الشيطان لا يفتح بابا أجيف عليه: **دەرگەکانتان داخەن و ناوی خودای لەسەر بێنن، چونکە شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە** )) (رواه ابو داود، واحمد، وابن حبان، والحاكم، باسناد صحيح ( الجامع الصحيح ١/٢٢٩).

**لەفەرمودەیەکی هەردوشێخانیشدا هاتوە:** (( فان الشيطان لا يفتح بابا مغلقا، وأوكوا قربكم ،واذكروا اسم الله ، وخمروا آنيتكم ، واذكروا اسم الله، ولو أن تعرضوا عليها شيئاً، واطفئوا مصابيحكم: **شەیتان دەرگەیەکی داخراو ناکاتەوە، دەمی کوندەکانیشتان ببەستەن و، ناوی خوای لەسەر بێنن و، دەفرەکانتان داپۆشن و ناوی خودای لەسەر بێنن، هەرچەندە کە شوڵە دارێکیشی لەسەردانێن، چراکانیشتان بکوژێننەوە**)) (الجامع الصحيح١/٢٧٠). **لە موسنەدی ئەحمەدیش داهاتوە:** (( اغلقوا أبوابكم ، وخمروا آنيتكم ، وأوكوا أسقيتكم، وأطفئوا سرجكم، فلن الشيطان لا يفتح بابا مغلقا، ولا يكشف غطاءً ، ولا يحل وكاءً: **دەرگاکانتان داخەن و، دەفرەکانتان داپۆشن و، کوندەکانتان گرێدەن و، چراکانتان وەکوژێنن، چونکە شەیتان دەرگەی داخراو ناکاتەوەو، پەردان هەڵناداتەوەو، گرێیان ناکاتەوە**)).

## مەبەست لە ئەفراندنیان

جنۆکە بۆ هەمان مەبەست ئەفرێنراون کە مرۆڤی لەپێناو ئافەرید کراوە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: جنۆکەو شەیتانم تەنیا بۆ هەندێ ئەفراندون کە بمپەرستن ﴾ (سورة الذاريات/٥٦)، بەپێی ئەم ئایەتە جنۆکە ئەرکبارن، فەرمانیان پێ دەکرێ و نەهییان لێ دەکرێ. جا ئەوەی تاعەت بکا، خودا لێی رازی دەبێت و دەیباتە بەهەشتێ. ئەوی یاخی و هەڵگەڕاوەش بێ سەرنجامی ئاگری دۆزەخە، گەلێك دەقیش هەن بەڵگەی ئەم بابەتەن.

لەرۆژی بەرێشدا خودا بەسەر کۆنەو سەرزەنشتەوە دەگەڵ کافرانی جنۆکەو مرۆڤ دەئاخێوێ: ﴿ يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا شَهِدْنَا عَلَى أَنفُسِنَا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ : هۆگەلی جنۆکە و مرۆڤان ئەدی پێغەمبەرانێك لە خۆتان نەهاتنە لاتان کە نیشانی منتان بۆ بلێن و ئێوە لەم رۆژە بترسێنن؟ ئەوان دەڵێن گەواهی دژی خۆمان دەدەین و ژیانی دونیا ئەوانی فریودا و شایەتی لەسەرە خۆ دەدەن کە بێبڕوا بون ﴾ (سورة الأنعام/١٣٠).

جا ئەم ئایەتانە بەڵگەن بۆ گەیشتنی شەرعی خودا بە جنۆکان و هەبونی کەسانێك ئەم پەیام و شەرعە پیرۆزەیان پێ ڕاگەیەنن.

بەڵگەش بۆ ئەشکەنجەدانیان بە ئاگری دۆزەخ ئەوەیە کە خودای بەرز دەفەرمێ: ﴿ قَالَ ادْخُلُوا فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ فِي النَّارِ: خودا فەرمووی؛ لەگەڵ هاوبیرانی خۆتان لەجنۆکەو مرۆڤان بڕۆنە ناو ئاگر ﴾ (سورة الاعراف/٣٨).

هەروەها دەفەرمێ: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ: زۆرمان لە جنۆکەو ومروڤان بۆ دۆزەخێ ئەفراند ﴾ (سورة الاعراف/١٧٩).

وەدەفەرموێ: ﴿ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ: بەراستی دۆزەخ تەژی دەکەم لە جنۆکەو مرۆڤی بێبڕواو تاوانبار ﴾ (سورة السجدة /١٣). بەڵگەش بۆ چونی ئیمانداری جنۆکان بۆ بەهەشتێ ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ۝ فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ: بۆ ئەو کەسی کە لە هەڵوێستگەی خۆی بترسی لەبەردەم پەروەردگاریدا، دو باخی زۆر خۆش هەیە. بەکام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن؟! ﴾ ( سورة الرحمن /٤٦-٤٧).

جا ئەم گوتارە ئاڕاستەی جنۆکەو مرۆڤە، چونکە لەسەرەتای سورەتەکە ئاخافتن لەگەڵ هەردو لایە، لە ئایەتی رابردوش خودا منەت لەسەر بڕوادارانی جنۆکان دەکا بەوەی کە دەچنە بەهەشتێ. جا ئەگەر بەهەشتیان پێ نەبەخشرابا، منەتباری نەدەکردن. ئیبنیموفلیح لە کتێبی(الفروع)دا دەڵێ: بە کۆڕایی زانایان جنۆکە تێکرا ئەرکبارن، بە کۆڕا بێبڕوایان دەنێو ئاگری دەخزێ، بڕواداریشیان دەچێتە بەهەشتێ بە کۆکی و یەکدەنگی دەگەڵ مالیك و شافیعی ﷺ نابنە خۆڵ وەکو چارەوێیان. رێزانەی بڕوادارانیشیان رزگار بونە لە ئاگری دۆزەخ بە پێچەوانەی رای ئەبو حەنیفەو، لەیثی کوڕی سەعدو

ئەوانی دەگەڵەوان کۆکن. دەڵێ: لەوەی یەکەمیش وا دیارە جنۆکەش وەك غەیری خۆیان بەپێی چاکەکاریان لەبەهەشتدان، بە پێچەوانەی ئەوی دەڵێ: تێیدا ناخۆن و ناخۆنەوە، وەك موجاهید، یان ئەوی دەڵێ لەدەوروبەری بەهەشتیدان وەك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز. ئیبنی‌حامید لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (جنۆکەش وەکو مرۆڤن لە ئەکباری و پەرستشدا)(لوامع الأنوار ٢/٢٢٢-٢٢٣).

**لەقەدەر خۆیان ئەرکبارن:**

ئیبنی تەیمییە لە(مجموع الفتاوى ٤/٢٣٢)دا دەڵێ: ( جنۆکان لەقەدەر خۆیان فەرمانیان پێ کراوە بە بنەڕەت و لکەکان. چونکە ئەوان هاوشێوەی مرۆڤ نین لەحەدو حەقیقەتدا. جا ئەو فەرمانانەی پێیان کراوەو ئەو نەهیانەی لێیان کراوە لە رادەدا یەکسان نیە بە هی مرۆڤ، بەڵام لەگەڵ مرۆڤدا هاوبەشن لە بنەڕەتی ئەرکبار بون بە فەرمان و نەهی و، حەڵاڵ و حەرام کردن و، ئەمەش چ ناکۆکیەکی تێدا نیە لە نێو موسوڵمانان).

**وێچونێك و وەرامێك:**

هەندێك خەڵك وێچونێك باس دەکەن و دەڵێن؛ ئێوە دەڵێن جنۆکە لە ئاگر ئەفرێنراون، پاشان دەڵێن کافرەکانیان بە ئاگری دۆزەخ ئەشکەنجە دەدرێن و، ئەو جنۆکانەش کە گوێ بۆ ئاسمانێ رادەگرن بە تۆپەڵەئاگرێك راو دەنرێن، جا چۆن ئاگر کار لە جنۆکان دەکا لە کاتێکدا هەر لە ئاگری ئافەرید کراون؟

وەرامیش؛ ئەو بنەمایەی کە لێی ئەفرێنراون ئاگرە. بەڵام پاش ئەفراندنیان وا نەماون و، بونەتە ئافەریدێکی لە ئاگر جودا.

بۆ رونکردنەوەش، دیارە کە مرۆڤ لە بنەڕەتدا لە خۆڵی ئەفرێنراوە، بەڵام پاش ئەوەی هاتۆتە بون، لە خۆڵێ جودا بۆتەوەو گۆڕاوەو، ئەگەر بە پارچە قوڕێکی سورکراوە (خشتێك) لە مرۆڤێك بدەی رەنگە بیکوژێ و ئەگەر هەر

خۆلیشی بۆ بهاویێی ئازاری دەداو، کە لە خۆڵێدا بیشاریەوە دەخنکێ، جا لەگەڵ ئەوەی کە مرۆڤ لە خۆڵە بەڵام خۆڵ ئازاری دەدا. بۆ جنۆکانیش ئەوها.

**خزمایەتی لەنێوان جنۆکەو پەروەردگاری بەرزدا نیە:**

باسی ئەوەمان کرد جنۆکە یەکێکن لە ئافەریدەکانی خوداو، ئەوانیش کۆمەڵێکن لە سەرجەم بەندەکانی، خودا بۆ هەندێی ئەفراندون تا تاعەتی بکەن و، بەشەریعەتی خۆی ئەرکباری کردون. جا ئەو باسە هەمو ئەو ئەفسانانە دەپوچێنتەوە کە بە هۆی لارێبونی بۆ چون و تێڕوانینەوە هاتونە کایەوەو، لە ئەنجامی پوکانەوەی زانست و بەربلاوی و زۆری نەزانی سەریان هەڵداوە. جا ئەو دەنگۆیەی لەنێو جولەکەو هاوبەشدانەرانی عارەباندا هەبو، لەم بابەتە بو، گوایە کە خودای پاك و بەرز لە جنۆکانی خواستوەو، فریشتەش بەری ئەو هاوسەرێتیەن، جا خودای بەرز ئەو ئەفسانەیەی گێڕاوەتەوەو پوکیشی کردۆتەوە کە دەفەرمێ: ﴿ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا وَلَقَدْ عَلِمَتْ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ۞ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ۞ إِلاَّ عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ: ئەوانە خزمایەتی و نیسبەتیان لە نێوان خواو جنۆکان داناوە. جنۆکانیش چاك دەیانزانی کە بەخۆو بە بتپەرستان لە دادگای خودا ئامادە دەبن، پاکی و پێخەوشی بۆ خودا لەو وەسفەی ئەوان دەیکەن، مەگەر بەندە پاك و دڵڕاستەکانی خودا ﴾ (سورة الصافات ١٥٨-١٦٠). ئیبنی کەثیریش لەکاتی راڤەی ئەم ئایەتانە دەڵێ: (موجاهید دەڵێ: هاوبەش دانەران دەڵێن؛ فریشتەکان کچی خودان پاکیوبەرزی بۆ خودا لەوەی دەیڵێن- جا ئەبوبەکر ﷺ گوتی؛ ئەدی کێ دایکیانە؟ گوتیان: کچی مێیەی جنۆکەکانن. قەتادە و ئیبنی زەیدیش هەمان رای موجاهیدیان هەیە. ئەلعەوفی لە ئیبنی عەبباس دەگێڕێتەوە: (دوژمنانی خودا دەڵێن گوایە خودای بەرزو پاك لە گەڵ ئیبلیسدا بران بەرزی و پاکی وبێخەوشی بۆ خودای مەزن لەوەی کە دەڵێن.)

## چۆن سروشی خودایان پێ رادەگەیەنرێ:

بەپێی ئەوەی جنۆکە ئەرکبارن، دەبێ خودای گەورە سروشی خۆی بەوان رابگەیەنێ، تاکو بیانویان لە سەر دروست کا. جا چۆن خودا پەیام و نیگای خۆی پێ گەیاندون؟ ئایا پێغەمبەری وانیش هەر هەمان پێغەمبەرەکانی مرۆڤانن.

کە خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ. . .﴾: هۆگەلی جنۆکەو مرۆڤان ئەدی لە خۆتانەوە پێغەمبەرتان بۆ رەوانە نەکرا ﴾ (سورة الأنعام /١٣٠)، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە خودا پێغەمبەری بۆ ناردون، بەڵام بە راشکاوی دیار نیە داخۆ ئەو پێغەمبەرانە لە جنۆکە بون یا لە مرۆڤ، چونکە بێژەی (منكم) هەردو لایان هەڵدەگرێ، رەنگە مەبەست ئەوەبێ کە پێغەمبەرانی هەر جۆرێك لە خۆیان بن، یا پێغەمبەری هەردولایان مرۆڤ بن. بۆچونی زانایانیش لەم بارەوە دو جۆرە؛ یەکەم دەڵێ: جنۆکە پێغەمبەریان لە خۆیان هەیە. جا ضەحاك یەکێکە لەو زانایانەی ئەو رایەی هەیە. هەروەها ئیبنیجەوزی دەڵێ: ئەم بۆچونە رواڵەتی ئایەتەکەیە، ئیبنی حەزمیش دەڵێ: لە پێش موحەممەدﷺ هەرگیز پێغەمبەرێکی مرۆڤ لە بۆ جنۆکان رەوانە نەکراوە.

دوەم بۆچونیش دەڵێ: پێغەمبەری جنۆکان هەر لە مرۆڤە. سیوطی لە( لقط المرجان)دا دەڵێ: جەماوەری زانایان لە پێشین و پاشین رایان وایە هەرگیز پێغەمبەرێك لە نێو جنۆکاندا نەبوە. بەم شێوەیەش لە ئیبنی عەبباس و مۆجاهیدو کەلبی و ئەبو عوبەید ریوایەت کراوە) (لوامع الأنوار).

بەڵگەیەکی دیکەش پتر بەلای ئەو رایە دایە کە پێغەمبەرەکانی مرۆڤ هەمان پێغەمبەرانی جنۆکانن، بەڵگەکەش ئەو ئایەتە کە باسی قسەی جنۆکان دەکا

کاتێك گوێیان له قورئان دەبێ: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى: ئێمه گوێمان له کتێبێك بو له دوای موسا دابەزیوه ﴾ (سورة الأحقاف/٣٠) بەڵام ئەمه به دەقێك له بارەی مەسەلەکه حسێب ناکرێ.

ئەم مەسەلەیه هیچ کردەیەکی لەسەر بنیات نانرێ‌و، دەقێکی بڕەریشی دەربارەی نیه، بۆیه پێویست ناکا لەمه زێتر پێدا بچین.

**پەیامی موحوممەد ﷺ بۆ مرۆڤ و جنۆکەیه:**

موحوممەدﷺ بۆ جنۆکه و مرۆڤ ناردراوه. ئیبنی تەیمیه له ( مجموع الفتاوی ٩/١٩)دا دەڵێ: (ئەمه بنەڕەتێکه هاوەڵان و شوێنکەوتوانی به چاکەو پێشەوایانی موسوڵمان لەسەری کۆڕان. لەگەڵ چین و تایفەکانی دیکەی موسوڵمانان؛ ئەهلی سونەتوجەماعەت و، بێجگه لەوانیش (ﷺ)، ئەوەش بەڵگەیه که قورئانی پیرۆز بەرەنگاری جنۆکەو مرۆڤ بۆتەوه که دەفەرمێ: ﴿قُلْ لَئِنْ اجْتَمَعَتْ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا: بڵێ ئەگەر هەمو مروڤ و جنۆکه گردبنەوه تا لەوێنەی ئەم قورئانه بێنن، ناتوانن بیهێنن. هەرچەند گەلەکۆیی‌و پیشتوانی یەکتر بکەن لەم کارەدا ﴾ (سورة الأسراء /٨٨).

کۆمەڵه جنۆکەیەکیش خێرا باوەڕیان هێنا که گوێیان له قورئان بو: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنْ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ۞ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا . . .: بڵێ وام سروش بۆ کرا که کۆمەڵه جنۆکەیەك گوێیان راگرت، جا گوتیان ئێمه قورئانێکی سەیرمان بیست، بۆ رێگەی راست

**ڕێنماییی دەکا وە ئێمەش بڕوامان هێناوە وە هەرگیز کەسێك ناکەینە هاوبەش بۆ پەروەردگارمان** ﴾ (سورة الجن /١-٢).

**جا ئەو کۆمەڵە جنۆکەیەی گوێیان بۆ قورئان ڕادێراو باوەڕیان هێنا، هەمان ئەوانەن کە لە سورەتی (الأحقاف)دا باسیان کراوە:** ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ۞ قَالُوا يَاقَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنْزِلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُسْتَقِيمٍ۞ يَاقَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ۞ وَمَنْ لَا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءُ أُولَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ: **کاتێك کۆمەڵە جنۆکەیەکمان ناردە لای تۆ تا قورئان ببیستن، کە گەیشتن، گوتیان؛ وس بن و گوێ ڕاگرن، کاتێ تەواو بو وەکو ترسێنەر گەڕانەوە نێو هۆزی خۆیان، گوتیان ئەی هۆزی ئێمە، گوێمان لە کتێبێك بوە دوای موسا دابەزیوە، لە گەڵ کتێبەکانی پێشو هاودەنگە بۆ هەق و ڕێگەی ڕاست ڕێنماییی دەکا. ئەی هۆزی ئێمە وەڵامی ئەو بانگەوازکارەی خودا بدەونەوە و بڕوای پێ بێنن تا خوا لە گوناهتان خۆش بێ و لە ئەشکەنجەی دەرداوی بتانپارێزێ وە هەرکەسێك وەڵامی بانگەوازکاری خودا نەداتەوە، ناتوانێ لەسەر زەوی لە خودا هەڵێ و بێجگە لە خودا پشتوانیەکی بۆ نیە. ئەوانە لە لارێ بون و گومڕاییەکی ئاشکرا دان** ﴾ (سورة الأحقاف /٢٩-٣٢).

**ئەمانە گوێیان دایە قورئان و، وە باوەڕیان پێ هێناو، وەك بانگەوازکار گەڕانەوە و قەومەکەی خۆیان بۆ باوەڕهێنان و یەکخواناسی بانگ دەکردو مۆژدەیان دەدانێ و دەیان ترساندن.**

جا بوخاری و موسلیم چیرۆکی ئەو جنۆکانەی گوێیان بۆ پێغەمبەرﷺ راگرت؛ لە ئیبنی عەبباس ﷺ دەگێڕتەوە، گوتی: ((پێغەمبەرﷺ لەگەڵ کۆمەڵە هاوەڵێکی خۆی بەرەو بازاری عوکاظ دەهاتن، شەیتانەکانیش ڕێی هەواڵدزینیان لێ گیرابو و، تۆپەڵە ئاگریان تێ گیرابو، جا شەیتانەکان چونەوە ناو هۆزی خۆیان، لێیان پرسین: چیتان لێ قەوماوە؟ گوتیان: ڕێی هەواڵی ئاسمانمان لێگیراوەو تۆپەڵە گڕمان تێگیراوە. گوتیان: دەبێ شتێك روی دابێ کە دەبێتە هۆی دابەزینی ئێوە لە ئاسمانێ، بڕۆن لە ڕۆژ هەڵات و ڕۆژاوای زەویدا بگەڕێن و، بزانن ئەو شتە چیە ئێوەی لە هەواڵی ئاسمانێ دابڕیوە...، جا کۆمەڵێك بەرەو تیهامە هاتن بۆ لای پێغەمبەرﷺ کە لە نەخلەدا بو بەرەو بازڕی عوکاظ دەهات، لەو کاتە لەگەڵ هاوەڵانی نوێژی بەیانی دەکرد، کە جنۆکەکان گوێیان لە قورئان بو گوتیان؛ گوێی بۆ رادێرن، گوتیان؛ سوێند بەخوا ئەمەیە ئێوەی لە هەواڵی ئاسمانێ دابڕیوە. جا ئەو کاتە گەڕانەوە نێو هۆزی خۆیان و گوتیان: هۆ هۆزی ئێمە، ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەیر بو بەرەو راستەڕێ رێنماییی دەکاو بڕواشمان پێ هێنا.

ئەوجا خودا ئەو ئایەتەی بۆ پێغەمبەرەکەی دابەزاند ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ: بڵێ وام سروش بۆ کراوە کە کۆمەڵێك لە جنۆکەکان گوێیان راگرت ﴾ (سورة الجن/١).

**شاندەکانی جنۆکان:**

ئەوە لە سەرەتای ناسینی پەیامی موحەممەدﷺ بو لە لایەن جنۆکانەوە، بێ ئاگاداری و زانینی پێغەمبەرﷺ گوێیان بۆ قورئانێ گرتبو. کۆمەڵێکیان ئیمانیان هێناو بونە بانگەوازکارو رێنیشاندەر.

پاشان شاندەکانی جنۆکان چین چین دەهاتنە لای پێغەمبەرﷺ تاکو زانستی لێ وەرگرن، پیغەمبەریشﷺ کاتی خۆی بۆیان تەرخان کردو. ئەو زانستەی فێرکردن کە خودای گەورە ئەمی فێرکردبو و، قورئانی بۆ خوێندنەوە و هەواڵی ئاسمانی پێ راگەیاندن... ئەوە پێش کۆچ بو لە شاری مەککە، موسلیم لە صەحیحەکەیداو ئەحمەد لە موسنەدەکەی لە عەلقەمەوە دەگێڕنەوە گوتی لە عەبدوللای مەسعودم گوت: ئەو شەوی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ جنۆکان ژوانی هەبو، کەسی لەنگۆ لەگەڵ خۆی برد؟ گوتی: نەخێر کەسی لەئێمە لەگەڵ نەبو، بەلام شەوێکی لە مەککەدا پێغەمبەرمان لێ بزر بو. گوتمان کوژراوە؟ رفاندویانە؟ چی کردوە؟! گوتی: شەوێکی یەکجار سەخت و ناخۆشمان بەسەر برد. ئەوجا لەبەرەبەری بەیاندا دیتمان وا لەلای حەرائەوە دێ، گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا، ئێمە حاڵمان ئاوا بوە، فەرموی: (( إنه أتاني داعي الجن فأتيتهم فقرأت عليهم: بانگخوازی جنۆکان هاتنە لام منیش هاتمە لایان و قورئانم بۆ خوێندن)). گوتی ئەوجا پێغەمبەرﷺ پێشمان کەوت و شونی جنەکان و جێی ئاگرودوی ئەوانی نیشان داین. لە ریوایەتێکی طەبەریدا هاتوە لە ئیبنی مەسعودەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((بت اليوم أقرأ على الجن واقفا بالحجون: ئەمشەوەم وا بەسەربرد، قورئانم بەسەر جنۆکاندا دەخوێندو هەر بە پێوە راوەستابوم)).

جا سورەتی( الرحمن) یەکێك بو لەو سورەتانەی بۆی خوێندونەتەوە. هەروەك دەفەرمێ: ((لقد قرأها (يعني سورة الرحمن) على الجن ليلة الجن، فكانوا أحسن مردودا منكم، كنت كلما أتيت على قوله: ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ؟﴾ قالوا: ولا بشيْ من نعمك ربنا نكذب، فلك الحمد: ئەو شەوی لەگەڵ جنۆکاندا بوم سورەتی (الرحمن)م بۆیان خوێندەوە. ئەوان وەلام دانەوەیان لە ئێوە چاکتر بو. هەرچەند

جاری دەگەیشتمە ﴿ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ؟: کامە نیعمەتانی پەروەردگارتان بەدرۆ دەخەنەوە و بڕوای پێ ناکەن ﴾ ، ئەوان دەیانگوت: نەخێر هیچ نیعمەتێکی پەروەردگاری خۆمان وەدرۆ ناخەینەوە، ستایش و سوپاس گوزاریش هەر بۆ خودایە)) رواه البزار والحاكم وابن جرير باسناد صحيح(الجامع الصحيح ١/ ٣٠).

ئەو شەوەش تاکە شەو نەبوە؛ بەڵکو پاش ئەوەش چەندین جار پێغەمبەرﷺ لەگەڵ جنۆکاندا پێك گەیشتوە. ئیبنی کەثیریش لە راڤەی سورەتی (الأحقاف)دا ئەو فەرمودانەی هاوردوە کە لە بارەی کۆبونەوەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ جنۆکان دەدوێن. لە هەندێك لەوان فەرمودان داهاتوە کە ئیبنی مەسعود، لە یەکێك لەو شەوانە لە پێغەمبەرﷺ نزیك بوە.

لە هەندێك ریوایەتیش لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە کە بڕێك لەو جنۆکانەی هاتنە لای پێغەمبەرﷺ، هی لای یەمەنێ بون و نیشتەجێی ناوچەیەك بون پێی دەڵێن(نصيبين)، هەروەك بوخاری لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕتەوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، فەرموی: (( أتاني وفد نصيبين –ونعم الجن– فسألوني الزاد، فدعوت الله لهم ألا يمروا بعظم ولا روثة إلا وجدوا عليها طعاما: شاندی جنۆکەی نەصیبەین هاتنە لام –کە باشترینی جنۆکانن– داوای زادیان لێکردم، لە خودا پاڕامەوە کە بەهەر هێسکێك یا ریخێك تێپەڕ بن؛ خواردنێکی لەسەر بدۆزنەوە)).

## بانگەوازی جنۆکە بۆ مرۆڤ:

لە هەندێك فەرمودەی صەحیحدا هاتوە، کە جنۆکە هەبون رۆڵیان لە رێنوینی مرۆڤدا هەبوە. لە صەحیحی بوخاریدا لە عومەری کوڕی خەطاب هاتوە کە پرسیاری لە پیاوێك کرد، ئەم پیاوە لەسەردەمی نەفامیدا پێشبین بو، عومەر لێی پرسی سەیرترین شتێك جنۆکەکەت بۆی هێنابی چ بوە؟ کابرا

**گوتی: ( رۆژێك ئەمن لە بازاڕی بوم، جنۆكەكەم هاتە لام ترسی لێ نیشتبو، پێی گوتم:**

ألم تر الجن وابلاسها          ويأسها بعد انكاسها

ولحوقها بالقلاص واحلاسها

**واتە: نەتدیوە جنۆكە لە چ دڵتەنگیو بێهیواییەكی كەوتون لەپاش لاواز بون و سوكایەتیان، كە كەوتونەتە دوای حوشتران**

**عومەر ﷺ گوتی: ڕاست دەكا، جارێكیان من لەلای خوداكانیان نوستبوم، كابرایەك گۆلكەكی هێنا و لەوێ سەری بڕی، دەنگێك تێیدا هاواری كرد كە من هەرگیز هاواری لەوە بەهێزترم گوێ لێ نەببو، دەنگەكە دەیگوت: هۆ جەلیح، كارێك ڕوی داوە، پیاوێكی زمان پاراو دەڵێ: لا اله الا الله، گوتی؛ هەمو هۆزەكە ڕاپەڕین و هەستانە سەر پێ، جا گوتم: من ئێرە جێ ناهێڵم هەتا دەزانم چ لەدوای ئەم كارەوەیە، دیسان بانگی كرد: هۆ جەلیح، كارێك ڕویداوە، پیاوێكی زمان پاراو دەڵێ: لا اله الا الله، جا هەستام و هێندەمان پێ نەچو، گوتیان ئەمە پێغەمبەرە.**

**ئیبنیكەثیر لە ڕاڤەی سورەتی(الأحقاف)دا، پاش هێنانەوەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: (بوخاری بەم جۆرەی هێناوەتەوە، هەروەها بەیهەقی لە فەرمودەی ئیبنی وەهەب بەشێوەیەكی نزیك لەمە هێنایتیەوە. پاشان دەڵێ: ئەم فەرمودە بە ڕواڵەت وا دەنوێنێ كە عومەر ﷺ بەخۆی گوێی لەو دەنگە بو كە لە گۆلكە سەربڕاوەكە هاواری كرد، ئەمەش بەئاشكرا لە ڕیوایەتێكی لاواز لە عومەرﷺ هاتوە، ڕیوایەتەكانی دیكەش وا دەگەیەنن كە پێشبینەكە هەواڵی دیتن و گوێلێبونەكەی گەیاندوە، والله اعلم، پاشان گوتی: ئەو پیاوە سەوادی كوڕی قاریب بو.**

**فەرمانیان بە چاکەو گەواهی‌دانیان بۆ موسوڵمانان:**

باسی ئەو فەرمودەیە دێ کە پێغەمبەرﷺ باسی ئەوەی تێدا کردوە کە هاودەمە جنۆکەکەی موسوڵمان بوەو، بەخێرو چاکە نەبێ فەرمانی پێ‌ناکا. ئەبوسەعیدی خودری بە ئەبو صەعصەعەی ئەنصاری گوت: (دەتبینم دەشت و دەرو مەڕت خۆش دەوێ، جا ئەگەر لەناو رانەکەت بوی لە دەشتێدا و بانگی نوێژت دا دەنگت بڵند کە، چونکە بە درێژی ئەو ماوەیەی دەنگی بانگدەرەکە دەیگاتێ، هەر جنۆکەیەك یا مرۆڤێك یا هەر شتێك گوێی لێ‌بێ لە رۆژی قیامەتدا گەواهی بۆ دەدا). ئەبو سەعید دەڵێ: ئەمەم لە پێغەمبەرﷺ ژنەوت. (رواه البخاري).

ئەمەش وادەگەیەنێ کە جنۆکە لە رۆژی دواییدا گەواهی بۆ کەسێك دەدەن کە گوێیان لە دەنگی بانگدانی بوبێت.

**پلەو پایەیان لە چاکی‌و خراپیدا:**

لەمەدا جنۆکە چەند کۆمەڵێکن؛ تێیاندایە لە راستەڕێ بون وباشی و چاکە کاری و تەواوەو، هەیانە لەخوار ئەوان و، گێلووێلیشیان تێدایەو، کافرو بێبڕواشیان هەیە، ئەمانەش زۆرینەی هەرەزۆرن. خوداش کاتێك چیرۆکی ئەوان جنۆکان دەگێڕتەوە کە گوێیان بۆ قورئان رادێرا دەفەرمێ: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا: ئێمە صالح و چاکەکاری تەواومان تێدایەو، هەمانە لە خوار ئەوانن و راڕەوەی جیاجیامان هەیە ﴾ (سورة الجن /١١).

کەواتە ئەوانیش هەروەك مرۆڤ راڕەوی جیاجیایان هەیە، خودای بەرز دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَٰئِكَ تَحَرَّوْا

رَشَدًا۞ وَأَمَّا القَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا : ئێمە موسوڵمانمان تێدایە و هەمانە بە بێباوەڕن و ستەمیان لە خۆ کردوە، جا ئەوەی موسوڵمان بوە ڕێی ڕێنوێنی گرتۆتە بەر بەکردەوەکان و ئەوی زۆر و ستەمیشی لەخۆ کردوە دەبتە سوتەنی جەهەننەمیٚ ﴾ (سورة الجن لی١-ی١).

**سروشتی شەیتان:**

خودا توانای باوەڕهێنان و کوفری بە جنۆکان بەخشیوە. هەر بۆیەشە کاتی خۆی شەیتان خوا پەرستێك بوە لەگەڵ فریشتان و پاشان کافر بوە.

جا کاتێك روی لە بێباوەڕی کردو بۆ خۆی هەڵیبژارد، شەڕو خراپەکاریشی خۆشویست و بەدوایدا دەگەڕاو، چێژی لە خراپەکردن وەردەگرت و بانگەوازی بۆ دەکرد، دەرون و ناخی چەند گەنیو بو هێندە رشت بو لەسەر خراپەکاری، هەرچەندە مایەی ئەشکەنجەدانیشی بێ: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ۞ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ: گوتی: جا سوێند بە عیزەتی تۆ هەمویان لاڕێ دەکەم، لەوانە بترازێ کە بەندەی پاك و دڵراستی تۆن ﴾ (سورة ص /٨٥-٨٤).

جا مرۆڤیش ئەوهای لێدێ، چونکە مرۆڤ ئەگەر دەرونی گەندەڵ بـو، ئارەزوی دەچێتە ئەو شتانەی زیانی پێ دەگەیەنن و چێژیان لێ وەردەگرێ، بەڵکو تەواو عەشقی خراپەکاری لە کەللەی دەداو ئاین و رەوشت و جەستەو ماڵەکەی توشی گەندی دەکا. هێندەش بەسە کە لە باری مەیخۆرو جگەرەکێشان ورد ببیەوە، دەبینی بەهۆی خواردنەوەو جگەرە بە هیلاك دەچن و دەفەوتێن، کەچی هەر ناتوانن لە دەستی دەرباز بن مەگەر بە هەوڵ و کوششێکی زۆر.

**ئایا شەیتان موسوڵمان دەبێ:**

بە پێی فەرمودەی[1] پێغەمبەرﷺ شەیتان دەتوانێ موسڵمان بێ. بەبەڵگەی ئەوەی کە شەیتانەکەی پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بو، کەچی هەندێك زاناش هەن ئەوە رەت دەکەنەوەو دەڵێن: شەیتان باوەڕدار نابێ، راڤەکاری طەحاویش لە(ل ٤٣٩)دا وای بۆ چوەو دەڵێ: ((فأَسلَمَ)) واتە: رام بو و خۆی دابەدەستەوەو تەسلیم بو.

هەندێك زاناش رایان وایە ریوایەتەکە بـ ەرەفعی پیتی میمە ((فأسلمُ))، کە مانای وایە من لەدەستی سەلامەت دەبم، لەگەڵ ئەوەی راڤەکاری طەحاوی دەڵێ ریوایەتی رەفع گۆڕینی بێژەرەکەیە، بەڵام نەوەوی لە راڤەکەی بۆ موسلیم دەڵێ: ( هەردوك شێوە ریوایەت بەناوبانگن). ئەوەش بۆ خەطابی دەگێڕێتەوە کە ریوایەتی بۆرەکەی* لا راستتر بوە.

بەڵام ئیبنی حیبان لەوان زانایانە کە وای بۆ دەچێ شەیتان دەتوانێ موسوڵمان بێ‌و، دەربارەی فەرمودەکەش دەڵێ: ( ئەم هەواڵە بەڵگەیە بۆ موسوڵمان بونی شەیتانەکەی پێغەمبەرﷺ بەشێوەیەك کە بەچاکە نەبا فەرمانی پێ نەدەکرد. لەگەڵ هەندێشدا ئەگەر کافریش بوایە پێغەمبەرﷺ هەر لەدەستی ساغلەم وسەلامەت دەبو.

ئەوەی راڤەکاری طەحاویش بۆی چوە کە شەیتان هەر دەبێ کافر بێ، قسەیەکی لەسەر هەیە، ئەگەر مەبەستی وابێ کە تەنها بە کافری جنۆکان دەگوترێ شەیتان، ئەوا راستە، ئەگەر مەبەستیش ئەوە بێ کە شەیتان ناتوانێ موسوڵمان بێ‌و رو لە ئیسلام کا، ئەوە زۆر دورە و فەرمودەکە دەبێتە بیانو لە سەری.

---

١ لەوەو دوا ئەو فەرمودەش دێ کە باس دەکا خودا یاریدەی پێغەمبەرﷺ داوە لە ئاست شەیتانەکەی تا موسوڵمان بو و تەنها بۆ کاری چاك فەرمانی پێ دەکا.

* بۆر: صنمّة

## هۆكارەكانی دژایەتیەكە و
## دیرۆك و توندی ئەم دژایەتیە

دژایـــەتی نێـــوان مـــرۆڤ و شـــەیتان رەگاژۆیـــەو رەگـــی قـــوڵ داكوتـــاوە. دیرۆكەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوێ رۆژێ كـە خـودا شـكل و وێنـەی ئـادەمی پێكهێنا ، پێش ئەوەی گیانی وەبەردا بكا، شەیتان لە دەوری دەهات و دەچو ، دەیگـوت: ئەگـەر زاڵ كرێـی بەسـەرمدا لێـت یـاخی دەبم و، ئەگـەر زاڵ بكرێـم بەسەرتدا دەتفەوتێنم.

لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:(( لمـا صور الله آدم في الجنة، تركه ما شاء الله أن يتركه، فجعل ابليس يُطيف به، ينظر ما هـو، فلما رآه اجوف عرف أنه خلق خلقـا لا يتماسـك: كە خودا لـە بەهەشتیّ وێنـەی ئادەمی كێشـا . چەندی ڤانی خوا وابو وازی لیّ هێنا، ئیبلیس لەدەوروبـەری دەسوڕاوە، بزانێ ئەمە چیە، كە دیتی كلۆرە، زانـی ئەمە ئافەریدەیەكە یەكدی ناگرێ)).

جا كاتێك خودا گیانی وەبەر ئادەمدا كردو، فەرمانی بە فریشتان دا سوژدە بۆ ئادەم ببەن و، ئیبلیسیش هەنگی دەگەڵ فریشتان لە ئاسمانێدا پەرستشی دەكرد، بۆیێ فەرمانەكە ئەویشی گرتەوە، بەڵام خۆی مەزن هاتە بەرچاوان و زلفیزو لەخۆبایی بو، سوژدەشی بۆ ئادەم نەبردو گوتی: (ئەمن لەوی چاترم ، منت لە ئاگر ئەفراندوەو، ئادەمت لە قوڕ ئەفراندوە).

که ئادەمی باوکمان چاوانی هەڵێنا، دیتی ڕێزێکی زۆر مەزنی لێ دەگیرێ، دیتی وا فریشتان بۆی لەسوژدە دان ، بەڵام دوژمنێکی سەرسەختیشی بەدی کرد، کە گەڤوگوڕی تەفروتوناو گومڕاکردن لە خۆیو نەوەکەی دەکا.

ئەوجا خودێ، شەیتانی لە بەهێشتی نەمریدا وەدەرنا بەهۆی زلفیزیو خۆبەگەورە زانینی. شەیتانیش وادەو بەڵێنێکی لە خوداوە هاسڵ کرد، کە تا ڕۆژی قیامەت بە زندویی لێی گەڕێ: ﴿ قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ۞قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ: شەیتان گوتی: تا ڕۆژی زیندبونەوە مۆڵەتم بدەو زندو ڕامگرە، خودا فەرموی : تۆ لە مۆڵەتدراوانی ﴾ ( سورة الاعراف/١٤-١٥)، جا ئەو نەفرەت لێکراوە پەیمانێکی لەگەڵە خۆی بەست کە هەر ئادەمییان گومڕا کاو تەڵەو داویان بۆ بنێتەوە: ﴿ قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ۞ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ: گوتی: جا بەوەی منت گومڕا کرد، من لە سەر ڕێگەی ڕاستی تۆ بۆوان خۆ لەکەمین دەگرم، لە دواییدا لەپێشیان و لەپشت سەریانەوەو لەلای ڕاست و لەلای چەپیان دەچمە جەستەیان. زۆربەی ئەوانەش شوکرانەبژێر نابن ﴾ (سورة الاعراف/١٦-١٧). جا ئەم قسەیە کۆششی شەیتانمان دێنتە بەر چاوان بۆ گومڕاکردنی ئادەمیزاد.

شەیتان لەهەمو لایەکەوە بۆ مرۆڤ دێ، لەلای ڕاست و لەلای چەپ ، هەروەها لە پێشەوەو لە پاشەوەڕا، واتە لە هەمو ئاڕاستەو لایەکان. زەمەخشەری لە ڕاڤەی ئەو ئایەتەدا دەڵێ: ( پاشان لەو هەر چوار لایەوە بۆ مرۆڤ دێم کە زۆرینەی کات دوژمنیان لێوە دێ، ئەمەش نمونەیەکی وەسوەسەی شەیتانە بۆ ئادەمییان، لەگەڵ بۆڕازاندنەوەو گومڕاکردن بەو هێندەی بۆی دەڕەخسێو توانای پێدا دەشکێ، هەروەك دەفەرمێ :﴿ وَاسْتَفْزِزْ

مَنْ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ: وەهەر کەسێکی دەتوانی لەوانە بەدەنگی خۆت دنەیان بدەو بەرگریان لێبکە و بەلەشکری سوارو پیادە بنێرە سەریان ﴾ (سورة الاسراء/٦٤).

**ئاگادار کردنەوەمان لە شەیتان لە لایەن خوداوە:**

قورئانی پیرۆز بە درێژی لە ئاشوبی ناهەمواری شەیتان ئاگادارمان دەکاتەوە دەمانترسێنێ لە لێزانی و پسپۆری لە گومراکردن و سوربون لە ئەنجامدانی کردەوەکەیدا. خودای بەرز دەفەرموێ :﴿ يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ: هۆ زارۆڵانی ئادەم وریا بن شەیتان فریوتان نەدا ﴾ (سورة الأعراف/٢٧).

هەروەها دەفەرمێ: ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا: بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە جا بەدوژمنی خۆتانی بگرن ﴾ ( سورة فاطر/٦).

دیسان دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ يَتَّخِذْ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُبِينًا: هەر کەسێکی بێجگە لە خودا شەیتان بکاتە پشتیوانی خۆی، بەڕاستی دۆڕاو خەسارەتمەندە ﴾ (سورة النساء/١١٩).

دوژمنایەتی شەیتانیش نە ڕێی لێ دەگیرێ‌و نە لەناو دەبرێ، چونکە ئەو وای بۆچوە کە دەرکردن و نەفرەت لێکردن و وەدەرنانی لە بەهەشتێدا بەهۆی ئادەمی باوکمانەوە بوە، بۆیە هەر دەبێ تۆڵە لە ئادەم و لە پاش ئادەمیش لەنەوەو زارۆڵانی بکاتەوە: ﴿ قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلاَّ قَلِيلاً: ئایا ئەوەت دیت کە لەباتی من هەڵت بژاردوە،

ئەگەر تا رۆژی رابون زندوم راگری، هەمو زارۆکانی بێجگە لە ژمارەیەکی کەم لاڕێ دەکەم و رەگوریشەی چاکیان لەبن دەردێنم ﴾ (سورة الاسراء/٦٢). زانایانی رەفتارو رەوشتزانان، زۆر گرنگیان بەباسی نەفس داوەو لە بابەت نەنگیو گۆنگەلەکانی زۆر دواون و لە ناساندن و ناسینی دوژمنە سەرسەختەکەیان کورتیان هەڵێناوە، هەرچەندە خودا زۆری لەو دوژمنە ترساندوین و فەرمانی پێ کردوین کە خۆمانی لێ پەنادەین و، لە هیچ شوێنەکیشدا فەرمانی نەداوە کە خۆمان لە نەفس پەنا گرین، بەڵکو خۆپەناگرتن لە شەڕو خراپەی نەفس تەنها لە میانەی وتاری ئاتاجیدا هاتوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموی: ((ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا: خۆ بەخودا پەنا دەگرین لە خراپەکانی ناخمان و، کردە خراپەکانمان)).

# ئامانجەکانی شەیتان

**ئاما نجە دورەکەی:**

تاکە ئامانجێك هەیە شەیتان هەوڵ دەدا لـە کۆتـاییدا بیگاتێ ئەوەیـە کـە دەیـەوێ مرۆڤ بخاتـە نێو دۆزەخ و لـە بەهەشتی بکـاو دوری خاتـەوە، ﴿إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ: شەیتان کۆمەڵی خۆی هەر بۆ هەندێ بانگ دەکا تاببنە هاودەمو دۆستی ئاگری بەتین﴾ (سورة فاطر/٦).

**ئاما نجە نزیکەکانی :**

ئەوە ئامانجە دورەکەی شەیتان بو، بەڵام ئامانجە نێزیکەکانی ئەمانەن:

**١- لە شیرك و کوفر خستنی بەندان:**

بە بانگەواز کردنـی بـەندەکان بـەرەو پەرسـتنی غـەیری خـوداو بێبـاوەڕی بەخودای بەرزو شەریعەتە پیرۆزەکەی: ﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ: هەروەکو شەیتان کە بە مرۆڤی گوت: کافر بە. جا کاتێك بێبڕوا بو، گوتی: بەڕاستی من لە تۆ بێزارو بەریم﴾ (سورة الحشر/١٦).

هەروەها موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە عیاضی کوڕی حـەممار دەگێڕێتـەوە کە پێغەمبەر ﷺ رۆژێك وتارێکیداو فەرموی: ((یاأیها الناس، إن الله تعالی أمـرني أن أعلمکم ما جهلتم مما علَمني في يومي هذا، إن كل ما منحته عبدي فهو له حـلال، واني خلقت عبادي حنفاء كلهم، فاتتهم الشياطين، فأجتالتهم عن دينهم، وأمرهم أن يشـركوا

بِي ما لم أنزل به سلطانا: هۆ خەڵكینە، خودای بەرز فەرمانی پێكردم، لەم ڕۆژەمدا ئەو شتانەتان فێركەم كە فێری منی كردوەو ئێوە نایزانن؛ ئەوی بەبەندەی خۆم بەخشیوە بۆوی حەڵاڵە، هەروەها من هەمو بەندەكانی خۆم بە موسوڵمانەتی ئەفراندون، جا شەیتانەكان هاتنە وێزەیان، لە ئایینەكان وەدەریان ناون و، فەرمانیان داونێ شتانێكی وا بۆ من بكەنە هەڤپشك كە هیچ دەسەڵاتم نەداونێ)).

**٢- گەر نەیتوانی كافریان كا، دەیانخاتە نێو گوناهان:**

جا ئەگەر نەیتوانی توشی شیرك و كوفریان بكات، بێهیوا نابێ، بەڵكو بەكەمتر رازی دەبێ‌و دەیانخاتە ناو گوناه و تاوانان و، دوبەرەكی‌و دژایەتی دەخاتە ناو ڕێزەكانیان، لە سونەنی تیرمیذی و ئیبنی‌ماجەدا بەسەنەدێكی چاك هاتوە: ( ألا ان الشيطان قد أيس أن يعبد في بلدكم هذا أبدا، ولكن ستكون لـه طاعة في بعض ما تحقرون من أعمالكم، فـيرضى بها: بەڕاستی شەیتان بێهیوا بوە لەوەی تا هەتایە لەم وڵاتەی ئێوە بپەرسترێ. بەڵام لە هەندێك كردەنی كە ئێوە بە گچكەی دەزانن، گوێڕایەڵی دەكەن، ئەویش بەوەندەی رازی دەبێ. لە صەحیحی بوخاری‌و غەیری ویش هاتوە: (( ان الشيطان قد أيس ان يعبده المصلون في جزيرة العرب، ولكن في التحريش بينهم: شەیتان بێهیوا بوە لەوەی بپەرسترێ لە لایەن نوێژكارانی دورگەی عارەبان، بەڵام تێكیان بەردەدا)). جا تێك بەردانەكەش بە نانەوەی دژایەتی‌و كینەو رق لە نێوانیانداو تیختیخە دانیان لە یەكتری، هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ: شەیتان دەیەوێ بە هۆی شەراب و قومارەوە، دوژمنێتی و رقابەری لە نێوتاندا

بخاتەوەو ئێوە لەیادی خوداو نوێژکردنێ بگێڕێتەوە . جا ئایا دەست لەم کارانە هەڵدەگرن؟﴾ ( سورة المائدة/٩١).

هەروەها شەیتان فەرمان بە هەمو خراپەکاریو شەڕێك دەكات: ﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاءِ وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ: «راستی شەیتان تەنیا بە بەدفەڕیو داوێنتەڕی فەرمانتان پێدەکا، وە واتان لێدەکا شتانێکی کە نایزانن لە بابەت خوداوە بیڵێن ﴾ ( سورة البقرة/١٦٩).

پوختەی قسانیش ئەوەیە؛ هەمو پەرستشێك کە خودا پێی خۆش بێ، لەلای شەیتان بوغزێنراوەو، سەرجەم ئەوگوناهانەی خودا رقی لێیە، لەلای شەیتان خۆشەویستن.

٣- ڕێگرتن بە بەندان لە تاعەتی خودا:

شەیتان هەربەوە واز ناهێنێ خەڵکی بۆ کوفرو گوناە وتاوانان بانگ بکا، بەڵکو تەنانەت ڕێگەی چاکەکاریشیان لێ دەگرێو، هەر ڕێگەیەکی یەکێك لە بەندەکانی خودا بۆ چاکەکاری بیگرێتە بەر، سەری ڕێی لێ دەگرێو، لاڕێی دەکا. لەفەرمودەیەکی پیرۆزدا هاتوە: (( إن الشيطان قعد لأبن آدم بأطرقه؛ فقعد له بطريق الإسلام، فقال: تسلم وتذر دينك ودين آبائك وآباء آبائك؟ فعصاه فأسلم، ثم قعد له بطريق الهجرة، فقال: تهاجر وتدع ارضك وسمائك؟ وإنما مثل المهاجر كمثل الفرس في الطول، (الطول: الحبل الطويل، يشد احد طرفيه في وتد أو غيره، والطرف الآخر في يد الفرس ليدور فيه، ويرعى ولا يذهب لوجهه)، فعصاه فهاجر، ثم قعد له بطريق الجهاد، فقال: تجاهد فهو جهد النفس والمال، فتقاتل فتقتل فتنكح المرأة ويقسم المال؟! فعصاه فجاهد، فمن فعل ذلك كان حقا على الله أن يدخله الجنة، ومن قتل كان حقا على الله أن

يدخله الجنة، وإن غرق كان حقا على الله أن يدخله الجنة، وإن وقصته دابته كان حقا على الله أن يدخله الجنـــة: شەيتان لەسەر ڕێگەکانی ئادەمی دانیشت و، لە ڕێگەی ئیسلام بۆی دانیشت و، گوتی: موسوڵمان دەبی و دینی خۆت و باب و باپیرانت جێدێڵی؟! جا لە شەیتان یاخی بو موسوڵمان بو، پاشان هات لەسەر ڕێگەی کۆچ کردن بۆی دانیشت و، گوتی: کۆچ دەکەی و زەوی و ئاسمانت جێدێڵی؟ کۆچەر وەکو ماهینی سەمەندۆك کراو وایە (کە بەپەتکێکی درێژ دەبەسترێتەوە، سەرێکی بەسنگێکەوە بەستراوەو سەرێکی بەقاچی ولاخەکەوەیە، تا بۆخۆی بگەڕێو بلەوڕێ، بەڵام نەڕوا)، جا لە شەیتان یاخی دەبێ و کۆچیش دەکا. ئەو جا لەسەر ڕێگەی جیهاد بۆی دادەنیشی و دەڵێ: جیهاد دەکەی خۆت و ماڵ وسامانت لەناو دەبەی، شەڕێ دەکەی و دەکوژرێی و ژنت مارە دەکرێتەوەو ماڵت بەش دەکرێ؟! جا لە شەیتان یاخی دەبێو جیهادێ دەکا. جا ئەوی وابکا مافی دەکەوتە سەر خودا تا بیباتە بەهەشت و، ئەگەر خنکا ماف دەکەوتە سەر خوا تابیباتە بەهەشت، ئەگەر چارەوێکەی هەڵیداو ملی شکاند، مافی دەکەوێتە سەر خوا بیباتە بەهەشت)).

بەڵگەی ڕاستی ئەمەش وا لە کتیبی خودایە کە لە شەیتانەوە دەیگێڕتەوە، کە بە پەروەردگاری بەرزی گوتوە: ﴿ قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ ۝ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ: جا بەوەی کە گومڕات کردم سەر ڕاستەڕێی تۆیان لێ دەگرم و لاڕێیان دەکەم، پاشان لەپێشەوەو لەپشتەوەو لەلای ڕاست و لەلای چەپیان بۆیان دەچم و، زۆرینەی ئەوانەش سوپاسگوزار نین ﴾ (سورة الأعراف ١٦-١٧).

له بابەت بێژەی (الصراط)یش پێشینەکان ڕای لێك نزیکیان هەس؛ ئیبنی عەبباس دەڵێ: بریتیە لە ئاینی ئاشکراو، ئیبنی مەسعود دەڵێ: کتێبی خودایە، جابیر دەڵێ: بریتیە لە ئیسلام و، موجاهید دەڵێ: بریتیە لە هەق.

جا شەیتان واز لە هیچ ڕێگەیەکی خێر ناهێنێ و لە هەمواندا کەمین دەگرێ و خەڵکیان لێ لادەدا.

## ٤- گەندەڵ کردنی تاعەتەکان:

ئەگەر شەیتان نەیکرا ڕێگەی تاعەتەکان بگرێ، هەوڵی تێکدان و گەندەڵکردنی پەرستش و تاعەتان دەدا، تاکو بەندە لە ڕێزانەو پاداشتەکان بێبەش کا، جارێك یەکێك لە هاوەڵان هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: شەیتان هاتۆتە نێوان من و نێوان نوێژو قورئان خوێندنەوەم، لێم تێکەڵ دەکا! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ذلك شيطان يقال له: خنزب، فأذا احسسته فتعوذ بالله منه، واتفل على يسارك ثلاثاً: ئەوە شەیتانێکە پێی دەڵێن: خینزیب، ئەگەر هەستت پێ کرد خۆت بەخوا پەنابگرە لێی و، سێ تفان لەلای چەپەت کە))، دەڵێ: جا منیش وەهام کردو، خودا لێمی دور خستەوە (رواه مسلم في صحيحه). ئەوجا کە بەندە دەست بە نوێژی دەکا، شەیتان دێ وەسوەسەی بۆ دەکاو لە تاعەتی خودا دەیخافڵێنێ و، کاروباری دنیای دەخاتەوە بیر، هەروەکو لە صەحیحی موسلیمدا هەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ان الشيطان إذا سمع النداء بالصلاة، أحال له ضراط، حتى لا يسمع صوته، فاذا سكت رجع فوسوس، فإذا سمع الاقامة، ذهب حتى لا يسمع صوته، فإذا سكت رجع فوسوس: شەیتان ئەگەر گوێی لە بانگی نوێژی بو، تڕان دەکەنێ، تا دەنگەکەی نەبیستێ، جا کە بێدەگ بو دەگەڕێتەوەو، وەسوەسە دەکات، جا ئەگەر گوێی لە قامەت بو، دەڕوا تا

دەنگەکەی نەبیستیٚ، کە بیٚدەگ بو دەگەڕیٚتەوەو وەسوەسە دەکات)) رواه مسند،
لە ریوایەتیٚکی تریشدا: ((فاذا قضى التثويب أقبل، حتى يخطر بين المرء ونفسه، يقـول
له: اذكر كذا، اذكر كذا، لما لم يكن يذكر من قبل حتى يظل الرجل ما يدري كم صلـى:
جا کە نویٚژی سونەتی کرد، شەیتان دیٚ تادەگاتە نیٚوان مرۆڤ و ناخی و پیٚی
دەڵیٚ: فلانە شت بیٚنەوە یاد، فلانە شت بیٚنەوە یاد، لەو شتانەی پیٚشتر لە بیری
نەبون، تا وا لە پیاوە دەکا نەزانیٚ چەند رکاتە نویٚژی کردوە)) (رواه البخـاري
ومسلم).

## هەرسەرپیٚچیکردنیٚك لە خودا تاعەتیٚکە بۆ شەیتان:

خودای بەرز دەفەرمویٚ: ﴿ إِنْ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ إِلاَّ إِنَاثًا وَإِنْ يَدْعُونَ إِلاَّ شَيْطَانًا مَرِيدًا۞ لَعَنَهُ اللَّهُ وَقَالَ لأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَفْرُوضًا: ئەوانە بیٚجگە لە خودا تەنیا کۆمەڵە بتیٚکی میٚینەو تەنیا شەیتانی بیٚ خیٚرو ویٚرانکەر بانگ دەکەن و دەپەرستن، خودا نەفرەتی لە شەیتان کردو ئەویش گوتی پشکیٚکی دیاریکراوی بەندەکانی تۆ دەکەمە بەندەی خۆم ﴾ (سورة النساء ١١٧-١١٨).

جا هەر کەسیٚك بیٚجگە لە خودا شتیٚك بپەرستی جا چ پەریکەریٚك یا بتیٚك بیٚ، یان رۆژو مانگ بیٚ، یا هەوەس و ئارەزو بیٚ، یان مرۆڤیٚك یا ریٚبیرو مەبدەئیٚك بیٚ، ئەوکەسە بیەویٚ یا نەیەویٚ شەیتان پەرستە، چونکی شەیتان فەرمان بە وان دەکاو ئارەزوی مرۆی بۆ دەبزویٚنیٚ و، هەر بۆیەشە ئەوانەی فریشتانیش دەپەرستن لە راستیدا شەیتان دەپەرستن، ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلائِكَةِ أَهَؤُلاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ۞ قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنْتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ بَلْ

كَانوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ: لەو ڕۆژەی هەموویان خڕ دەکاتەوە، پاشان بە فریشتان دەڵێ: ئایا ئەمانە پەرستشیان بۆ ئێوە دەکرد؟ گوتیان تۆ پاك و بێخەوشی و ، تەنیا تۆ پشتیوانی ئێمەی نەك ئەوان، بەڵکو جنۆکەیان دەپەرست، زۆربەیان بەوانە بڕوادار بون ﴾ (سورة السبأ ٤٠-٤١).

کەواتە فریشتە فەرمانیان بەوان نەداوە، بەڵکو جنۆکە فەرمان بەوانە دەکەن، تاببنە بەندەی ئەوان شەیتانان کە خۆیان بۆ رادەنوێنن، هەروەکو بتەکانیش شەیتانیان هەیە.

## بە پوختی:

ئەوەی بۆمان پوخت دەبێتەوە، ئەوەیە کە شەیتان فەرمان بە هەمو کارێکی خراپ دەکاو مرۆڤی بۆ دنە دەدا، ڕێ لە هەمو چاکەکاری و خێرێکیش دەگرێو ترسی دێختە ناو، تا مرۆڤ یەکەمیان ئەنجام بداو واز لە دوەمیان بێنێ، هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُمْ مَغْفِرَةً مِنْهُ وَفَضْلاً: لە کاتی بەخشیندا شەیتان ترسی تەنگ دەستیتان وەبەر دەنێو فەرمانی کاری ناشیاوتان پێدەدا، بەڵام خودا وادەی لێخۆشبون و زۆر بونی ماڵتان پێدەدا ﴾ (سورة البقرة/ ٢٦٨).

بە هەندێش لە هەژاری دەمانترسێنێ کە دەڵێ: ئەگەر ماڵی خۆتان ببەخشن هەژار دەبن، ئەو کارە ناشایستەی فەرمانیشمان پێ دەکا: هەمو کردەوەیەکی نەشیاوی پیسە لە ڕژدی و چروکی و لە زیناو تاوانی دیکە.

**٥- ئازاردانی جەستەیی و دەرونی:**

هەروەکو شەیتان دەیەوێ مرۆڤ بە کوفرو گوناهان گومڕاکا، دەیەوێ موسڵمانیش لە جەستەو لە دەرونەوە ئازار دا، جا ئێمە باس لەو ئازاردانانە دەکەین کە دەیانزانین:

**أ) هێرش کردنە سەر پێغەمبەر ﷺ:**

ئەو فەرمودە پیرۆزە دێتە پێشمان کە باس لەوەی دەکا شەیتان هێرش کردۆتە سەرو بلێسە ئاگرێکی هێناوە تاکو بۆ روی پێغەمبەر ﷺ بهاوێ.

**ب) خەونی خراپ لە شەیتانەوەیە:**

شەیتان توانای هەیە لە کاتی نوستندا خەونی ناخۆش بە مرۆڤ نیشاندا کە بێزاری بکاو دڵی تەنگ بکا، بە ئامانجی خەمبارکردن و ژان پێ گەیاندنی.

پێغەمبەر ﷺ پێی راگەیاندوین کە ئەو خەونانەی مرۆڤ لە کاتی نوستندا دەیانبینێ سێ جۆرن: خەونێك لە خوداوەیە، خەونێکیش دڵتەنگ کردنە لە شەیتانەوە، خەونێکیش ئاخافتنی دەرونە (صحيح الجامع ٣/١٨٤ –١٨٥)، هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((اذا رأى أحدكم الرؤيا يحبها، فإنما هي من الله، فليحمد الله عليها، وليحدث بها، وإذا رأى غير ذلك مما يكره، فإنما هي من الشيطان، فليستعذ بالله، ولا يذكرها لأحد، فإنها لاتضره: ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی خۆشی دیت، ئەوە لە خواوەیەوە باسوپاسگوزاری خوای لەسەر بکاو بیگێڕتەوە، بەڵام ئەگەر هی ناخۆشی دیت، ئەوە لە شەیتانەوە، با بە خودا پەنابگرێ و، بۆ کەسی باس نەکا، چونکە ئەمە چ زیانێکی پێناگەیەنێ)).

**ج ) سوتاندنی ماڵان:**

**ئەمەش بە هۆی هەندێك گیانلەبەرەوە دەبێ کە شەیتان بۆ ئەو کارەی دەنەیان دەدا، لەسونەنی ئەبو داود و صەحیحی ئیبنی حیباندا بە سەندێکی صەحیح هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((إذا نمتم فأطفئوا سرجكم، فإن الشيطان يدل مثل هذه (الفأرة) على هذا (السراج) فيحرقكم: **ئەگەر نوستن چراکانتان وەکوژێنن، چونکە شەیتان وەکو ئەو مشکە رێنمایی دەکا بۆ ئەو چرایەو دەتانسوتێنێ**)).

**د ) دەستوەشاندنی شەیتان لە مرۆڤ لە کاتی مردن:**

**پێغەمبەرﷺ هەمو جارێ خۆی پەنادەگرت لە هەندێ‌و دەیفەرمو:** ((اللهم اني أعوذ بك من التردي، والهدم، والغرق، والحرق، وأعوذ بك أن يتخبطني الشيطان عند الموت، وأعوذ بك أن أموت في سبيلك مدبراً، وأعوذ بك من الموت لديغاً: **خودایە، من خۆم پەنا دەگرم بە تۆ، لە هەڵدێران و، روخان و، خنکان و، سوتان و، لەوەش خۆم بە تۆ پەنا دەگرم کە شەیتان لە کاتی مردنێدا دەستم لێ بوەشێنێ، خۆشم بە تۆ پەنادەگرم لەوەی بە هەڵاتویی لە جیهادی رێی تۆدا بمرم و خۆشم بە تۆ پەنا دەگرم لەوەی کە بە مارانگازی بمرم**)) (رواه النسائي والحاكم بأسناد صحيح، (الصحيح الجامع ١/٤٠٥).

**ە ) ئازاردانی کۆرپە کاتێ لە دایك دەبێ:**

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((كل بني آدم يمسه الشيطان يوم ولدته أمه إلا مريم وابنها: **هەمو ئادەمیزادێك لەو رۆژی لە دایك دەبێ شەیتان دەستی لێ دەوەشێنێ، جگە لە مەریەم و کورەکەی**)) (رواه مسلم) (صحيح الجامع ٤/١٧١)، **لە**

صەحیحی بوخاریشدا هاتوە: ((كل بني آدم يطعن الشيطان في جنبيه بإصبعه حين يولد غير عيسى ابن مريم، ذهب يطعن، فطعن في الحجاب: لە کاتی لە دایك بونی هەر ئادەمیزادێك شەیتان پەنجەی لە هەردو تەرۆكی دەچەقێنیٚ، جگە لە عیسای کوڕی مەریەم چو پەنجەی تێبچەقێنیٚ، لە حیجابەکەی چەقاند)).

هەر لە بوخاریدا: ((ما من بني آدم مولود إلا يمسه الشيطان حين يولد، فيستهل صارخاً من مس الشيطان، غير مريم وابنها: هەر ئادەمیزادێك لە دایكبیٚ شەیتان دەستی لێدەوەشێنیٚ لە کاتی لەدایکبوندا، جا لەبەر دەست وەشاندنەکەی شەیتان دەست بەقیژەو هاوار دەکا، جگە لە مەریەم و کوڕەکەی)).

هۆی پاراستنی مەریم و کوڕکەی لە شەیتان، گیرابونی دوعاکەی دایکی مەریەمە لەلای خودا، کە مەریەم لە دایك دەبو: ﴿ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: خودایە مەریەم و زارۆکەکانی دەخەمە پەنای تۆ لە شەڕی شەیتان دوربن﴾ (سورة آل عمران/٣٦).

لەبەر ئەوەی دایکی مەریەم لە داواکەیدا راستگۆ بو، خودا دوعاکەی گیرا کردو بۆی جێبەجیٚ کردو، مەریەم و کوڕەکەی لە شەیتان پەنادا، هەروەها خودای گەورە عەمماری کوڕی یاسریشی پەنادا، هەروەکو لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە کە ئەبو دەرداء گوتی: ئایا ئەو کەسەتان لە نێودایە کە خودای گەروە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی لە شەیتان پەنایداو پاراستی، موغیرە گوتی: ئەوکەسەی خودا لە شەیتان پەنایدا لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی واتا عەممار.

**و ) نەخۆشی تاعون لە جنۆکانەوەیە :**

**پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە:** ((فناء أمتي بالطعن والطاعون، وخز أعدائكم من الجن، وفي كل شهادة: **تونابونی نەتەوەی من بە پێکان و تاعونە، کە بریتیە لە هەنگاوتنی جنۆکە دوژمنەکانتان و، لە هەردو بارانیشی شەهید بونە**)) رواه احمد والطبراني باسناد صحيح (صحيح الجامع ٤/٩٠).

**هەروەها لە موستەدرەکی حاکیمدا هاتوە:** ((الطاعون و خز أعدائكم من الجن، وهو لكم شهادة: **تاعون بریتیە لە هەنگاوتن لەلایەن جنۆکە دژمنەکانتانەوە، بۆ ئێوەش شەهید بونە**)).

**دەشبێ ئەوەی توشی ئەیوبی پێغەمبەری خودا هات بەهۆی جنۆکان بوبێ، هەروەك دەفەرمێ:** ﴿ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ: **یادی ئەیوبی بەندەی ئێمە بکەوە کاتێك هاواری لە پەروەردگاری خۆی کرد کە بەڕاستی شەیتان توشی بەڵاو رەنج و ئەشکەنجەو ئازاری کردوم** ﴾ (سورة ص/٤١).

**ز ) هەندێك نەخۆشی دیکە :**

**پێغەمبەرﷺ بە ئافرەتێکی فەرمو کە خوێنبەربونی بەردەوامی هەبو:** ((إنما هذه ركضة من ركضات الشيطان: **ئەوە هەر لەقەیەکە لە لەقەکانی شەیتان**)) رواه الأربعة باسناد حسن (صحيح الجامع ٣/١٩٦).

**ح ) بەشدار بونی لەگەڵ ئادەمییان لەخواردن و خواردنەوەو نشێنگەیان:**

**لەو ئەزیەت و ئازارانەی شەیتان بۆ مرۆڤی دێنێ ئەوەیە کە دەستدرێژی بۆ سەر خواردن و خواردنەوەی دەکاو تێیاندا بەشدار دەبێ و ، دەبێتە هاوبەش لە**

ماڵەکەی‌و تێیدا دەمێننەوە، ئەوەش هەمو لە کاتێکدا دەبێ کە بەندە پابەندی ڕێنوێنی خودا نەبێ، یان لە یادی خودا غافڵ بێ، بەڵام ئەگەر پابەند بو بەڕێنوێنی خودای بەرزو لە زیکرویادی خودا نەخافڵا، شەیتان چ رایەك نادۆزێتەوە تا دزەبکاتە نێو خانو و ماڵی، شەیتان تەنێ دەتوانێ لەو خواردنە بەشدار بێ کە یەکێك دەیخوا (بسم الله)ی لێ نەکردوە، بەڵام ئەگەر ناوی خوای لەسەر هات، لە شەیتانی حەرام دەبێ، موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە حوذەیفە دەگێڕتەوە، دەڵێ: ئەگەر ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئامادەی خواردنێك بوینایە، دەستمان بۆ نەدەبرد تا پێغەمبەر ﷺ دەستی بۆ درێژ دەکرد، جا جارێکی لەگەڵیدا لەسەر خواردنێك بوین، کەنیزەکێك هات وەك ئەوەی پاڵی پێوە بنێن، ویستی دەستی بخاتە نێو خۆراکەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرت، پاشان دەشتەکیەك هات وەکو پاڵی پێوەنێن، دەستی ئەویشی گرت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن الشيطان ليستحل الطعام أن لا يذكر اسم الله عليه، وإنه جاء بهذه الجارية ليستحل بها، فأخذت بيدها، فجاء بهذا الأعرابي ليستحل به، فأخذت بيده، والذي نفسي بيده ان يده في يدي مع يدها: شەیتان خواردنێکی لا حەڵاڵ دەبێ کە ناوی خوای لەسەر نەهێنرێ، جا ئەو کەنیزەکەی هێنا هەتا خۆراکەکەی پێ حەڵاڵ بکا، کە من دەستیم گرت، ئەو دەشتەکیەشی هێنا تا خۆراکەکەی پێ حەڵاڵ کا، من دەستی ئەویشم گرت، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئێستا وا دەستی شەیتانی دەگەڵ دەستی کەنیزەکە لە نێو دەستمدایە)).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ داوین کەماڵ و سامانمان لە شەیتان بپارێزین، بە داخستنی دەرگاکان و داپۆشینی دەفرەکان و ناوی خودا هێنان، چونکە ئەمە لە شەیتان پەنای دەدا، هەروەك دەفەرموێ: ((أغلقوا الأبواب، واذكروا أسم الله، فإن الشيطان لا يفتح باباً مغلقاً، وأوكوا قربكم، واذكروا أسم الله،

وخمروا آنيتكم، وأذكروا أسم الله، ولو تعرضوا عليها شـــيئاً، واطفئــوا مصـــابيحكم: دەرگەکان گاڵەدەن و نێوی خوای لەسەر بێنن، چونکە شەیتان دەرگەی داخراو ناکاتەوە، کوندەکانتـان گرێدەن و دەفرەکانتـان داپۆشن و، نـاوی خـودا بێنـن هەرچەندە کە شولێکیشی بەسەردا ڕانێن، چراکانیشتان وەکوژێنن)).

دیسان ئەگەر مرۆڤ بە دەستی چەپە خواردیو خواردیەوە شەیتان لەگەڵی دەخـوا، هـەروەها ئەگـەر بـەپێوە شـتێکی خـواردەوە، چونکـە لـە موسـنەدی ئەحمەد، لە عائیشەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((من أكل بشماله أكل معـــه الشيطان، ومن شرب بشماله شرب معه الشـــيطان: هـەر کەسێکی بەدەستی چەپە بخوا شەیتان دەگەڵی دەخواو، هەر کەسێکی بەدەستی چەپە بخواتەوە شەیتان لەگەڵی دەخواتەوە)).

هەر لە موسنەددا لە ئەبوهورەیرە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ پیاوێکی دیت بە پێوە دەیخواردەوە پێی فەرمو: (قـــە: بیهێنـەوە)، کابرا گوتـی بۆ؟ فـەرموی: (أيسرّك ان يشرب معك الهــرّ؟: پێـت خۆشە پیشیلە لەگەڵت بخواتـەوە؟) گوتـی: نەخێر، فەرموی: (فانه قد شرب معك من هو شرّ منـــه، الشـــيطان: دەبزانـە یـەکێك لەگــەڵی خواردیـــەوە زۆر لــە پشـیلە خــراپ و پیســترە، شــەیتان لەگــەڵی خواردیەوە). هـەتاوەکو شـەیتانەکانیش لـە ماڵـێ وەدەرنێـی؛ لـە بیرمەکـە کـە لەماڵی دایە زۆر ناوی خودا بێنی، پێغەمبەریش ﷺ ڕێنمونی کردوین بۆ ئەوە، دەفەرمێ: ((إذا دخل الرجل بيته فذكر اسم الله حين يدخل وحين يطعم، قال الشيطان لا مبيت لكم ولا عشاء هنا، وإن دخل ولم يذكر اسم الله عند دخوله قال: أدركتم المبيـــت، وإن لم يذكر اسم الله عند طعامه قال أدركتم المبيت والعشاء: ئەگـەر پیـاو چۆوە مـاڵی خۆی و لە کاتی وەژورکەوتن و نـان خـواردن نێـوی خـوای هێنـا شـەیتان دەڵـێ نەمانەوەی شەوێ و نەخواردنی شێوتان لێرە چنگ ناکەوێ، بەڵام ئەگـەر کابرا

وەژورکەوت ناوی خوادی نەهێنا شەیتان دەڵێ: شەومانەوەتان چنگ کەوت، ئەگەر لەسەر خواردنیش ناوی خوای نەهێنا دەڵێ: مانەوەی شەوی‌و خۆراکی شێوتان چنگ کەوت)).

**گ ) دەستوەشێنی شەیتان لە مرۆڤ ( پەرکەم ):**

ئیبنی‌تیمیە لە (مجموع الفتاوي ٢٧٦/٢٤) دا دەڵێ: (چونە ژورەوەی جنۆکە لە جەستەی مرۆڤ بەیەکدەنگی پێشەواکانی ئەهلی سونەتوجەماعەت سەلماوە، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ: کەسانێك کە سود دەخۆن، هەڵناستن، مەگەر وەکو کەسێکی شەیتان دەستی لێی وەشاندبێ و نەتوانێ خۆی راگرێ ﴾ (سورة البقرة/٢٧٥).

لە صەحیحیشدا لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە: ((إن الشيطان يجرى من ابن آدم مجرى الدم: شەیتان بەپاڕەوی خوێنی ئادەمی‌دا دەڕوا)).

وەعەبدوڵڵای کوڕی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: (بەبابم گوت: خەڵکانێك هەن دەڵێن: جنۆکە ناچێتە ناو لەشی خودار، گوتی: کوڕەکەم درۆ دەکەن، ئەوە جنۆکە لەسەر زاری وی قسان دەکا).

ئیبنی تەیمیە دەڵێ: (ئەوەی ئیمام گوتویەتی بەناوبانگە، جنۆکە پیاو توشی فێ دەکاو جا بەزمانێك قسان دەکا ماناکەی نازانرێ، جاروەیە هەند خراپی لە جەستەی دەدرێ، ئەگەر لە حوشترێك بدرێ کاریگەریەکی زۆری دەبێ، لەگەڵ ئەوەش فێدارەکە هەست بەلێدانەکە ناکاو، ئاگاشی لە خۆی نیە چ دەڵێ، وا دەبێ جنۆکەکە فێدارەکە یان کەسێکی دی رادەکێشێ یا ئەو رایەخە رادەکێشێ کە لەسەری دانیشتوەو، ئامێرەکان دەگوڕێ... وکرداری

دیکەی واش ئەنجام دەدا کە هەر کەسێك بیانبینێ چاك دەزانێ ئەوەی ئەسەرزاری ئەو مرۆیە قسان دەکاو ئەو تەنانە دەجولێنێ رەگەزێکی دیکەی لە مرۆڤ جیاوازە.

دیسان ئیبنی تەیمیە دەڵێ: (کەسیش نیە لە پێشەواکانی موسڵمانان باوەڕی بەوە نەبێ کە جنۆکە دەچنە لاشەی فێدار و غەیری فێداریش، هەرکەسێکی باوەڕیشی بەوەی نەبێ و بڵێ شەرع ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە، ئەوکەسە درۆی بە شەرع هەڵبەستاوەو، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی نیە کە ئەوە رەت کاتەوە).

هەروەها لە (مجموع الفتاوي ١٢/١٩)دا دەڵێ: ئەوانەی کە باوەڕیان وانیە جنۆکە دەچنە لاشەی پەرکەمداران، کۆمەڵیکن لە موعتەزیلەکان وەکو ئەلجەبائی و ئەبوبەکری رازی، هەوڵیش دەدین تیشکێکی زیاتر بخەینە سەر ئەم باسە لە بەندي پێنجەمدا.

# سەرکردەی جەنگی

ئبیلیس بە خۆی پیلانڕێژو سەرکردەی جەنگیە دەگەڵ مرۆزادان. هەر لە بنکەی خۆیڕا نێردەو تیپان بە ئاڕاستەی جیا جیادا دەنێرێ و، کۆڕو کۆبونەوان گرێ دەداو گفتوگۆ لەگەڵ سەربازو سوپاکانی خۆی دەکاو لەبارەی ئەو کارانەی ئەنجامیان داوەو، ئەوان ستایش دەکا کە چاکیان زانیوە خەڵکی گومڕاو وێل بکەن، ئیمام موسلیم لە صەحیحەکەی دا لە جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((إن الشيطان يضع عرشه على الماء، ثم يبعث سراياه في الناس، فأقربهم عنده مترلة أعظمهم عنده فتنة، يجيء أحدهم فيقول: ما زلت بفلان حتى تركته وهو يقول كذا وكذا، فيقول إبليس: لا والله ما صنعت شيئاً، ويجيء أحدهم فيقول: ماتركته حتى فرقت بينه وبين أهله، قال: فيقربه ويدنيه، ويقول: نعم أنت: شەیتان عەرشی خۆی لەسەر ئاوێ دادەنێ، ئەوجا تیپەکانی خۆی بە نێو خەڵکیدا دەنێرێ، نێزکترین دەست و پێوەند لە خۆی، ئەوەیانە کە ئاشوبی زۆرتر بێ، یەکێکیان دێت و دەڵێ: هەر خەریکی فلانەکەس بوم تاوام لێکرد واو وا بڵێ، ئیبلیس دەڵێ: نا واللە هیچت نەکردوە، یەکێکی دیکەیان دێ و دەڵێ: لێی نەگەڕام هەتا جودابیم لە نێوان وی و خانەوادەی ساز کرد، دەڵێ: جا لە خۆی نێزیکی دەکاتەوەو، دەڵێ : بەڵێ تۆ..)) هەروەها لە موسنەدی ئیمام ئەحمەد هاتوە، پێغەمبەر ﷺ بە ئیبنی صائیدی (پێغەمبەر ﷺ گومانی پێ دەبرد کە دەجال بێ) فەرمو: (ماتری: چ دەبینی)؟ گوتی: عەرشێك دەبینم لەسەر دەریایەو ماری لە چواردەورن، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموی: (صدق ذاك عرش ابليس: ڕاست دەکا ئەوە عەرشی ئیبلیسە).

جا شەیتان شارەزایی و لێزانیەکی زۆری لە بواری گومڕاکردن هەیە، هەر بۆیە دەزانێ چۆن پیلانەکانی دارێژێ و، تەڵە و داو و تۆڕکانی دابنێتەوە، چونکە هەر لەو ساتەوە لە ژیاندایەو بەگومڕاکردن خەریکە، کە مرۆڤی تێدا هاتۆتە بون هەتا ئەمڕۆو تا رۆژی دواییش هەر دەمێنێ: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ۝ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ۝ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ: گوتی: پەروەردگارم، تا رۆژی ژینەوە بەزندویی رامگرە و مۆڵەتم بدە، فەرموی: جا بە راستی تۆ لە مۆڵەت دراوانی، تا رۆژێك کە کاتی دیاریکراوە ﴾ (سورة الحجر/٣٦-٣٨)..

وە شەیتان زۆر سورە لەسەر ئەنجامدانی ئەو خراپەکاریانەی خۆی بۆ تەرخان کردوە، نەماندی دەبێ نەبێزار، لە فەرمودەشدا هاتوە: ((إن الشيطان قال: وعزتك وجلالك لا أبرح أغوي عبادك ما دامت أرواحهم في أجسادهم، فقال الرب: وعزتي وجلالي لا أزال أغفر لهم ما أستغفروني: شەیتان دەڵێ: خودایە سویند بە بڵندی و شکۆی تۆ هەر خەریکی فریودانی بەندەکانی تۆ دەبم تا گیانیان لە جەستان دامابێ، پەروەردەگار فەرموی: سویند بە بڵندی و شکۆی من هەر لێیان خۆش دەبم، تا داوای لێخۆشبونم لێ بکەن)) رواه أحمد والحاكم باسناد حسن(صحيح الجامع ٢/٧٢).

## سەربازەکانی:

شەیتان دو کۆمەڵە سەربازی هەن: کۆمەڵێکیان لە جنۆکانن وکۆمەڵێك لە مرۆڤ.

## سەربازەکانی لە جنۆکان:

شەیتان سەربازو یاریدەدەری جنۆکەی هەن لە پێشدا باسی ئەو فەرمودەمان کرد لە هەناردنی تیپی جنۆکان لە لایەن شەیتانەوە دەدوێ، لە قورئانیش دا هاتوە: ﴿ وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ

وَرَجِلِكَ: هەر كەس لەوانەی كە دەتوانی بە دەنگی خۆت دەنەیان بدەو بەرگریان لێبكەو بە لەشكری سوارەو پیادەت بنێرە سەریان ﴾ (سورة الاسراء/٦٤).

جا شەیتان سەربازی هەن و بە سواری و بە پیادەیی هێرش دێنن، بۆ سەر بەندەكانیان دەنیرێ تا بەرەو خراپەكاری بیانجمێنن ﴿ أَلَمْ تَرَى أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا: ئەدی نەت دیت كە ئێمە شەیتانەكانمان ناردە سەر كافران تا رایان تلەكێنن ﴾ (سورة مريم/٨٣).

**هەر مرۆڤێك هاودەمێكی لە جنۆكان هەیە:**

هەمو مرۆڤێك شەیتانێك هاودەمی دەكاو لێی دانابڕێ، هەروەكو لە فەرمودەكەی عائیشەدا هاتوە لەلای موسلیم، كە دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ بەشەوێ لە لای من چوە دەرێ، منیش ئێرەییم پێ برد، كە هاتەوە دیتی چ دەكەم، فەرموی: (اغرت!: ئایا ئێرەییت پێ بردم!) گوتم: جا چۆن یەكێكی وەكو من ئێرەیی بە یەكێكی وەك تۆ نابا! فەرموی: ((أقد جاءك شيطانك؟: ئایا شەیتانەكەت هاتۆتە لات؟)) گوتم: بۆ ئەی پێغەمبەری خوا من شەیتانێكم لەگەڵە؟! فەرموی: (نعم: بەڵێ)، گوتم: هەمو مرۆڤێكیش شەیتانێكی لەگەڵە؟ فەرموی: (نعم: بەڵێ)، گوتم: لەگەڵ تۆش دا هەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: (((نعم ولكن ربي اعانني عليه حتى اسلم: بەڵێ، بەڵام پەروەردەگارم یاریدەی دام بەسەریدا تا موسڵمان بو)).

هەروەها موسلیم و ئیمام ئەحمەد لەعەبدوڵلاوە دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((مامنكم من احد إلا وقد وكل به قرينه من الجن، وقرينه من الملائكة قالوا: وإياك يا رسول الله؟ قال: وإياي لكن الله أعانني عليه فأسلم فلا يأمرني إلا بخير: هەر یەكێك لە ئێوە ئەسپاردەی هاودەمێك لە جنۆكان و هاودەمێك لە

فریشتان کراوە، گوتیان: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: تەنانەت منیش، بەڵام خودا یاریدەی دام بەسەریدا تا موسڵمان بو، بە کاری چاك نەبێ فەرمانم پێناکا)).

لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتوە: ﴿ وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَانِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ: هەر کەس لە یادی خودا رو بسورێنێ شەیتانێکی بۆ دەنێرین کە هەمیشە لەگەڵیدا بێ ﴾ (سورة الزخرف/٣٦)، هەروەها لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُمْ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ: جۆرە هاودەمێکمان بۆ ئەوانە داناوە جا کردەوەی بەدی بەردەم و پشت سەریان بۆ رازاندنەوە ﴾ (سورة فصلت/٢٥).

### مرۆڤە پشتیوانەکانی:

شەیتان سەرسەختترین دوژمنی مرۆڤەو هەوڵی بەهیلاك چونی دەدا، لەگەڵ هەندێشدا زۆربەی خەڵکی بە پشتیوانیان گرتوەو، شوێن پێی هەڵدەگرن و بیری وی پەسەند دەکەن، جا چەند ناچیزو نابەجێیە کە مرۆڤێکی ژێر دژمنی خۆی بە دۆست و پشتیوان بگرێ ﴿ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلاً: ئایا شەیتان و زارۆکانی لەباتی من دەکەنە پشتیوانی خۆتان، کەچی دوژمنی ئێوەن؟ چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران ﴾ (سورة الکهف/٥٠).

جا ئەوانەی شەیتان دەکەنە دۆست و پشتیوان زەرەرمەندو ماڵوێرانن: ﴿ وَمَنْ يَتَّخِذْ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُبِينًا: هەر کەسێك لە باتی

باتی خودا شەیتان بکاتە دۆست و پشتی پێ ببەستێ، بەراستی زیانێکی ئاشکرای کردوە ﴾ (سورة النساء/١١٩).

بۆیەکەش زیانبارو زەرەرمەندن چونکە شەیتان ناخ و دەرونیان گەندەڵ و گەنی دەکاو، لە نیعمەتی رێنوێنی بێبەشیان دەکات و، لە گومڕایی‌و وێڵی‌و سەرگەردانییان دەهاوێ: ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: ئەو کەسانەی بێبڕوان یارو هاودەمی ئەوان تاغوتە، ئەوان لە روناکیەوە دەبەنە تاریکی. ئەوانە ئەهلی ئاگرن و تا هەتایێ لەنێو ئاگردا دەمێننەوە ﴾ (سورة البقرة/٢٥٧).

لەبەر ئەوەش توشی زیان و دۆڕانێ هاتون، چونکە لە رۆژی دواییدا شەیتان بەرەو جەهەننەم رایاندەکێشی‌و دەیانهاژوا؛ ﴿ إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ: کۆمەڵی خۆی بانگ دەکا تا ببنە هاوەڵی ئاگری بەتین ﴾ (سورة فاطر/٦)، هەروەها ئەوانەی دەبنە دۆست و پشتیوانی شەیتان، بەکەیفی خۆی رام و دەستەمۆیان دەکاو دەیانکاتە سەربازی دەست لەسەر سنگ و پیلان و ئامانجەکانی بەوان جێبەجێ دەکات.

**تەڵەکەو شەرمەزارکردنی بۆ دۆستانی خۆی:**

زۆر لە خەڵکی دۆستایەتی شەیتانی دەکەن، بەڵام ئەو تەڵەو داویان بۆ دەنێتەوەو، بەوان رێیانیاندا دەبا کە تێیدا دەفەوتێن و بەهیلاك دەچن، ئەوجا دەستیان لێ بەردەداو تیزو گاڵتەیان پێدەکاو پێیان پێدەکەنی. فەرمانیان پێدەکا خەڵکی بکوژن و دزی بکەن و زینا بکەن، ئەوجا ئاشکرایان دەکاو ئابڕویان دەبا، هەرواشی لە موشریکەکان کرد لە شەڕی بەدردا، کاتێك بە

**وێنـەی سـوراقەی کوڕی مالیك هاتە لایان و وادەو بەڵێنی سـەرکـەوتنی دانیٚ ﴿ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنْ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ: گوتـی: ئـەمڕۆ هیـچ کـەس بەسەرتاندا زاڵ نیەو من پشتیوانی ئێوەم ﴾** (ســـورة الأنفـــال/٤٨)، **جا پاشان کە فریشـتەی دیـتن بـۆ سەرخسـتنی بـاوەڕداران دابـەزین، پێـی بـە غـاریٚ وەنـاو دەستبەرداری وان بـو و تەسلیمی کردن، هـەروەك حەسسـانی کـوڕی سـابیت دەڵیٚ:**

ولاّهم بغُرورٍ ثم اسلمهم
ان الخبيث لمن والاه غرّارُ

**واتە: بەغروری دۆستایەتی کردن و دوایی بە دەستەوەی دان هەمو پیسێك ئەوان فریودەدا کە دۆستایەتی دەکەن و پشتی پیٚ دەبەستن.. هەر ئاواشی لەو راهیبە کرد کە ژنەکەو کۆرپەکـەی کوشـت، پێشـتر فـەرمانی زینـای پـیٚکرد، ئەوجا کوشتن، پاشان کـەس و کـاری ژنـەی لیٚ ئاگـادار کـردەوەو کارەکـەی لیٚ سپی کردەوە، ئینجا فـەرمانی پیٚکرد سوژدەی بۆ ببـا، کـە ئەمەشـی پێکـرد بەخۆی هەڵات و بەجێی هێشت، هەروەك بە درێژی باسی دەکەین.**

**لـە رۆژی قیامەتیشـدا پـاش ئـەوەی بـەخۆی و بـە دۆسـتەکانی دەچنــە دۆزەخیٚ، پێیان دەڵیٚ: ﴿ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِي مِنْ قَبْلُ: من سـەبارەت بـەوە بێزارو بێبڕوام کەپێشتر ئێوە بەمن موشریك بون ﴾** (ســورة ابراهیــم/٢٢)، **توشی تـاڵیو ناخۆشـترین چـارەنوس و سـەرەنجامی کـردن و پاشـان تـەواو پشـتی تێکردن و خۆی لیٚ نەکردنە ساحێب.**

**سەرهاتی ئەو کەسیش دێنینـەوە کـە وا بانگەشـە دەکا زانایـەکی روحانیـە، چـۆن شـەیتانەکان پشـتی تـیٚ دەکـەن پـاش ئـەوەی نـاو شـۆرەتێکی گـەروە وەدەست دێنیٚ و لە ئەنجامدا وێڵ و سەرگەردان و زەبون دەبیٚ و نازانی چ بکا.**

**شەیتان دۆستانی خۆی بۆ راژەی خۆی و جەنگی بڕواداران دەرەخسێنێ:**

خەڵکی دو دەستەن: دۆستانی خوداو، دۆستانی شەیتان، دۆستەکانی شەیتانیش، هەمو کافرانن بە جیاوازی رەگەزو بنەچەیان ﴿إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ: ئێمە شەیتانەکانمان تەنها کردۆتە دۆست و خۆشەویست بۆ کەسانێکی کە بڕوا ناهێنن﴾ (سورة الأعراف/٢٧)، جا شەیتان ئەمان دەرەخسێنێ بۆ گومڕاکردنی بڕواداران بە نانەوەی گومان و سەر لێشێواوی لە نێویاندا؛ ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ: شەیتانەکان بەدزی مەبەستی خۆیان بە دۆستەکانیان دەگەیەنن تا لەگەڵ ئێوە مشتومڕ بکەن، ئەگەر پەیرەوەیان بکەن، ئێوەش موشریکن﴾ (سورة الأنعام/١٢١).
ئەو گومان و وێچونانەی رۆژهەلاتچی و خاچپەرست و جولەکەو بێدینەکانیش دەیانهێننە گۆڕی هەر لەم بابەتەن.

هەروەها شەیتان دنەی پێڕی خۆی دەدا تا لەبواری دەرونیەوە ئازاری خاوەن باوەڕان بدەن ﴿إِنَّمَا النَّجْوَى مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا: بەڕاستی سرتەکردن لە شەیتانە تاکو بڕواداران خەمگین کا﴾ (سورة المجادلة/١٠)، وەکو هاوبەشکارەکانی هان دەدا کە موسڵمانەکان لێیان نێزیك دەبون لەنێو خۆدا چرپەچرپێ بکەن، تاکو موسڵمانەکە وای زانیبا تەگبیری لێدەکەن.

بە هێندەش ناوەستێ بەڵکو بۆ جەنگی موسلمانان پاڵیان دەنێ ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا: کەسانێکی کە بڕوایان هێناوە لەرێگەی خوادا

**دەجەنگن و، بیٚباوەڕان لەرێگەی تاغوتدا دەجەنگن، جا لەگەڵ دۆست و یارانی شەیتاندا بجەنگن، بەراستی فڕو فێڵی شەیتان کزو لاوازە ﴾** (سورة النساء/٧٦).

**بەبەردەوامیش دۆستەکانی خۆی دەترسێنێ** ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ: **ئەمە تەنیا شەیتانە کە دۆستان و پەیڕەوانی خۆی دەترسێنێ، جا ئەگەر بڕواتان هەیە لەوان مەترسن و لە من بترسن ﴾** (سورة آل عمران/١٧٥).

**دیارە دۆستانی شەیتانیش کۆمەڵێکی زۆرن** ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ: **شەیتان لە بابەت ئەوانەوە گومانی خۆی جێبەجێ کرد، جا لە کۆمەڵێکی بڕواداران بترازێ ئەوان هەمو شوێن شەیتان کەوتن ﴾**
(سورة سبأ/٢٠).

## شێوازەکانی شەیتان بۆ گومڕاکردنی ئینسان

ئاشکرایە شەیتان نایەتە لای مرۆڤ و پێی بڵێ: واز لەو کارە چاکانە بێنەو، ئەو کارە خراپانە بکە بۆ ئەوەی لە دونیاو قیامەتدا هەشت بەسەر بێ، چونکە ئەگەر بەم شێوەیە بێ، کەس گوێی ناداتێ، بەڵام ئەو زۆر شێواز و ڕێگە دەگرێتە بەر کە بەندەکانی خودای پێ هەڵخەڵەتێنێ.

١- ڕازاندنەوەی ناڕەوا:

ئەمە ڕێبازێکە هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستا شەیتان بۆ گومڕاکردنی بەندان دەیگرێتە بەر، جا بەرگی هەق لەبەر ناهەق دەکاو، هەق بە ناهەق پیشان دەداو، بەردەوام خەریکی مرۆڤ دەبێ‌و کاری ناڕەوای لەبەر دڵی شیرین دەکاو ڕەوای لەبەر چاوان تاڵ دەکا، هەتا وای لێدێ دەست بە خراپەکاری دەکاو پشت لە هەق و هەقخوازی دەکا، هەروەکو پێشتریش ئەو نەفرەت لێکراوە بە پەروەردگاری مەزنی گوتبو: ﴿ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ: پەروەردگارم بەوەی گومڕات کردم ئەوەیان بۆ دەڕازێنمەوە کە لە زەویدا هەیەو هەمویان فریودەدەم و گومڕایان دەکەم بێجگە لە بەندە پاك و دڵڕاستەکانی تۆ ﴾ (سورة الحجر/٣٩-٤٠).

ئیبنیلقەییم لە (اغاثة اللهفان ١/١٣٠)دا لەم بارەیەوە دەڵێ: (لە تەڵەو داوەکانی شەیتان ئەوەیە کە بەردەوام ئەفسون لە هۆش دەکا تا دەداوێی دەخاو، تەنها ئەوانەش لە ئەفسونی وی ساغلەم دەردەچن کە خودا ویستی لەسەرە، جا کاری زیانبەخش وا دەڕازێنێتەوە کابرا وای بە خەیاڵاندا بێ بەسودترین کارە، پڕ سودترین کاریش وا بێزراو دەکا، تا وا تێدەگا زیانی پێ دەگەیەنێ.

لا الـه الا الله، چـەند كەسـی بـەم ئەفسـونەی تـوش كـردوەو، چـەند جودايـی خستۆتە نێوان دڵان ونێوان ئیسلام و باوەڕو چاكەكاری! چەندین جار ناڕەوای لـە وێنەیـەكی جـوان و شـیرین بەرجەسـتە كـردوەو، گەلـەك جـارانیش هــەقی قێزەون كـردوەو وێنــەی تێـك شـێواندوە، هــەر شــەیتان ئەفسـونی لـە هۆشـان كردوەو هۆشمـەندانی لـە ئارەزو و تۆڕە ڕێچكەی تێكچـڕژاو خسـتوەو، هــەمو ڕێگایەكی گومڕایـی پـێ تـەی كـردون، هـەمو جارێك بەسـەر وێرانییـدا بـردون، پەرستنی بتانی بۆ وان ڕازاندۆتـەوە، هاموشۆی لـەلا پچڕاندون، كیژۆڵـەی پـێ لەخاك ناون، نیكاحی دایكانی بەچاك داناوە، لەگەڵ كوفرو لـەدین دەرچـون و تاوان و یاخیبون وادەی بەهەشتێی پـێ داون، بـە مـەزنترین شـێوە شیركی پـێ نیشان داون، باوەڕ نەبون بە سیفەتەكانی پەروەردگاری بەرزو بەرزێتی خوداو گوفتاری لە كتێبـەكانیدا بە پاكیگاری داناوە، وازهێنـان لـە فـەرمان بـە چاكـەو ناكردن لە خراپـەی خسـتۆتە قالبی گونجان و ڕەفتاری چاك لەگـەڵ خـەڵكی و مانـای ئـایـەتـی ﴿ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ: ئـاگـاتـان لەخۆتـان بێ ﴾ (سورة المـــائدة/١٠٥)، هەروەها پشتكردنە سونەتی پێغەمبەری ﷺ خستۆتە قالبی تەقلیدو، ڕازی بون بەقسەی كەسانێكی لەمان زاناتر، دەغەڵیو مادەلایی كردنیشـی لـە دینـی خـوا لە چوارچێوەی عەقلی بەڕێوەچون و ژیان داناوە كە بەندەی پـێ دەچێتـە نـاو خەڵكی.

بەم شێوەیە ئیبلیسی نەفرەت لێكراو ئادەم ﷺ ی لـە داوێ خسـت كـاتێك خواردنی ئەو دارەی بۆ ڕازاندەوە كە خودا لێی حەرام كردبو، هەر خـەریكی بـو دەیگوت ئـەم دارە داری نەمریـەو هـەرچی لێـی بخـوا لـە بەهەشـتێدا بـە نـەمری دەمێنێتەوە یا دەبێتە فریشتە، تاوەكو ئادەم ﷺ بەگوێی كردو، سەرەنجام لـە بەهەشتێ چوە دەرێ.

ئەمڕۆش سەیری دۆستەکانی شەیتان بکە چۆن هەمان ڕێگا بەکاردێنن لە گومڕاکردنی بەندان.

ئەوە بانگەشەی کۆمۆنیزم و سوسیالیزمە.. وا لە خەڵکی دەگەیەنن هەر تەنێ ئەم ڕاڕەوانە مرۆڤایەتی لەسەرگەردانی و دڵەڕاوکێو ونبون و برسێتی ڕزگار دەکەن... لەولاوەش ئەو بانگەوازانەی بەناوی ئازادیەوە داوا لە ژنان دەکەن بە پۆشتەڕوتی بچنە دەرێ و، بانگەشە بۆ نواندن و تەمسیلکاری دەکا کە ڕەوشت و ناموسی تێدا پێخوست دەکرێ و بە ناوی هونەرەوە سنورە حەرامەکانی تێدا دەبەزێ.

هەروەها ئەو بیرۆکە ژاراویانەی داوا دەکەن خەڵکی ماڵ و سامانیان لە بانکە سوخۆرەکان دابنێن بۆ وەدەست هێنانی قازانج لە ژێر ناوی گەشەپێدان و سودی فرە، هەروا ئەو بانگەوازانەی کە دەستگرتن بە دین بە کۆنەپەرستیو ویشکیو دواکەوتن دادەنێن و، ئەوانەی بانگبەرانی ئیسلام بەشێت و بەنۆکەرانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات ناوزەد دەکەن...تاد.

ئەمانە هەموی درێژ بونەوەی هەمان ڕێبازی شەیتانن کە لە زوەوە ئادەمی پێ خەڵەتاندوە وە بریتیە لە جوان نیشان دان و ڕازاندنەوەی ناهەق و، ناشیرین و ناچیزکردنی هەق بۆ خەڵکی ﴿ تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ: سوێند بە خودا پەیامبەرانمان بۆ ئومەتەکانی پێش تۆش ڕەوان کردوەو، بەڵام شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندنەوە ﴾ (سورة النحل/٦٣).

سوێند بە خودا، ئەمەش ڕێبازێکی ترکزەو بیمناکە، چونکە ئەگە ناڕەوا لەبەر چاوی مرۆڤ ڕازێنراوە تاکو بەجوانی تێدەگا، دیارە لەو کاتەدا بە هەمو هێزی خۆی تەقەلا دەدا ئەوەی پێی حەقە جێبەجێی بکا، جا ئەگەر سەریشی

لەپێناو دانیٚ: ﴿ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً۞ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا : ئایا لە زیانکارترین خەڵك ئاگادارتان بکەم، کێن؟ کەسانێکن کە تێکۆشانی دنیایان بە فیڕۆ چوەو، بەو ڕەنگەش هەر پێیان وایە کاری چاك ئەنجام دەدەن ﴾ (سورة الكهف/١٠٣-١٠٤)، جا ئەوانە ڕێ لە خەڵکیش دەگرن دینی خودا بگرێو لەدژی دۆستانی خوداش دەجەنگێن، واش تێدەگەن کە هەر بەخۆیان لەسەر هەقن ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ: وە شەیتانەکان ئەم دەستەیە لە ڕێگەی خوا دەگێڕنەوە، لە کاتێکدا لایان وایە هەر ئەوان ڕێنوێن بوینە ﴾ (سورة الزخرف/٣٧).

ئەمەش ئەو هۆیەیە کەوای لە کافران و بێبڕوایان کردوە دونیا بە چاکتر تێبگەن و پشت لە ڕۆژی دوایی بکەن، هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُمْ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ: جۆرە هاودەمێکمان بۆ ئەوانە داناوە جا کردەوەی خراپی بەردەم و پشت سەریان بۆ ڕازاندنەوە ﴾ (سورة فصلت/٢٥)، هاودەمەکانیش بریتین لە شەیتانەکان، کاروباری بەردەست و بەرچاوی دونیایان بۆ دەڕازێننەوە تا بەپێشی دەخەن و، بانگیان دەکەن بۆ وەدرۆ خستنەوەی ڕۆژی دوایی‌و ئەمەشیان بۆیان ڕازاندۆتەوە هەتا وایان لێهاتوە باوەڕ بە ژیانەوەو لێپرسینەوەو بەهەشت و دۆزەخیش ناکەن و ڕەتیان دەکەنەوە.

## ناونانی کاروباری حەرام بە ناوی خۆش و شیرین:

یەکێکی دیکە لە هەڵفریواندنەکانی شەیتان ڕازاندنەوەی ناهەقە بۆ مرۆڤ و ناوبردنی کاروباری حەرام و تاوان و یاخی بونە بەناوی خۆش و لەدڵدا

شیرین، بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤ و هەڵگێڕانەوەی هەقیقەت، هەروەکو ناوی لە درەختە حەرامەکەی بەهەشتێ نا؛ دەرختی نەمری ، هەتاکو خواردنەکەی بۆ ئادەم برازێنێتەوە: ﴿ قَالَ يَاآدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَ يَبْلَى: گوتی؛ ئادەم، ئایا درەختی نەمریو موڵکی لەبن نەهاتوت پێ نیشاندەم ﴾ .

ئیبنیقەییم دەڵێ: (شوێنکەوتوانی خۆی وا راهێناوە کە شتە حەرام و ناچیزەکان بە نێوی خۆش و لە دڵ شیرین ناوبنێن، جا ناویان لە شەڕاب و مەی ناوە: (دایکی شادی) یان (خواردنەوەی گیان) و، قوماریشیان ناوناوە (پاروی هەسانەوە)، سو خۆرییان بە مامەڵە ناوبردوەو باجی دەرامەت بە مافەکانی دەوڵەت ناوزەد دەکەن..

ئەمڕۆش سوخۆری بە قازانج وسود ناودەبەن و، سەماوگۆرانیو نواندن و پەیکەرتاشیش بە هونەر.

**٢- زیادمڕۆییو بەزایەدان:**

ئیبنیقەییم لە (الوابل الصیب ص١٩)دا لەم بابەتە دەڵێ: (خودای بەرز هەر فەرمانێك دەربکا شەیتان دو سیفەتی تێدا هەیە: یان کورتبڕی و بەزایەدان، یان بەتانچون و توندگیری، هیچ گوێش ناداتێ بەندە کامیان لەو دو گوناهە لێ هەڵبژێرێ، دێتە لای دڵی بەندەو بۆنی دەکاو بەسەری دەکاتەوە، ئەگەر دیتی ساردبونەوەو سستی کردنی تێدایە لەم لایەنە بۆی دەچێ و ساردی دەکاو دایدەکەسێنێ و، توشی تەمبەڵیو تەوەزەلی دەکاو، دەرگای تەئویف و تکاو شتی دیکە دەکاتەوە، تەنانەت رەنگە بەندە واز لە هەمو فەرمانبەریەکان بێنێ.

ئەگەر دیتی ئاگای لە خۆیەو بە جۆش و خرۆشە و قۆڵی هەڵماڵیوە، لێی بێهیوا دەبی کە لەم دەرگایەوە بۆی بچێ، فەرمانی پێ دەکا زێدە لە پێویست

به کۆشین خەریك بێو، وای گومڕا دەکا که هێندەت بەس نیەو توانای تۆ لەمە زێترەو، دەبێ لەخەڵکی چاکەکار پتر هەوڵ دەیو ئەگەر ئەوان راکشان تۆ نابێ پاڵ دەیەوەو، ئەگەر ئەوان رۆژییان شکاند تۆ هەردەبی بەڕۆژو بی، ئەگەر ئەوان سارد بونەوە تۆ بەردەوام بی، ئەگەر یەکێك سێ جار دەست و چاوی شوشت، ئەتو حەفت جاران بیانشۆی، ئەگەر دەستنوێژی بۆ نوێژێ شوشت، تۆ خۆت بەتەواوی بشۆ، هەروا کاروباری هاوشێوەی دیکە لە زیادەڕۆیی و بەقوڵدا چون، جا توشی توندگیریو لەسنور تێپەڕینی دەکاو لە راستەڕێگا لای دەدا، هەروەکو ئەوەی یەکەمی توشی کورتبڕی و بەزایەدان کرد، لەگەڵ هەردو پیاوانیشدا مەبەستی شەیتان هەرئەوەیە لە ڕێ دەریانکاو نەیەڵێ یەکەمیان لێ نێزیك ببێتەوەو ئەمەشیان وا لێبکا سنور بەزێنی تێدا بکاو لێی تێپەڕێنی، خەڵکێکی زۆریش بەمە بەهیلاك چون و تەنها بەزانستی قوڵ مرۆڤ لەمە رزگاری دەبێ، لەگەڵ بونی باوەڕێکی چەسپاو هێزی بەگژداچونەوەو میانەگیری و یاریدەش لە خواوەیە.

## ٣- ساردکردنەوەی بەندەکان لە کردەوەو گنخان و تەمبەڵ کردنیان:

بۆ ئەمە شێوازی جیاجیای هەن: لە صەحیحی بوخاریدا لە ئەبوهورەیرە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((يعقد الشيطان على قافية رأس أحدكم إذا هو نام ثلاثة عقد، يضرب كل عقدة مكانها، عليك ليل طويل فارقد، فإن استيقظ فذكر الله انحلت عقدة، فإن توضأ انحلت عقدة، فإن صلى انحلت عقده كلها، فأصبح نشيطاً طيب النفس، وإلا أصبح خبيث النفس كسلان: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوست شەیتان سێ گرێی لە پشت سەری لێدەدا، هەر گرێیەك لە شوێن خۆی گیردەکا، شەوێکی درێژت لەپێشە جا پاڵدەوە، ئەگەر هەستاو یادی خودای کرد گرێیەك دەبێتەوە، ئەگەر دەسنوێژی شوشت گرێیەکی دیکە دەبێتەوە، ئەگەر نوێژی

کرد هەمو گرێیەکانی دەبنەوەو، بە چالاکیو دەرونێکی باشەوە بەیان دەکاتەوە. ئەگەرنا بە دەرونێکی پیس و تەمبەڵی رۆژ دەکاتەوە)).

هەروەها لە بوخاریو موسلیمدا هاتوە: ((إذا استيقظ أحدكم من منامه فتوضـأ، فليستنثر ثلاثاً، فإن الشيطان يبيت على خيشومه: ئەگەر یەکێکتان لە خەوی هەستا با دەسنوێژ بشواو، سێ جار ئاو لە کەپوی وەربکا، چونکە شەیتان لەسەر لوتی رۆژ دەکاتەوە)).

پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد لە بارەی پیاوێك کە شەوێك تا سبەینێ نوستبو، فەرموی: ((ذاك رجل بال الشيطان في أذنيه: ئەوە پیاوێکە شەیتان میزی لە گوێچکەکانی کردوە)) رواه البخاري.

ئەوانەی باسمان کردن ساردکردنەوەو تەمبەڵ کردن بون بە هۆی کردەوەی شەیتان، واش دەبێ کە بە هۆی وەسوەسە مرۆڤ توشی تەوەزەلی بکا، بۆ هەندێش تەوەزەلی لەلای مرۆڤ خۆشەویست دەکاو ئەمڕۆ بە سبەی دەخاتە کارو کردەوەکانیو هەر کارێك دەداتە پاڵ هومێدی دور، ئیبنیجەوزی لە (تلبيس ابليس/٤٥٨)دا لەم بارییەوە دەڵێ:(گەلێك جاران جولەکەیەك یان گاورێك خۆشەویستی ئیسلامی بە سەردڵدا رابردیە، کەچی ئیبلیس بەردەوام ساردی کردۆتەوەو، پێی گوتوە: خێرا مەبەو لەسەرەخۆ تێبڕوانەو، تاکو بەکافری دەمرێ ئەمڕۆ بەسبەی پێ دەکا.

هەر بەم جۆرەش گوناهباران لە تۆبەکردنێ دەخاتە دواو، ئارەزوەکانی دەخاتە بەردەم، ژیوانی لەلا دەکاتە هیوایەك، هەروەك شاعیر دەڵێ:

لاتعجل الذنب لما تشتهي

وتأمل التـــوبة من قابل

واتە: خێرا مەبە لە گوناهو تاوانان بۆ ئارەزوەکانت و ژیوانیش هەر بە هیواو ئاواتێکی داهاتو بخوازی، چەندین کەسی خاوەن ویست و ئیرادەی توشی گنخان کردوە! چەند کۆششکارانی پایەداری ساردکردۆتەوە! رەنگە فەقیهێك ویستبی وانەکە دوبارەکاتەوەو پێیدابچێتەوە، پێی گوتبیٚ: دەمێك بحەسێوە، یان خوا پەرستێك شەویٚ وە ئاگاهاتبیٚ تا نوێژیٚ بکا، پێی گوتبیٚ: وەختت زۆر لە دەستدا ماوەو، هەر بەردەوامیشە لە خۆشەویست کردنی تەمبەڵی و پشتگویٚ خستنی کردەوە، هەمو کاروبارێکیش دەداتە پاڵ هومێدی دور.

جا ئەگەر یەکێك بیەویٚ کارێك بکات دەبیٚ بە دڵنیاییەوە بیکاو بە کاتەکەی رابگاو، ئەمڕۆ بە سبەی نەکاو لە هۆمێدەواری گەڕیٚ، چونکە ئەوی چو ناگەڕێتەوەو هۆکاری هەموکەم و کوڕیەك و، شەڕڤانیەك، بریتیە لە هیوادرێژی و هومێدی دور، چونکە مرۆڤ هەر خەریکە خۆی دەدوێنیٚ تا لە خراپە وەدور کەویٚو، رو لە چاکە بکا، گومان لەوەدا نیە هەر کەسێکی ئەمڕۆ بە سبەی بکا، لە کردەوەکانی سست دەبیٚو، ئەوی مردنیش بەنزیك بزانیٚ لە کارەکاندا جدیتر دەبیٚ، هێندێك لە پێشینەکان دەڵێن: ئاگادارتان دەکەمەوە لەوەی بڵێن، پاشان وا دەکەم، چونکە ئەم گۆتەیە گەورەترین سەربازی ئیبلیسە، نمونەی کارگەری خاوەن ویست و داسەکناو بە هۆی هیوا درێژی، وەك نمونەی کەسانێکن کە لە سەفەردا بن و بچنە دێیەك، ئەوی توندو تۆڵ و دوربینە، دەچیٚ چی پێویستە بۆ تەواو کردنی سەفەرەکەی دەیکڕیٚو، خۆی بۆ گەشتەکەی کۆك و ئامادە دەکات، هەرچی خەمساردەکەشە دەڵیٚ: خۆم هەر ئامادە دەکەم، رەنگە مانگەك بمێنینەوە، جا یەکسەر کەرەنای بەرێکەوتنیٚ لێیدا، ئەوی خۆی سازو ئامادەکردبو دڵشاد بو، سەرگەردانیش بەشی خەمساردەکە بو، خەڵکیش لە دونیادا ئاوان، تێیان دایە ئامادەو وەئاگایە، جا

ئەگەر فریشتەی مەرگەوان بێ پەشیمان نیە، بەڵام لەخۆبایی‌و خەمساردەکە لەکاتی کەوتنەرێدا تاڵاوی پەشیمانی دەچێژی، جا ئەگەر مرۆڤ مۆرکی لەسەرەخۆیی‌و هۆمێدی دوری گرتبێ‌و، شەیتانیش دنەی بدا تا بەپێی ئەو ئارەزوە رەفتار بکا، کۆششی زەحمەت دەبێ، بەڵام ئەوی رادەبێ و وەئاگا دێ، دەزانێ کە لەبەرەی جەنگدایەو، دژمنەکەی خەمساردی لێناکا، ئەگەر بەڕوکەشیش خەمساردی نواند، لە بنەوە تەڵەو فێلێکی بۆ ئامادە دەکات (تلبیس ابلیس/٤٥٨).

## ٤- بەڵێن دان و بەهەویاکردن:

شەیتان گەلێك بەڵێن و وادەی درۆ بە خەڵکی دەداو بە ئاوات و ئومێدی شیرین پاساویان بۆ دەداتەوە، تاکو بیانخاتە بنەوەی گومڕایی: ﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلاَّ غُرُورًا: شەیتان بەڵێنیان پێ‌دەداو بە ئارەزو دڵخۆشیان دەکا، بەڵێنەکانی شەیتانیش هەر بۆ فریودانە ﴾ (سورة النساء/١٢٠).

ئەگەر بێبڕوایان لەگەڵ ئیمانداران جەنگان، شەیتان وادەی بردنەوەو سەرکەوتن وزاڵ بونیان دەداتێ، پاشان دەستیان لێ بەردەداو، پێ بەغارێوە دەنێ: ﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لاَ غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَكُمْ، فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ: کە شەیتان کردەوەی ئەوانی رازاندەوەو گوتی: ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نیەو من پشتیوانی ئێوەم، جا کاتێك کە هەردو دەستە روبەڕوی یەکتر بون، شەیتان لەسەر پاژنەی خۆی گەڕاوەو گوتی: بەڕاستی من لە ئێوە بێزارم! ﴾ (سورة الأنفال/٤٨).

بەڵێنی دەوڵەمەندی ساماندراری لە دنیاو لە رۆژی دوایی دەداتە کافرە دەوڵەمەندەکان، تا وایان لێدێ دەڵێن: ﴿ وَلَئِنْ رُدِدْتُ إِلَى رَبِّي لأَجِدَنَّ خَيْرًا مِنْهَا مُنقَلَبًا: ئەگەر بشگەڕێنرێمەوە لای پەروەردگارم جێگەم لێرە خۆشترو چاکتر دەبێ ﴾ (سورة الكهف/٣٦)، پاشان خودا هەر لە دونیایی سامانەکەی لە دەست دەردێنێو باخەکەی دەفەوتێنێ. ئەوجا بەخۆ دێتەوەو دەزانێ کە فێڵ لێکراو و هەڵخەڵەتاوە.

هەروەها مرۆڤ بە ئاوات و هومێدی شیرینی دور لەڕاستی غافل دەکاو بەمجۆرە بەری کارو کردەوەی چاك و بەرداری لێ دەگرێو وای لێ دێ هەر بە خەیاڵپلاوان و بە هیوا بونێ رازی بێ و چ کاروکردەوەیەك ئەنجام نەدا.

**٥- دەرخستنی ئامۆژگاری بۆ مرۆڤ:**

شەیتان بانگی مرۆڤ دەکا بۆ گوناه و تاوانان بە ناوی ئامۆژگاری کردن و خێر پێ نیشان دان، کاتی خۆی سوێندیشی بۆ باوکمان خوارد کە ئەو لە ئامۆژگارانە: ﴿ وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ: وە سوێندی بۆ خواردن کەمن خێرخوازو ئامۆژگاری ئێوەم ﴾ (سورة الأعراف/٢١).

جا وەهەبی کوڕی مونەببیە ئەم چیرۆکە سەیرەی لە ئەهلی کیتاب گێڕاوەتەوە، دەیهێنێتەوە تا شێوازێکی شەیتان بۆ گومڕاکردنی بەندان بزانین و ئاگاداربین لە ئاست ئامۆژگاریەکانیو، گوێڕایەڵی نەبین کە بۆ شتێك بانگمان دەکا، وەهەب دەڵێ: (خواپەرستێك لە نێو ئیسرائیلزاماندا هەبو، یەکێك بو لە خواپەرستترین کەسی سەردەمی خۆی، هەر لە زەمانی وی سێ برا هەبون و تەنیا خوشکێکی عازەبیان هەبو. نێردەیی بۆ هەرسێکیان دەرچو، نەیانزانی

خوشکەکەیان لە کن کێ جێبێڵن و ئەسپاردەی چ دەسپاکێکی بکەن و لە لای کێـــی دانێـــن، دەڵـــێ: هـــەمو لەســـەر جێهێشـــتنی خوشـــکەکەیان لـــەلای خواپەرستەکەی بەنی ئیسرائیل کۆڕابون. چونکە لـە ناخـەوە متمانـەیان پـێ هەبو، جا هاتنە لای و داوایان لێکرد خوشکەکەیان لەلای جێبێڵن تا لە ژێر چـاودێری و دراوسێی وی بـێ تـاکو ئـەوان لـە غـەزایێ دەگەڕێنـەوە، بـەڵام خواپەرست رازی نەبو، خۆی بەخودا پەناگرت لەوان و لە خوشکەکەیان، دەڵێ: هـەر لەگـەڵیدا خـەریك بون هـەتا هاتـە رایێ، جاگوتی: لە ماڵێکی دابـەزێنن لـە ئاسـت خـەڵوەتگای مـن بـێ، دەڵـێ: لـەو خـانوە نیشـتەجێیان کـرد، پاشـان وەڕێکەوتن و بەجێیان هێشت، کچەش لە پاڵ ئەو خواپەرستە مایەوە، ئەویش ماوەیـەك خۆراکـی لـە خەڵوەتگەکـەی خـۆی بـۆ دەهێنـا خـوارو لەبەردەرگـەی خەڵوتگاکـەی دادەنـا، پاشـان دەرگەکـەی دادەخسـت و هەڵدەکشـاوە نێـو خەڵوەتگەکە، ئەوجا فەرمانی بە کچە دەکرد، لە ماڵەکەی دەهاتـە دەرێو ئـەو خواردنەی بۆی دانابو هەڵی دەگرت، دەڵێ: ئـەوجا شـەیتان بۆی دەلاواندەوەو زێتر ئارەزوی دەخستە سـەر چاکـەو، ئـەوەی بـە مـەزن نیشـان دەدا کـە ئـەو کەنیزەیـە بـە رۆژ لـە مـاڵێ بێتـە دەرێو لـەوەی دەترسـاند کەسـێك ببینـێو پەیوەستی بێ، جا ئەگەر تۆ خواردنەکەی بۆ ببەی و لەبەردەرگەی ماڵەکەی دانێی پاداشتی پترە.

شەیتان هەر خەریکی بو، وازی لێ نەهێنا هـەتا وای لێکرد خواردنەکەی بۆ برد لەبەر دەرگەی ماڵەکەی دانا، بەڵام قسەی لەگـەڵ نـەکرد، دەڵـێ: دەمێکیش بەم حاڵ و بارە مایەوە، پاشان ئیبلیس هاتەوە لای و بەرەو خێرو پاداشتێکی پـتر هـانی داو جـەختی لێ کـردو، گوتـی: ئەگـەر خواردنەکـەت بـۆ بردبـاو لـە ماڵەکەیت دانابا خێرو پاداشتت زێتر دەبو، هـەر وازی لێ نـەهێنا تـاوای لێهات خواردنەکەی بۆ بردو لە ماڵەکەی داناو بـەم جۆرەش ماوەیـەك مایـەوە، پاشان

ئیبلیس هاته لای و بۆ چاکەکاری هانیداو دەستی لەپشتیدا. جا پێی گوت: ئەگەر قسەت لەگەڵ کردباو بتدواندبا بەڵکو بە قسەکانت هۆگرو هاودەنگێکی دەبو، چونکە ئەو کیژە زۆر هەست بەتەنیاییو بێزاری دەکا، هەر خەریکی بو، لێی نەگەڕا تا وای لێهات بۆ ماوەیەك لەسەر خەڵوەتگەکەیەوە سەری بۆ شوڕ دەکردەوەو دەیدواند.

پاش ئەمەش ئیبلیس هاتەوە لای، پێی گوت: ئەگەر بچوبایە خوارێ ولەبەردەرگەی خەڵوەتگەکەت دانیشتبای و قسەت لەگەڵ کردباو، ئەویش لە پیش دەرگەی ماڵی خۆیرا لەگەڵت بئاخاوتبا، زێتر دڵی پێ خۆش دەبو، هەر وازی لێ نەهێناو پێوەی خەریك بو هەتا هێنایە خوارێو لەبەر دەرگەی خەڵوەتگەکەی دایناو قسەیان پێکەوە دەکردو کەنیزەکەش لە ماڵی خۆی وەدەر دەکەوت و لەبەر دەرگەی ماڵێ دادەنیشت، ماوەیەکیش ئەوها مانەوە.

پاشان ئیبلیس هاتەوە لایو دنەی دا بۆ وەدەست خستنی پاداشتی زۆر لە کردەوەکانی لە ئاست ئەو کیژۆڵەیە، جا پێی گوت: ئەگەر لە دەرگەی خەڵوەتگەکەت بچوبایە دەرێو پاشان لەنزیك ماڵی کچەی دانیشتبای و قسەت لەگەڵی کردبا زێتر تاسەی تەنیایی دەشکا، وازی لێ نەهێنا هەتا ئەوەشی پێکرد، پاشان ئیبلیس هاتەوە لای، جا پێی گوت: ئەگەر لەگەڵی بچوبایە ژورێ و قسەت لەگەڵ بکردباو نەتهێشتبا روی بۆ کەس دەرخا، خێرت زیاتر دەگەیشتێ، لێی نەگەڕا هەتا چوە ماڵەکەیو بەدرێژایی رۆژگار دەیدواندو کە رۆژیش ئاوا دەبو هەڵدەکشاوە خەڵوەتگەکەی.

پاشان ئیبلیس هاتەوە لایو، هەرکیژەی لە پێش چاوان دەڕازاندەوەو شیرینی دەکرد، تا خواپەرست دەستێکی لە ڕانی داو ماچی کرد، ئیبلیس هەر بەردەوام لەبەر چاوانی وی کیژەی جوان دەکردو دەیڕازاندەوە تاکو پڕی دایێ،

سکی پڕ کردو کچە کوڕێکی بو، ئەوجا ئیبلیس هاتەوە لایو پێی گوت: ئەدی ئەگەر برایەکانی ئەو کەنیزکە هاتنەوە، وا لە تۆ منداڵێکیشی بوە، چی دەکەی؟ دڵنیا نیم لەوەی ئابڕوت نەچێ یا ئەوان ئابڕوت نەبەن، جا بڕۆ سەری کوڕەکەی ببڕەو بیشارەوە، کیژەش لەترسی برایەکانی بێدەنگ دەبێ، نەوەك بزانن تۆ چیت لێ کردوە، جا چو منداڵەکەی سەربڕی، ئەوجا پێی گوت: وای دەبینی کە لە براکانی بشارتەوە، چیت لە خۆی کردوەو کوڕەکەیت کوشتوە، بڕۆ سەری ئەویش ببڕەو لەگەڵ کوڕەکەی لە چاڵێی نێ، هەر لەدوی بو هەتا سەری ئەویشی بڕیو لەگەڵ کوڕەکەی لەچاڵێی هاوێشت و، بەردەکی زەلامی خستەسەریان و خۆڵی بەسەریدا کردن، جا بەسەر خەڵوەتگەکەی کەوتەوەو خەریکی پەرستش بو، ئەوەندەی خودا ویستی تێیدا ماوە، تاکو برایەکانی کیژە لە غەزایێ گەڕانەوەو، هاتنە لای لە خوشکی خۆیان پرسی، ئەویش سەرەخۆشی لێ کردن و ڕەحمەتی بۆ ناردو بۆی گریاو، گوتی: چاکترین ئافرەت بو، ئەمەش گۆڕەکەیەتی، جا سەیری کەن، برایەکانی چونە سەر گۆڕەکەی، بۆ خوشکی خۆیان گریان و ڕەحمەتیان بۆ هەناردو چەند ڕۆژێك لەسەر گۆڕەکەی مانەوە، ئینجا هەر کەسەو چوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی.

کە شەویان بەسەرداهات و پاڵیان داوە، شەیتان لە شێوەی پیاوێکی ڕێبوار هاتە خەونیان، لەوی گەورەترێ دەستی پێکردو، لە بابەت خوشکەکەیان پرسیاری لێکرد، ئەویش قسەی خواپەرستەکەی بۆ گێڕاوە کە مردوەو ڕەحمەتی بۆ ناردوە، گوتی کە چۆن شوێنی گۆڕەکەی نیشان داون، بەڵام شەیتان بەدرۆی خستەوەو گوتی: لەمەسەلەی خوشکەکەتان لەگەڵتان ڕاستگۆ نەبوە، ئەو کابرایە سکی خوشکی ئێوەی پڕ کرد، جا کیژە کوڕێکی لێ بو لە ترسی ئێوە منداڵ ەکەی سەربڕیو خوشکەکەشتانی لەگەڵی سەربڕیو، خستنیە قۆرتێکی کە بەخۆی هەڵی کەندبو، لە پشت دەرگەی ئەو خانوەی کیژەکەی

تێدا بو. لە دەستەڕاستی ئەوکەسەی دەچتە ژورێ. جا هەستن هەڕونە ماڵەکەی خوشکەکەتانی تێدا بو لە دەستەڕاستی ئەو کەسەی دەچتە ژورێ، چۆنی پێ ``تان دەڵێم هەموی ئاوا دەدۆزنەوە، لە خەوێ هاتە لای برای نێوەنجیو هەمان قسەی بۆ کرد، پاشان هاتە لای گچکەترینیان و چی بەوان گوتبو بەمیشی گوت، جا کە وەئاگا هاتن سەیریان بەوەی دەهات کە هەریەکەیان دیتبوی، هەریەکەو روی لە ئەوی دیکە دەکردو دەیگوت: ئەمشۆ شتێکی سەمەرەم دیت و، هەریەکەیان چییان دیبو گێڕایانەوە گەورەکەیان گوتی: ئەوە تەنیا خەونەو شتێکی وەهانیە، وازی لێ بێنن، برا گچکە گوتی: سوێند بەخوا واز ناهێنم هەتا دەچمە ئەو جێیەو تەماشای دەکەم، دەڵی: ئەوجا هەمو بەرەو ئەوێ چون تا گەیشتنە ئەو خانوەی خوشکەکەیانی تێدا بو، دەرگەکەیان کردەوەو لەو شوێنەی گەڕان کە لەخەوێدا بۆیان وەسف کرا بو، جا خوشکەکەیان و کوڕەکەیان دیت بەسەربڕاوی لەو قۆرتەی فرێدراون هەروەك پێیان گوترابو، جا پرسیاریان لە خواپەرەستەکەی کردو ئەویش قسەکەی ئیبلیسی بەڕاست داناو دانیئنا بەوەی پێی کردبون، ئەوانیش پاشای خۆیان لێ تێگەیاند، لە خەڵوەتگەکەی دایانبەزاندو بردیان لە خاچی دەن، جا کە لە دارییان بەستاوە شەیتان هاتە لای و، پێی گوت: ئەوە زانیت هەر ئەمن بوم دنەم دای تا توشی ئەو بەڵایە بوی و زگی ئەو ئافرەتەت پڕکردو بە خۆ بە کوڕەوە سەرت بڕی، جا ئەگەر ئەمڕۆ بە گوێم بکەیو، کوفر بەو خودایە بکەی کە تۆی ئەفراندوەو وێنەی کێشاوی، لێرە دەربازت دەکەم، جا کابرا کوفرەکەی کردو، پاش ئەوەی کوفری بە خودا کرد، شەیتان وازی لێهێناو لەنێوان چوە دەرێ، ئەوجا کابرایان لە خاچ دا.. (سەیری تلبیس ابلیس/٣٩ بکە).

جا راڤەکارانی قورئان ئەم چیرۆکە بۆ راڤەکردنی ئەو ئایەتە پیرۆزە دێننەوە کە دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ:

هەروەکو شەیتان کە بە مرۆڤی گوت: کافربە، جا کە کوفری کرد گوتی بەڕاستی من لە تۆ بەری و بێزارم ﴾ (سورة الحشر/١٦).

دەشلێن لێرەدا مەبەست بە (انسان) ئەو خوا پەرستەو هەمو مرۆڤێکی هاوشێوەیە، خوداش زاناترە.

٦- بەرەبەرە گومڕاکردن:

لە چیرۆکەکەی پێشو یەکێك لە شێوازەکانی شەیتانمان بۆ گومڕاکردن، لا ئاشکرا دەبێت، ئەویش ئەوەیە کە هەنگاو هەنگاو لەگەڵ مرۆڤ دەڕواو، نە ماندو دەبێ نە بێزار، هەر چەند جاری بۆ گوناهێك رامی دەکا، بەرەو گوناهێکی گەورەتر دەیهاژوا، تا دەیگەیەنێتە گەورەترین گوناه. و بەهیلاکی دەبا.

ئەمەش سونەتی خودایە لەنێو بەندەکانی خۆیدا ئەگەر لە ڕێ لایان دا شەیتانیان بەسەردا زاڵ دەکاو، دڵیان لاڕێ دەکا ﴿ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ: جا کاتێك ئەوان لە هەق لایان دا، خودا دڵ و دەرونی وانی لە هەق گلاکرد ﴾ (سورة الصف/٥).

٧- لە بیر بردنەوەی شەیتان بۆ خێرو چاکە لە بەندان:

هەروەکو وای لە ئادەمیش کرد، هێندەی وەسوەسە بۆ کرد تا فەرمانەکەی پەروەردگاری لە بیر بردەوە ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا: وە ئێمە پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت، جا ئەو لەبیری چو لێنەوینێکی وامان لێنەدی ﴾ (سورة طه/١١٥) . هەروەها هاوەڵەکەی موسا بە موسای گوت

﴿ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ: جا لەویَ ماسیەکەم لە بیر چو، ئەوە هەر شەیتان بو کە لە بیری بردمەوە ﴾ (سورة الكهف/٦٣).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکراوە، کە خۆی یا یەکێك لە هاوەڵانی لە کۆڕێکدا دانیشت، تێیدا گاڵتە بە ئایەتەکانی خودا بکرێ، بەڵام ڕەنگە شەیتان ویستی پەروەردگار لە بیر مرۆڤ بباتەوەو توشی بێ لەگەڵ ئەو گاڵتەبازانە دانیشێ ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلاَ تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ: هەر کاتێك کەسانێکت دیت کە گاڵتە بە نیشانەکانی ئێمە دەکەن رویان لێ وەربگێڕە تا قسەکە بگۆڕن، ئەگەر شەیتان لە بیریشی بردیەوە، ئەوا هەردەمێکی هاتەوە بیرت لەگەڵ ئەم دەستەو هۆزە ستەمکارە دامەنیشە ﴾ (سورة الأنعام/٦٨).

یوسفی پێغەمبەری خوداش لەو زیندانییەی داواکرد، کەوا گومانی دەبرد ئازاد دەکرێ‌و لە کوشتن رزگار دەبێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ خزمەتی پاشا، تا لە کن پاشادا باسی بکا، کەچی شەیتان لە بیر ئەو مرۆڤەی بردەوە کە بۆ پاشایەکەی باسی یوسفی پێغەمبەریخودا بکا، بۆیە یوسف چەند ساڵێك لە زینداندا ماوە ﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِنْهُمَا اذْكُرْنِي عِنْدَ رَبِّكَ فَأَنْسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ: وە بەوەی گوت کە دەیزانی رزگار دەبێ: لای خاوەنەکەت یادم بکە، بەڵام شەیتان باسکردنی ئەوی لای خاوەنەکەی لەبیر بردەوە، جا بۆ چەند ساڵان لە زیندانێ مایەوە ﴾ (سورة يوسف/٤٢).

جا ئەگەر شەیتان تەواو دەرەقەتی مرۆڤ هات و دەستی لێستاند، هەر بەیەکجاری خودای لەبیر دەباتەوە ﴿ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنْسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ

أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلاَ إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ: شەیتان بەجۆرێك بەسەریاندا زاڵ بوە کە یادی خودای لەبیر بردونەتەوە، ئەوانە دەستەی شەیتانن، بابزانن کە بەڕاستی هەر کۆمەڵی شەیتان زیانبارە ﴾ (سورة المجادلة/١٩)، مەبەستیش لێرە لە دەغەڵانە، هەروەکو لە ئایەتی پێش ئەمەدا هاتوە. یادو وەبیرهاتنەوەو یادی خوداش. مایەی وەبیر هاتنەوەو یادکەوتنەوەیە، چونکە یادی خودا شەیتان وەدەر دەنێ: ﴿ وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ: هەر کاتێك لە بیرت چۆوە، یادی پەروەردگارت بکە ﴾ (سورة الکهف/٢٤).

**٨- ترساندنی بڕواداران لە دۆستانی خۆی:**

هەروەها یەکێك لە شێوازەکانی شەیتان ئەوەیە کە بڕواداران لەسەربازو لە دۆستانی خۆی دەترسێنێ، جا جیهادیان ناکەن و فەرمانی چاکەیان پێ ناکەن و لە خراپە نایانگێڕنەوە، ئەمەش گەورەترین تەڵەو داوێتی بو بڕواداران خودای بەرزیش ئەمەی پێ ڕاگەیاندوین کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِي إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ: بەڕاست ئەمە تەنیا شەیتانە کە دۆستان و پەیڕەوانی خۆی دەترسێنێ، جا ئەگەر بڕواتان هەیە لەوان مەترسن و لە من بترسێن ﴾ (سورة آل عمران/١٧٥).

لە بارەی مانای (يخوفكم اولياءه)، قەتادە دەڵێ: (لە دڵتان مەزنیان دەکەن، هەر بۆیەش فەرمویەتی جا لەوان مەترسێن و لە من بترسێن ئەگەر ئیماندارن، چونکە هەرچەند ئیمانی بەندە بەهێز بێ، هێندە ترسی دۆستانی شەیتانی لە دڵی دەردەچێ و، هەر چەندی ئیمانیشی لاواز بێ ترسی لەوان زیاترو زەبەلاحتر دەبێ.

٩- لە دەرون وەژور کەوتنی بەو دەرگایانەی مرۆڤ ئارەزویان دەکاو خۆشی دەوێن:

لە (اغاثة اللهفان ١٣٢/١)دا، ئیبنیقەییم لەم بابەتەوە دەڵێ: ڕێچکەی شەیتان لە ئادەمیزاد بە ڕێچکەی خوێن دەچێت تا دەگاتە دەرونیو تێکەڵی دەبێت. جا پرسیاری لێ دەکا حەزی لە چیەو چی پێخۆشە، ئەگەر زانی ئەوا بەهۆی ئەو ئارەزوانە بەگژ بەندەدا دەچێو لەم دەرگەیەوە بۆی دەچێ. جا شەیتان ئەمەی فێری دەستە براو دۆستانی خۆشی کردوە لەنێو مرۆڤدا، ئەگەر بیانەوێ ویستێکی گەندی خۆیان بەجێ بگەیەنن دەبێ لەو دەرگەیەوە بۆی بچن کە جێبەجێی ئارەزو و خۆشەویستیە، چونکە ئەم دەرگەیە ئاتاجی ئەو کەسە جێبەجێ دەکا کە لێیەوە دەچێتە ژورێ، هەر کەسێکی بیەوێ لە دەرگەیەکی دیکە بچێتە ژورێ لە روی دادەخرێ و ڕێگەی مەبەستەکەی لێ دەگیرێ.

هەر لێرەشەوە شەیتان چوە لای ئادەم و حەوا هەروەك خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنْ الْخَالِدِينَ: پەروەردگارتان ئەم دارەی لە ئێوە قەدەغە کردوە نەوەك ببنە دو فریشتە یا بە جاویدانی لە بەهەشتێدا بمێننەوە ﴾ (سورة الأعراف/ ٥٠).

ئیبنیقەییم دەڵێ: شەیتانی دوژمنی خوا بۆنی دایك و باوکمانی کرد، هەستی کرد حەز لە جاویدانی دەکەن لەو بەهەشتەیدا، بۆیە زانی لەو دەرگەیە نەبێ ناتوانێ بۆیان بچێ، جا بەخودا سوێندی بۆ خواردن کە ئەم بۆوان ئامۆژگارەو گوتی: ﴿ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنْ الْخَالِدِينَ ﴾ (سورة الأعراف/ ٥٠).

**١٠- گومان خستنە دڵان:**

یەكێكی دی لە شێوازەكانی شەیتان بۆ گومڕا كردنی بەندان، لەرزەك كردنی عەقیدەیە بەو شك و گومانەی دەیخاتە دڵان، پێغەمبەریش ﷺ لە هێندێك گومان و وێچونان ئاگادارمان دەكاتەوە كە شەیتان دەیانخاتە دڵان، هەروەك لە فەرمودەیەكی بوخاریو موسلیمدا هاتوە: ((يأتي الشيطان أحدكم فيقول: من خلق كذا؟ من خلق كذا؟ حتى يقول من خلق ربك؟ فإذا بلغه فليستعذ بالله ولينته: شەیتان دێتە لای یەكێكتان و دەڵێ: كێ فلانە شتی ئافەریدە كرد؟ كێ فیساری ئەفراند؟ تا دەگاتە ئەوەی دەڵێ كێ پەروەردگاری تۆی ئافەریدە كردوە؟ جا ئەگەر گەیشتە ئەو رادەیە با خۆی بەخودا پەنابگرێ و چی‌دی بیری لێ نەكاتەوە)).. جا هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەریش ﷺ لەو جۆرە گومانانەی شەیتان بێبەش نەبون، جا هێندێكیان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وگازاندەی ئەو گومان و وەسوەسانەی شەیتانیان لەلا كرد، هەروەك لە صەحیحی موسلیمدا لە ئەبو هورەیرە ﷺ هاتوە دەڵێ: خەڵكانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و لێیان پرسی: ئێمە شتی وا لە دەرونماندا هەست پێدەكەین، كەسێكمان زات ناكەین بیڵێین! فەرموی: ((او قد وجدتموه؟: ئایا ئەوەتان هەست پێكردوە؟)) گوتیان: بەڵێ، فەرموی: ((ذلك صريح الإيمان: ئەمە بڕوای راستەقینەو راشكاوە)).

جا پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموێ ((ذلك صريح الإيمان: ئەمە ئیمانی راستەقینەو راشكاوە)) مرازی ئەوەیە كە وەسوەسەی شەیتان لادەبەن و رقیان لێیەو بە كارێكی مەزنی دادەنێن.

جا سەیری ئەو بارە ناخۆشە بكە كە هاوەڵەكانی پێغەمبەر لەبەر گومانەكانی شەیتان تێی كەوتبون، ئەبو داود لە سونەنەكەیدا لە ئیبنی‌عەبباسەوە دەگێڕتەوە كە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺو گوتی: (ئەمن

شتی وام به خه‌یاڵیدا دێ و له‌گه‌ڵ ده‌رونی خۆم ده‌دوێم، ئه‌گه‌ر ببمه پولیه ئاگر پێم خۆشتره له‌وه‌ی بیانگێڕمه‌وه، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموی: ((الحمد لله الذي رد أمره إلى الوسوسة: سوپاس بۆ خودا که باری ئه‌وی بۆ وه‌سوه‌سه گێڕاوه‌ته‌وه))، هه‌روه‌ها له تێکڕای ئه‌و شتانه‌ی شه‌یتان ده‌یخاته دڵان و گومانی پێ دروست ده‌کا ئه‌وه‌یه که خودا بۆمانی باس ده‌کاو ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ۝ لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ۝ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ: هه‌ر نێردراوێك یا په‌یامبه‌رێكمان له پێشه‌تۆ ناردبێ، له کاتی خوێندنه‌وه‌یدا، شه‌یتان شتی وای خستۆته به‌ر گوێی بێباوه‌ڕان که به‌سه‌ر زاری پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ نه‌هاتوه، جا خودا ئه‌م وه‌سوه‌سه‌و گزی‌و فزی شه‌یتانه له‌نێو ده‌باو پاشان ئایه‌ته‌کانی خۆی پته‌و ده‌کا، وه خودا زاناو دانایه، جا خودا گزی‌و فزی شه‌یتان ده‌کاته ئه‌زمون و گومڕایی بۆ ئه‌وانه‌ی دڵیان نه‌خۆشه‌و گومان و نیفاقی تێدایه‌و بۆ ئه‌وانه‌ش که دڵڕه‌ق و موشریكن، سته‌مكارانیش له دوژمنایه‌تیه‌كی سه‌خت و دور له هه‌ق دان، مه‌به‌ستیش ئه‌وه‌یه که که‌سانێكی خوا زانستی پێداون بزانن ئه‌مه هه‌قێكه له‌لای په‌روه‌ردگارته‌وه، جا با بڕوای پێ بێنن و دڵانیان ئارام بگرێ، بێگومان خودا ڕێنیشانده‌ری که‌سانێكه که بڕوایان به ڕێگه‌ی ڕاست هێناوه ﴾(سورة الحج/٥٢-٥٤).

هەروەها مراز بە (تَمَنّى) قسەو گفتی دەرونە ، مەبەستیش ئەوەیە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە دەروندا لەگەڵ خۆی دوابا، شەیتان لە روی گزیو فز ...ەندێك شتی دەهاویشتە دڵ و دەیگوت: لە خوا داوا بکە غەنیمەتت بداتێ تا موسڵمان زۆربن، یا وا ئاوات بخوازە کە سەرجەم خەڵکی باوەڕ بێنن، جا خودای گەورە ئەوەی لا دەبرد کە شەیتان بەهۆی وەسوەسە دەیخستە دڵی پێغەمبەرﷺ، بەوەی کە لە ئاست هەق وەئاگای دەهێناو ئاگاداری دەکردەوەو، روەو قانی خودا ئاڕاستەی دەکرد... هەر شتێکیش گوترابێ لە بابەت ئەوەی گوایە شەیتان شتانێك دەخاتە نێو قورئان کە تێیدا نیە ئەمە مەسەلەیەکی دورەو، هێندەش بەسە بۆ وەرام و رەتکردنەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە راگەیاندنی پەیامەکەی مەعصوم و بێخەوشە.

شەقیق ﵁ کەیەکێکە لەزانا ناودارەکان، هەندێك وێچون وگومانان رون دەکاتەوە کە شەیتان دەیخاتە دەرونی مرۆڤ و دەڵێ: (هیچ سبەینەیەك نیە، مەگەر شەیتان چوار سەرەڕێی لێم نەگرتبێ: لە پێشم و، لە پشتەوەم و، لەلای راست و، لەلای چەپەم، جا پێم دەڵێ مەترسێ، چونکە خودا لێبوردەو بەڕەحمە، منیش ئەو ئایەتە دەخوێنمەوە: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى: بەڕاستی من زۆر لێخۆشبو بەخشەرم بۆ کەسانێك کە ژیوان بینەوەو بڕوا بێنن و کاری چاك ئەنجام بدەن و پاشان رێنوێن بن ﴾ (سورة طه/٨٢)، کە لە پاشەوەش بۆم دێ لەوە دەمترسێنێ کە ئەوانی لە پاشەخۆم جێیان دێلم وێڵو سەرگەردان بن، جا ئەم ئایەتە دەخوێنمەوە: ﴿ وَمَا مِنْ دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللّهِ رِزْقُهَا: وە هەر جوڵندەیەك لە زەویدا هەبێ، رۆزیەکەی لەسەر خوایە ﴾ (سورة هود/٦).

لەلای راستەوەش بۆم دێ لەلای ژنانەوە، منیش ئەمە دەخوێنەوە: ﴿ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ: وەسەرەنجامی چاك بۆ پارێزكارانە ﴾ (سورة الأعراف/١٢٨).

لەلای چۆپەش بۆم دێ لە هەوەس و ئارەزوانەوە، منیش ئەو ئایەتە دەخوێنمەوە: ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ: ئەوان و ئارەزوەكانیان لێك جودا كرانەوە ﴾ (سورة سبأ/٥٤).

**(١١-١٤)- بادەو قومارو بت و فاڵگرتنەوە:**

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنْصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ۞ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنْ الصَّلاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ: بەراستی بادەو قومارو بتگەل و فاڵگرتنەوە پیسن و لە كردەوەی شەیتانانن، جا لێیان دور كەونەوە، بەڵكو رزگاربن، شەیتان دەیەوێ بە هۆی شەراب و قومارەوە دوژمنایەتیو رق وكینەتان لەنێواندا بخاتەوەو، ئێوە لەیادی خوداو نوێژكردن بگێرێتەوە، جا ئایا دەست لەم كارانە هەڵدەگرن؟ ﴾(سورة المائدة/٩٠-٩١).

جا بادە بریتیە لە هەمو جۆرە سەرخۆشكەرێك و، قوماریش هەمو جۆرەكانی دەگرێتەوەو بتیش هەمو ئەو شتانەن كە بێجگە لەخودا دەپەرسترێن، جا بەرد بێ یا دار بێ، یا پروپوچێك یا گۆرێك بێ، یا ئالاو بەیداخێك، فاڵگرتنەوەش، تاقی كردنەوەی بەختەو هەوڵدانە بۆ زانینی قسمەت و بەش، جا بەهەر جۆرێك بێت، وەك ئەوەی چەند تیرێك یا چەند بەردێك بخرێتە نێو جۆركێك و، لە سەر یەكێكیان نوسرابێ بیكەو لەسەر ئەوی دی

نوسرابێ مەیکە، جا بۆ نمونە کە یەکێك بیەوێ ژن بێنێ یا سەفەرێك بکا یا بۆ کارێکی‌تر، دەست دەخاتە نێو جۆرکەکەو بەردێك یا تیرێك رادەکێشی و چۆنی لەسەر نوسرابو وا دەکا.

جا شەیتان خەڵکی بۆ ئەم چوار کردەوەیە هان دەدات، چونکە هەر لە خۆیاندا گومڕایین و ئاکامی وێران و کاریگەری خراپیان هەیە، هەرچی مەی خواردنەوەیە عەقل و هۆشی مەیخۆرەکە ناهێڵێ، هەرچی هۆشیشی نەما تاوان و کردەی حەرام ئەنجام دەداو، واز لە تاعەتان دێنێ‌و بەندەکانی خودا ئازار دەدا، ئیبنی‌کەثیر لە تەفسیرەکەیدا لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە ﷛ دەگێڕتەوە کە دەڵێ: (خۆ لە مەی بپارێزن، چونکە دایکی هەمو پیسیەکە، لەوانی پیش ئێوە پیاوێك هەبو، بە خواپەرستی خەریك بو، خۆی لە خەڵکی دابڕیبو، ئافرەتێکی خراپ پەیوەندی پێوە کرد، کەنیزەکەی خۆی ناردە لای تاکو بۆ شایەدیەك بانگی‌کا ئەویش لەگەڵی چوە ژورێ، لە هەر دەرگەکی وەژور دەکەوت، لەسەری دادەخست، تا گەیشتە لای ژنێکی جوان کە کوڕیژگەیەك و بادیە مەیەکی لەلا بو، ژنە پێی گوت سوێند بەخوا بۆ شایەدی بانگم نەکردوی، بەڵکو بۆ هەندێ بانگم کردوی تا تۆخنم کەوی، یا ئەو کوڕیژگەیە بکوژی یان ئەو شەڕابە بخۆیەوە، جا پێکێکی دایە، کابرا گوتی: زێترم بدەنێ، تا هێندەی نەبرد توخنی ژنە کەوت و کوریژگەکەشی کوشت، جا مەی خۆری و بڕوا هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە، بەڵکو هەر دەبێ یەکێکیان ئەوی تر دەرکا) رواه البیهقي وصحح ابن کثیر اسنادە.

هەروەها موسلیم و خاوەن سونەنەکان دەگێڕنەوە؛ پیاوێك لە پشتیوانان خواردنی بۆ هەندێك لە هاوەڵان دروست کردو، پاشان مەی پێ‌نوشین و لەوکاتی هێشتا حەرام نەکرا بو، جا کە سەرخۆش بون، خۆیان هەڵکێشاو بە خۆدا خورین و، بەشەڕهاتن، سەعدی ئیبنی‌ئەبی‌وەققاصیش لەو شەڕەدا ئازاری

پێ گەیشت، چونکە یەکێك بە چەناگەی حوشتر لێی‌داو بەر کەپوی کەوت، بەدرێژایی ژیانی شوێنی هەر مابو. هەروەها لە پێش حەرام کرنی مەیخۆری یەکێك لە هاوەڵان پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، قورئانی بە هەڵە خوێندەوەو گوتی: ﴿قُلْ يَاأَيُّهَا الْكَافِرُونَ۞ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ جا خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ: بەسەرخۆشی نزیك نوێژ مەکەونەوە، هەتا بزانن چی دەڵێن﴾ (سورة النساء/٤٣).

پیاوی زۆر پیرو کەنەفتمان دیوە کە مەی خواردۆتەوە وەك شێتان هەڵسوکەوتی کردوەو، گەورەو گچکە پێی پێکەنیون، لە لاڕێیان کەوتوەو خەڵك پێیان لێ‌ناوە.

قوماریش وەکو مەی نەخۆشیەکی ترسناکە ئەگەر بە ناخی مرۆڤدا ڕەگاژۆ بو چارەسەری زەحمەت دەبێ، ڕێگەیەکیشە بۆ لەدەست دانی کات و ماڵ، کینەو بوغز لە دلاّندا دەنێتەوەو مرۆڤ بەرەو حەرام دەبا.

هەروەها شەیتان بانگەشەی دروست کردنی پەیکەران دەکا هەتا لەدوایی بکرێنە خوداوەندو بێجگە لەخوا بپەرسترێن، بتپەرستیش لە کۆن و نوێدا هەر بلاّو بوەو، شەیتانەکانیش بەندیواری ئەو بتانەن و، هەندێ جار لەگەڵ بتپەرستان دێنە ئاخاوتن و، هەندێك شتی وایان پیشان دەدەن کە بتپەرستەکان پتر متمانە پەیدا کەن، جا ئاتاجی خۆیانی وەبەر دەبەن و، لە ناخۆشیدا لێیان دەپاڕێنەوەو، لە شەڕێدا داوای سەرخستنیان لێ دەکەن و، کوشتارو دیاری پێشکێش دەکەن و، بەدەوریدا دەسوڕێن و گۆرانیان دەڵێن و، جەژن و ئاهەنگیان بۆ سازدەکەن و، گەلێك خەڵکیشی بەمە گومڕا کردوە، هەروەکو ئیبراهیم لە خودا پاڕاوەو گوتی: ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الأَصْنَامَ۞

رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ: پەروەردگـــارم؛ من و کوڕەکانم لە بتپەرســـتی دور بکەوە، ئەی پەروەردگـــارم ئەو بتـانە خەڵکێکی زۆریـان گومڕا کـردوە ﴾ (سورة إبراهيم/٣٥-٣٦). تاکو ئێستاش گۆڕپەرستن لە نێو موسڵماناندا باو بڵاوە، رو لە گۆڕ دەکەن و دەپاڕێنەوەو کوشتیان بۆ سەردەبڕن بیدعەیەکی نوێی دیکەش تازە بڵاو بۆتەوەو شەیتان گەمەی پـێ بـە خـەڵکی دەکـات، ئـەویش پەیکەری سەربازی نەناسراوە، گوایە هێمایە بۆ سەربازی جەنگاوەرو، بەگوڵ و دیاری ومەزنگرتن رێزی لێ دەگرن و، هـەر چـەند جـاری سـەرۆکێك سـەردانی وڵات بکا، دێتە لای ئەو پەیکەرەو دیاری بۆ دێنـیو، ئەمەش هەموی پەیکەر پەرستیەو لە کردەوەی شەیتانە.

**فاڵگرتنەوە:**

مەسەلەو روداوەکانی داهاتو، لە زانستی خـودا دایـە، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمانی پێ کردوین ئیستیخارە بکەین، ئەگەر سەفەر کردن یا ژنهێنان و شتی دیکەمان لە پێش بێ، تا تکا لە خودا بکەین چاکترین شتمان بۆ هەڵبژێرێ.

خراپترین جۆری فاڵگرتنەوەش رەمل لێدان و تـیر هەڵبژاردنـە، راوێـژ پـێ کردنیشی لە بێهۆشیو کەمزانیە، باڵندەهەڵدانیش هەر لەم بابەتەیە، یـەکێك بەتـەمای سـەفەرێك دەبو، کە لە ماڵ دەردەچو گەیشتبا باڵندەیەك کشـەی لێ دەکرد جا ئەگەر بەلای راستدا بچوبا سەفەرو گەشتەکەی پیرۆز بو، ئەگەر بە لای چەپیشیدا بچوبا خراپەی دەهاتە رێ...، دیارە ئەمەش هەموی گومڕاییە.

**١٥- جـــــادو:**

شتێکی دیکە لەوەی شەیتانەکان ئادەمیزادی پـێ گومڕا دەکـەن؛ جـادوە، ئەوان فێری ئەو زانستەی دەکـەن کـەزیانی هەیـەو سـودی نیـە، بـەهۆی ئـەم

ـ نسته پیاو و ژنەکەی لێك جودا دەکەنەوەو، جیا کردنەوەی هاوسەرانیش ـەلای شەیتان گەورەترین کارە سەربازەکانی پێی هەستن.

خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ: سلێمان جادوی نەکردو کافر نەبو، بەڵام شەیتانەکان کافر بون و خەڵکیان فێری جادوگەری دەکرد، لەوەی بۆ دو فریشتەکەی بابل، هاروت و ماروت دابەزیبو، وە هیچ کەسیان فێر نەدەکرد تا پێیان دەگوت: ئێمە هۆی ئەزمون و تاقیکردنەوەین، جا وشیاربە کافر نەبی، بەڵام ئەوان شتی وا لەو دو فریشتەیە فێر دەبون کە بەو جادوە ژن و مێردێك جیا بکەنەوە، وە ئەوانە بیٚفەرمانی خودا ناتوانن هیچ زیانێك بە کەس بگەیەنن، ئەوانە شتێك فێر دەبون کە زیانی بۆیان هەبو سودێکی پیٚ نەدەگەیاندن، بەڕاستی دەیانزانی هەرکەس کڕیاری ئەم جۆرە کاڵایە بیٚ، لە رۆژی بەرێدا سودێکی پیٚ ناگا، چەند ناحەزو ناپەسەندە، ئەوەی کە خۆیان پیٚ دەفرۆشیٚ، ئەگەر بیانزانیبا ﴾ (سورة البقرة/١٠٢).

**ئایا جادو راستەقانی تێدایە:**

زانایان لەم بابەتە جیا ران، هەیانە دەڵێن: هەر خەیاڵەو هیچ حەقیقەتێکی نیە، ﴿ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى: جا پەتك و

داردەستەکانیان لەبەر جادوەکەیان وایان پیشان دەدا کە دەجمێن و دەڕۆن ⁼ (سورة طه/٦٦).

هەشیانە دەڵێن: بە پێی ئایەتەکەی سورەتی (البقرة) ڕاستەقینەی تێدایە. ڕاستەکەش ئەوەیە جادو دو جۆرە: جۆرێکیان جادوێکە پشت بە فێڵ و تەڵەکەی زانستیو دەستسوکیو خێرا جولانەوە دەبەستێ، جۆرەکەی دیکەش ڕاستەقینەی تێدایەو پیاو ژنی پێ لێك جیا دەکرێتەوەو خەڵکی پێ ئازار دەدرێ..

**جادوکردنی جولەکان لە پێغەمبەر ﷺ:**

لە عائیشەوە (رضي الله عنها) گوتی: (جولەکەیەك لە زورەیقزادەکان، کە ناوی لەبیدی کوڕی ئەعصەم بو جادوی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، تاکو پێغەمبەر ﷺ وای بەخەیاڵدا دەهات شتێکیکردوە کە پێشتر نەیکردبێ، هەتا ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ چەندین جار لە خودا پاڕاوە، پاشان فەرموی: ((یا عائشة اشعرت ان الله افتاني فما استفتيته فيه؟ جاءني رجلان، فقعد أحدهما عند رأسي، والاخر عند رجلي، فقال الذي عند رأسي للذي عند رجلي، او الذي عند رجلي للذي عند رأسي: هۆ عائیشە، هەستت کرد خودای گەورە دوعاکەمی گیراکردو داواکەمی جێبەجێ کرد، دو پیاو هاتنە لام و یەکێکیان لە لای سەرم دانیشت و ئەوی دیکە لەلای پێیەکانم)).

ئەوی لە لای سەرم دانیشتبو بە ئەوی لای پێیەکانمی گوت، یا ئەوی لای پێیەکانم دانیشتبو بە ئەوی لای سەرمی گوت:

ئەم پیاوە چیەتی؟

گوتی: جادوی لێکراوە.

گوتی: کێ جادوی لێکردوە؟

**گوتی: لە بیدی کوڕی ئەعصەم.**

**گوتی: لە چی؟**

**گوتی: لەو تاڵەموانەی لەکاتی داهێنانی پرچ هەڵدەوەرێن لەگەڵ پەلکی دەنکەخورمای نێر.**

**گوتی: جا ئەوە لە کویە؟**

**گوتی: لە بیری ذیی ئەروان.**

**جا عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەخۆیو خەڵکانێك لە هاوەڵانی، چونە سەر بیرەکەو پاشان فەرمووی:** ((یاعائشة، والله لكأن ماؤها نقاعة الحناء ولكأن نخلها رؤوس الشياطين: **هۆ عائیشە سوێند بە خوا ئاوەکەی دەتگوت ئاوی خەنەیەو دارخورماکانیشی وەکو سەرکی شەیتانان بو)).**

**گوتم: جا بۆ نایسوتێنی، ئەی پێغەمبەری خوا؟**

**فەرمووی:** ((لا، أما انا فقد عافاني الله، وكرهت أن اثير على الناس شراً فأمرت بها فدفنت: **نەخێر، خودا منی چاکردەوەو، حەزم نەکرد شەڕێك بۆ خەڵکی بوروژێنم، جا فەرمانم کرد لە بن خۆلیان ناو شاردیانەوە))،** (رواه البخاري ومسلم)

**ناشبێ بگوترێ جادوکردن لە پێغەمبەر ﷺ کاری بەسەر پەیام و پێغەمبەرایەتیدا هەبوە، چونکە شون و کاریگەری جادوەکە لە روکەشی لەشی پیرۆزی تێپەڕنەبو، نەگەیشتە دڵ و هۆشی، بۆیە وەکو هەر نەخۆشیەکی دیکە بوە کە توشی هاتوەو شەرعی خوداش لەلایەن خودای بەرزەوە پارێزراوە، خودای بەرز دەفەرموێ:** ﴿نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ: **بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندوەو بەڕاستی پارێزەی قورئانیشین** ﴾ (سورة الحجر/٩).

### ١٦- لاوازی مرۆڤ:

مرۆڤ خاڵی لاوازی گەلێك زۆر تێدا، كە لە راستیدا نەخۆشین و شەیتانیش ئەم نەخۆشیانە بەناخی مرۆڤدا دەباتە خوارێ، بەڵكو دەیانكاتە دەرگا بۆ چونە نێـو دەرون و نـاخی مرۆڤـەوە، لـەو نەخۆشـیانەش: لاوازی، رەشـبینی، بێهومێـدی، زلفـیزی، بەخۆشـابون، خۆپەسـەندی، شـانازیی، سـتەم، دەستدرێژی، سەهەندەیی، سەركێشی، پەلەكردن، ئاوەز رۆیشتن، هـەرزەیی، رژدی، چروكی، هەتەر بون، مشت ومڕ، دەمەوەڕی، گومان، دودڵی، نەزانی، بێئاگایی، سەرسەختی، لەخۆبایبون، درۆزنی، زەبونی، نەوێری، قرچۆكی، لاملی، یاخیبون، سنور بەزێنی، خۆشەویستنی ماڵ و سامان، گرفتار بون بە دڵنیایی دنیا.. جا ئیسلام بانگەواز بـۆ چاكسـازی دەرون و قوتـاربون لـە نەخۆشیەكانی دەكا، ئەمەش پێویستی بە توانایەك هەیە بۆی خەرج بكرێو، ئاتـاجی ئارامێكـە لـە ئاسـت تەگـەرەكانی رێگـاو، هـەرچی شـوێنكەوتنی ئارەزوەكـان و نەفسـی فەرماندەیـە كـارێكی سـاناو سوكەو، یەكـەمیان وەكـو كەسێكە بـەردێك هـەڵگرێو بـۆ لوتكـەی چیـا سـەری بخـاو، دوەمیـش وەكـو كەسێكە لـە لوتكـەی چیـاوە بـەردێك بـۆ دامێنـی غلۆركاتـەوە، هـەر بۆیـەش بەپیرەوە چونی شەیتانی زیاترەو، بانگبەرانی راستیش زۆر گرانبار دەبن لە بانگەوازیان بۆ خودای بەرز.

ئێمەش هەندێك قسەی پێشینانت بۆ دێنینـەوە، تـا بزانـی شـەیتان چۆن خاڵەكانی لاوازی لە مرۆڤ دەقۆزێتەوە:

موعتەمیری كوڕی سلێمان لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە كە گوتی: (ذكـر لي أن الشيطان الوسواس ينبعث في قلب ابن آدم عند الحزن والفرح، فإذا ذكر الله خنس: بۆم باس كـرا كـە شـەیتانی تیختیخـەدەر لـەكاتی خۆشـیو ناخۆشـیدا لـەدڵی

ئادەمیزاد سەر هەڵدەدا، جا گەر یادی خوا کرا هەڵدێ) (تفسير القرآن/ابن كثير ٤٢٣/٧).

وەهەبی کوڕی مونەبیە دەڵێ: (راهیبێک لەشەیتانی پرسی، ئەوکاتی شەیتان خۆی پیشان دابو؛ کامە رەوشتی ئادەمیزاد زیاتر لەدژی وان یاریدەی تۆ دەدا؟ گوتی: توندوتیژی. ئەگەر بەندە توندوتیژ بو، چۆن منداڵ تۆپ هەڵگێڕوەرگێڕ دەکەن ئێمەش بەو شێوەیە ئەو مرۆڤە هەڵگێڕوەرگێڕ دەکەین) (تبليس ابليس/٤٢). هەر ئیبنیجەوزی لەئیبنیعومەرەوە هێناویەتەوە کە نوح پرسیاری ئەو سیفەتانەی لەشەیتان کرد کە مرۆڤی پێ بەهیلاک دەبا، شەیتان گوتی: (حەسودیو هەتەر بونە) ئەوەشمان لێ دور نیە کە شەیتان بەسەر یوسف و برایەکانی هێناو چۆن دڵی براگەلی لەئاست برای خۆیان رەش کرد، یوسفیش فەرموی: ﴿ وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي: چاکەی لەگەڵ کردم کاتێك لەزندان رزگاری کردم و ئێوەی لەو بیابانەوە هێنا ئێرە، پاش ئەوەی کە شەیتان ناکۆکی لەنێوان من و براکانم سازدا.. ﴾ (سورة يوسف/١٠٠)

### ١٧-ئافرەت و گیرۆدەبون بە دنیا:

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوێنێ، کە لە پاش خۆی هیچ فیتنەیەکی لە ئافرەت توندتری بۆ پیاو جێ نەهێشتوە، بۆیە ئافرەت فەرمانی پێدراوە کە جگە لە رو و هەردو دەستی هەمو لەشی داپۆشێ، پیاوانیش فەرمانی چاوپۆشینیان پێدراوە، پێغەمبەریش ﷺ نەهی کردوە لەوەی ژن و پیاوی نامەحرەم تەنها

پێکەوە بن. ئەوەشی ڕاگەیاندوە هەر پیاو ژنێك دو بەدو جودا بنەوە شەیتان سێهەمیانە. بە ئیسنادێکی صەحیحیش لە سونەنی نەسائیدا هاتوە: ((المــــرأة عورة فإذا خرجت استشــــرفها الشــيطان: ئافرەت شەرمگەیە، ئەگەر چوە دەری شەیتان چاوی تێدەبڕێو سەیری دەکا)).

ئەمڕۆش ئێمە دەبینین چ فیتنەیەکی مەزن بڵاوبۆتەوە، کە زۆربەی ژنان دەچنە دەرێ بەو شێوەیەی پێغەمبەر ﷺ باسی کردون کە پۆشتەی روتن. گەلێك دامەزراویش لەرۆژهەلات و رۆژاوا خۆیان تەرخان کردوە بۆ حستنەگەری پیاو ژنانێکی زور بە برەوپێدانی داوێنپیسی بە وێنەی بینراو، چیرۆکی رۆژنامەی و ئەو فیلمانەی باس لە بێئابڕویی دەکەن و بانگەوازی بۆ دەکەن.

هەرچی خوشویستن و گیرۆدەبونیشە بە دنیا، سەری هەمو گوناهانە، هەر خوێنێك رژاوەو هەر ناموسێك براوەو، هەر ماڵێك داگیرکراوە، هەر دۆستێتیەکی پچڕاوە،... هەموی بۆ دەست خستن و لە خۆگرتنی دنیاو کێشەو ململانێ و هەتەربونە لە پێناو خۆشیو رابواردنە ساختەکانی.

### ١٨- گۆرانی و مۆزیقا:

گۆرانی و مۆزیقا دو رێگەن، شەیتان دڵانی پێ گەند دەکاو دەرونانی پێ کاول دەکا، ئیبنیقەییم دەڵێ: (لەو فێڵ و تەڵەو داوانەی دوژمنی خوا، کە کەسانێکی بێبەش لە زانست و هۆش و دین دوچاریان دەبن و، دڵی نەزان و بێئاگایانی پێ دەداوێ دەخا: گوێگرتنە بۆ فیتەو چەپڵەو، گۆرانی گوتن بەو ئامێرە حەرامانەی بەری دڵان دەگرێ لە قورئانی پیرۆزو، بە یاخیبون و

تاوانكاری خەریكی دەكا. جا ئەوە قورئانی شەیتانەو پەردەیەكی چڕە لە ڕێی خـوادا، نوشـتـەی زینـاو نێربازیـەو. شـەیتان دەرونـە لەكارخـەرەكانی پـێ ڕاوكردوەو بە ئۆین و غروری بۆی ڕازاندۆتەوەو گومانە پوچەكانی خۆی پێ گـەیاندوە. ئـەویش سروشـی شـەیتانی وەرگرتـوەو. بـۆ هـەندێ قورئـانی جێهێشتوە..) (اغاثة اللهفان ١/٢٤٢)، سەیرو سەمەرەش ئەوەیە هەندێك خەڵك بە ناوی پەرستش بە گۆرانیو سەماو خۆبادانێ خەریك دەبن و. واز لە قورئانی خـودا دەهێنـن و، بـۆ گۆرانـی شـەیتانی دەچـن، جـا ئیبنیقـەییم لـە (اغاثـة ٢٥٦/١)دا كۆمەڵە ناوێكی بۆ ئەم گۆیندەییە ژماردوە؛ لەهو و، لەغو و، ناڕەواو، ساختەو فیتەو، چەپڵەو، نوشتەی زیناو، قورئانی شەیتان و، كێڵگەی دەغەڵی لـە دڵان و، دەنگـە دەبەنگەكـەو، دەنگـە بەدڕەوشـتەكەو، دەنگـی شـەیتان و، زوڕنای شەیتان و، خافڵێنەر.

زۆر بەپێشـیدرێژیش باسـی لـە حـەرامكردنیو ئـەو سـاختەو بوختانانـە كردوەكە تیایدان، جا ئەگەر دەتەوێ بگەڕێوە سەری.

١٩- سستی موسڵمانان لە هێنانەدی ئەو فەرمانانەی پێیان دراوە:

ئەگەر موسڵمان بە ئیسلامەكەی پابەند بو، شـەیتان نـاتوانێ گومڕای بكـاو گاڵتـەی پـێ بكا، بەڵام ئەگـەر لـە هـەندێك مەسـەلەدا سسـتیو تەمبـەڵی نوانـد، شەیتان دەرفەتێك دەدۆزێتەوە، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ: ئەی ئەو كەسـانەی بڕواتان هێناوە، هەموتان بڕۆنـە نێو ئیسلام و ئاشتی و، شوێن هەنگاوەكانی شـەیتان هەڵمـەگرن و پـەیڕەوی ڕێبـازی مەكـەن، بەڕاسـتی ئـەو دوژمنێكـی ئاشكرای ئێوەیە ﴾ (سورة البقرة/٢٠٨)، چونـە نـاو ئیسلام لەهەمو مەسەلەیەكدا،

مایەی قوتار بونە لە شەیتان، بۆ نمونە ئەگەر ریزی نوێژکەران رێك بو شەیتان ناتوانی بچێنە نێوانیان. بەڵام کە بۆشایی لەنێوان ریزەکاندا بێت، شەیتانەکان لەنێوان ریزەکاندا سەما دەکەن، لە فەرمودەیەکی پیرۆزیشدا هاتوە: ((أقیموا صفوفکم، لا تتخللکم الشیاطین کأنها اولاد الحذف، قیل یا رسول الله: وما أولاد الحذف؟ قیل جرد (بأرض الیمن): ریزەکانتان راست کەن، با شەیتانەکان نەچنە نێوانتان وەکو بەرخی رەش)) رواه أحمد والحاکم باسناد صحیح) (صحیح الجامع ٣٨٤/١).

لە فەرمودەیەکی تریش دەفەرموێ: ((اقیموا صفوفکم، وتراصوا، فوالذي نفسي بیده إني لأرى الشیاطین بین صفوفکم کأنها غنم عفر: ریزەکانتان راست کەن و، پاڵ وێك دەن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، من شەیتانان دەبینم لە نێوان ریزەکانتان دەڵێی مەری تۆزاوین)) (رواه ابو داود الطیالسي باسناد صحیح)(صحیح الجامع ٣٨٤/١).

## چۆن شەیتان دەگاتە ناخی مرۆڤ

**وەسوەسە:**

شەیتان دەتوانێ بگاتە بیرو دڵی مرۆڤ. بەشێوازێکی وا کە ئێمە پەی پێ نابەین و نایزانین، ئەو سروشتەی کە لەسەری ئافەریدکراوە بۆ هەندێ یارمەتی دەداو هەر ئەوەیە کە ئێمە بە وەسوەسە ناوی دەبەین، خودای بەرزیش ئەوەی پێ راگەیاندوین کە ناوی ناوە ﴿ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ۞ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴾ (سورة الناس/٤-٥)، ئیبنیکەثیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: (الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ) بریتیە لە شەیتان کە لەسەر دڵی مرۆڤ دانیشتوە، ئەگەر خافڵ و بێئاگا بێ وەسوەسە دەکاو، ئەگەر یادی خوداش بکا شەیتانەکە هەڵدێ.

لە صەحیحی بوخاریشدا چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إن الشيطان يجرى من ابن آدم مجرى الدم: شەیتان لە مرۆڤدا بە راڕەوی خوێن دادەچێ)).

هەر بەو وەسوەسەیە ئادەمی گومڕا کردو بۆ خواردنی دارەکەی فریوی دا: ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَاآدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَ يَبْلَى: شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیو گوتی: هۆ ئادەم ئەو دارەت پێ نیشان دەم کە مایەی جاویدانی و موڵکێکی لە بن نەهاتوە ﴾ (سورة طه/١٢٠).

رەنگە شەیتانەکانیش خۆ بەوێنەی مرۆڤ رانوێنن و، رەنگە لەگەڵ مرۆڤ بئاخێون و دەنگی بدەن و فەرمان و نەهی بەویستی خۆیان پێ بدەن، هەروەکو باسی دەکەین.

# بەندی چوارەم

## خۆ رانواندنی شەیتانان

## هێنانی گیانان

## جنۆکەو پیوارزانی

## جنۆکەو دەفرەفڕیوەکان

# خۆ رانواندنی شەیتانان

هەندێك جار شەیتانەكان بەرێگەی وەسوەسە بۆ مرۆڤ نایەن، بەڵكو لە وێنەی مرۆڤ خۆ نیشان دەدەن، یا دەنگەكە دەبیستیّ و رەنگەكە نابینی، یا بە وێنەی سەیرو نامۆ شێوە دەگۆڕن.. هەندێك جار دێنە لای خەڵكی و پێیان دەڵێن لە جنۆكانین، جاریش هەیە درۆ دەكەن و دەڵێن لە فریشتانین، واش دەبیّ بە پیاوانی پەنهانی خۆ ناوزەد دەكەن یا دەڵێن ئێمە لە جیهانی گیانانداین..

جا بەم هەمو شێوازە كۆمەڵە خەڵكێك دەدوێنن و، یا راستەوخۆ قسەیان لەگەڵ دەكەن، یا بەهۆی كەسێكی كە بەنێوەند نێودەبریّ و شەیتانەكە دەچێتە بەری‌و لەسەرزاری وی قسان دەكاو، رەنگە وەڵامەكانیش بە نوسین بیّ..

واش دەبیّ لەمانە زیاتر بكا، مرۆڤ هەڵگریّ‌و بە ئاسمانێدا بیفڕێنیّ‌و لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر رایگوازیّ‌و رەنگە چی بویّ بۆی بێنیّ، بەڵام ئەو كارانە تەنها بۆ كەسانێكی گومڕا ئەنجام دەدەن كە كوفر بكەن بەخودای پەروەردگاری زەوی و ئاسمانان، یا گوناھ و تاوانی زل و گەورە ئەنجام بدەن، وا دەبیّ لە روكەش و رواڵەت ئەوانە خۆشیان بە چاكەكار و خۆپارێز پیشان بدەن، كەچی لەڕاستیدا گومڕاترین و بیّ‌دین ترین خەڵكن، زاناكانی پێشان و ئێستا زۆریان لەم بابەتە باس كردوە، كە بواری وەدرۆخستنەوەی تێدا نیە، چونكە گەیشتۆتە پلەی تەواتور.

لەوانە باسێك هەیە ئیبنی‌تەیمیە لە حەللاجەوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: (کابرایەکی کیمیازان بو، شەیتانەکانیش جار جارە خزمەتیان دەکرد، جارێك هێندێك لە شوێنکەوتوانی لەسەر کێوی ئەوبو قوبەیس لەگەڵیدا بون، داوای شیرینییان لێکرد، ئەویش چوە جێیەکی نێزیك و لەگەڵ شیرینیەکی هێنا، کارەکەیان ئاشکرا کرد، دیتیان ئەو لەگەڵ شیرینیە لە دوکانێکی شیرنەمەنی لە یەمەن دزرواە، شەیتانی ئەو ناوچەیە بۆی هێنا بو).

دەڵێ: (شتی لەم بابەتە بەسەر زۆران کەسی بێجگە لە حەللاجیش دێ کە حاڵی شەیتانیان هەیەو، ئێمەش زۆر لەوانەی هی سەردەمی خۆمان و پێشەخۆشمان دەناسین، وەکو کەسێکی کە ئێستا (لەسەردەمی ئیبنی‌تەیمیە) لە دیمەشقە، شەیتان لە کێوی صاڵحیەوە هەڵی دەگرت بۆ گوندێکی دەوروبەری دیمەشق، جا هەر بە حەوایدا دەهاتە تاقی ئەو ماڵەی خەڵکی تێدا بو، دەهاتە ژورێ‌و ئەو خەڵکەش دەیانبینی، شەوانەش دەهاتە دەرگەی بچوك (کە یەکێکە لە شەش دەرگەکانی دیمەشق لەو زەمانی)، جا بە خۆی‌و بە هاوڕێیەکەی لێی دەپەڕینەوە.

یەکێکی دیکەشیان لە قەڵاتی شۆبەك بو کە دەکەوێتە دەوروبەری شام لە گوندێکی کە پێی دەڵێن (ئەلشاهیرە)، ئەویش بەحەوایدا دەفڕی تا ترۆپکی چیاو، خەڵکیش هەمو دەیاندیت، شەیتان هەڵی دەگرت و ڕێگەشی دەبڕی.

ئەوانە زۆربەیان شێخی بەدکارین، یەکێکیان ناوی (ئەلبەوشی ئەبی‌موجیب) بو، لە تاریکە شەوێدا (خرکاە)* یان بۆ دەچەقاند، وەکو نێزیك بونەوە نانیان بۆ دەکرد نەناوی خودایان دەهێناو نەکەسیشیان لەلا دەبو یادی خودا بکا، نەکتیبێك ناوی خودای تێدا هاتبێ، ئەوجا ئەو بەوشیە بۆ ئاسمانێ

* لەمیچ فەرهەنگێکی بەردەست مانای ئەم وشەیەم چنگ نەکەوت

بەرز دەبوّوە، خەڵکیش دەیانبینی، دەیانبیست کە شەیتانی دەدواندو شەیتانیش ئەوی دەدواند، جا هەر کەسێکی پێکەنیبا یا لە نانەکەی بدزیبا، دەفەکە لێی دەدا، کەسیش نەیدەدیت کێ دەفەکەی بە دەستەوەیە.

پاشان شەیتان هەندێك پرسیاری وەڵام دەدانەوەو، فەرمانی پێ دەکردن چێل و وڵاخی بۆ بکەنە قوربانی و بەخنکاندن بیخنکێنن و ناوی خودای لەسەر نەهێنن، جا ئەگەر وایان بکردبا، کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکردن.

هەروەها ئیبنیتەیمیە دیسان باس دەکا: (کە شێخێك بە خۆی بۆی گێڕاوەتەوە کە لەگەڵ ژناندا زینای کردوەو لەگەڵ پارچەڵان نێربازی کردوە، جا دەیگوت: سەگێکی رەش دەهاتە لام کە دو پنتکی سپی لە نێو چاوان هەبو، پێی دەگوتم: فلانی کوڕی فلان نەزرێکی بۆ تۆ لە خۆگرتوەو سبەینێ بۆتی دەهێنن و منیش لەبەر تۆ پێویستیەکەیم بۆ جێبەجێ کردوە، جا سبەینی کابرا نەزرەکەی بۆ دەهێنیّو، ئەو شێخە بێبڕوایەش موکاشەفەی دەکا).

دیسان لەبارەی هەمان شێخەوە باس دەکا کە گوتویەتی: (ئەگەر داوام لێکرابایە شتێکی وەك کەتیرە بگۆڕم، هەر دەمگوت هەتا بێهۆش دەبوم، هێندەم دەزانی کەتیرەکە دەهاتە ناو دەستم یا ناو دەوم بێ ئەوەی بزانم کێ دایناوە.

دەڵێ: بەڕێدا دەڕۆیشتم و کۆڵەگەیەکی رەشم لە پێشدا بو کە روناکی پێوە بو.

دەڵێ: جا کاتێك ئەو شێخە ژیوان بۆوەو دەستی بە نوێژو رۆژییان کردو خۆی لە حەرام پاراست، سەگە رەشەکە جێی هێشت و گۆڕینەکەش نەماو نەکەتیرەی بۆ دەهێناو نە هیچی دیکە.

هەروەها لە بارەی شێخێکی دیکە بۆمان دەگێڕتەوە کە هەندێك شەیتان هەبو دەیناردن تاکو خەڵکانێك توشی فێ بکەن، جا خانەوادەی ئەو فێداره

دەهاتنە لای شێخەکەو داوایان لێ دەکرد چایکاتەوە، ئەویش دەینارده لای شوێنکەوتەکانی تا لە فێدارەکە جودا ببنەوە، جا خەڵکەکە بۆ ئەم مەبەستە پارەو ماڵێکی فرەیان بە شێخەکە دەدا، جاری واش هەبو جنۆکە پارەو خواردنیان لە خەڵکی دەدزی‌و بۆیان دەهێنا، تەنانەت خەڵکێك هەندێك هەنجیریان لە نێو قەرتارەیەکیدا هەبو، کە شێخ داوای هەنجیری لە شەیتانەکانی دەکرد، لەو هەنجیرەیان بۆ دەهێنا، کە خاوەن هەنجیر سەیری قەرتارەکەیان دەکرد هەنجیرەکان نەمابون.

لە بارەی یەکێکی دیکەش دەڵێ: کە خەریکی زانست و زانیاری بو شەیتانەکان هەڵیان خەڵەتاندو پێیان گوت: ئێمە نوێژت لەسەر لا دەدەین و هەرچی بتەوێ بۆتی دەهێنین، وای لێهات شیرینی‌و میوەیان بۆ دەهێنا، تاکو هاتە لای شێخانێکی شارەزا لە سوننەت، ئەمیش تۆبەی پێکردو، نرخی ئەو شیرینیەشی دا بە خاوەنیان، کە هەڵخەڵەتاوەکە خواردبوی (جامع الرسائل لابن تيمية/ص ١٩٠-١٩٤).

هەروەها هێندێك رێچکەی دیکەی شەیتانی خستۆتە رو کە شەیتان بۆ فریودان دەیانگرێتە بەر، جا لە (مجموع الفتاوى ١١/٣٠٠)دا دەڵێ: (من یەکێك دەناسم روەکەکان پێی دەڵێن بۆچی سودیان هەیە، کەچی ئەوە روەکەکە نیە، بەڵکو ئەو شەیتانەیە کە چۆتە ناوی، کەسانی دیکەش دەناسم کە داروبەرد لەگەڵیان دەئاخێون و دەڵێن نۆشی گیانت بێ ئەی دۆستی خوا، بەلام کە ئایەتولکورسی دەخوێنێ ئەمە دەرواو نامێنێ، هەروەها هی دی دەناسم بۆ راوی باڵندە دەچێ، کەچی کێشکەو باڵندەکانی‌تر دەیدوێنن و دەڵێن: بمبە تا هەژارەکان بمخۆن، دیارە ئەوە شەیتانە چۆتە ناویان هەروەکو دەچنە نێو مرۆڤیش و ئاخاوتنەکەش لەویەوەیە، ئی واش هەیە لە ماڵی خۆی دانیشتوەو دەرگەی گاڵە داوە، کەچی بێ ئەوەی دەرگە بکرێتەوە خۆی لە دەرێ دەبینی یا

به پێچەوانە، هەروەها بە گوێرەی دەرگاکانی شار، جنۆکەن بە خێرایی دەیبەنە ژوریێو دەیهێننە دەرێ، یا تیشك و روناکی پێدا تێپەڕدەبێ، یان هی وای دێتە لا کە بەخۆی داوایان دەکا، دیارە ئەوەش لە شەیتانانەوەیە کە خۆ دێننە سەر شێوەی هاوەڵەکەی، جا ئەگەر چەند جار بەدوای‌یەك ئایەتولکورسی خوێند ئەمە هەموی دەڕواو نامێنێ.

هەروەها ئیبنی‌تەیمیە دەڵێ: (کەسانی دیکە دەناسم یەکێك لەگەڵی داخێویێو پێی دەڵێ: من لە فەرمانی خوادام، بەڵێنی دەداتێ کە ئەو مەهدیەیە پێغەمبەر ﷺ موژدەی پێ داوە، جا شتی سەراسای بۆ دەردەخا، وەك ئەوەی هەڵس و کەوتی باڵندەو کلۆی ئاسمانی بە دڵیدا دێنێ، ئەگەر وای هاتە دڵ کە باڵندەکە یا کلۆیەکە بەرەو لای راست یان لای چەپ دەڕوا، بۆ ئەو لای دەچێ کەئەو دەیەوێ، یا ئەگەر هەستان یا نوستن یا رۆیشتنی هەندێك مالاتی بە دڵیدا هات ئەوەی بەسەر دێت کەئەو دەیەوێت، بێ ئەوەی لەرواڵەت هیچ جوڵەیەك لە کابراوە روی دابێ، هەروەها بەرەو مەککە هەڵی دەگرێ و دەیهێنێتەوەو، کەسانێکی بە وێنەی جوان دێنێتە لا و پێی دەڵێ ئەوانە فریشتەن و بۆ سەردانی تۆ هاتون، کە لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئەوانە چۆن خۆیان هێناوەتە سەر شێوەی لوسکان؟! جا سەری بڵند دەکا دەبینی ردێنیان هەیە، هەروەها پێی دەڵێ: نیشانەی ئەوەی کە تۆ (مەهدی)ی خاڵێك لە جەستەت شین دەبێ، جا خاڵەکە دەڕوێ و دەشیبینێ و شتی دیکەشی بەسەردا دێو، هەموشی لە تەڵەکە و فێڵی شەیتانە).

هەروەها ئیبنی‌تەیمیە لە (٤١/١٩)دا رونی کردۆتەوە (ئەو گومڕاو بیدعەکارانەی دونیا نەویستی و پەرستشی دور لە روی شەرعییان لێ بەدی دەکرێ و، هەندێ جار کەشف و کاریگەرییان هەیە، زۆر جار پەنا دەبەنە بەر شوێنگەی شەیتانان، کە بەرهەڵستی کراوە نوێژیان لێ بکرێ، چونکە لەوان

شوێناندا شەیتانەکان دادەبەزنــە ســەریان و لەگــەڵیان دەئـاخێون لــە هــەندێك مەسەلەی وەك ئەوەی کە لەگەڵ کاهینەکاندا دەدوان و، هەروەکو دەچونە نێو بتان و قسەیان لەگەڵ بتپەرستان دەکردو، لە هەندێك پێداویستی هاریکاریان دەکــەن هــەروەك یــاریدەی جادوگــەرانیان داوە، هــەروا وەك یــاریدەدانی بــۆ بتپەرست و ڕۆژو مانگ و هەسارەپەرستان، کە هەندێك پەرستشیان بۆ ئەمانە ئەنجام دا خۆیان پێیان گونجاو بو، وەك پاکیکردن و جلوبەرگ و بخورو جگە لەمانەش؛ جا ڕەنگە هەندێك لە شەیتانانیان دابەزنە سەریْ کە بە ڕۆحانیەتی هەسارەکان ناوزەدیان دەکەن و ڕەنگە هەندیْ ئاتاجیان بۆ جێبەجیْ بکەن).

**ئەوانەی شەیتانەکان ڕازەیان دەکەن، بە هۆی تاوانان لێیان نێزیك دەبنەوە:**

ئەوانە باســی وەلییــاتی دەکــەن و لەڕاســتیدا شــەیتانەکان ڕازەیــان دەکــەن بەوان شتانە کە شەیتان حەزی لیْ دەکەن وەکو بێبڕوایی‌و شیرك و لەشەیتانان نزیك دەبنەوە، تاکو هێندێك پێداویستییان بۆ جێبەجیْ بکەن، ئیبنی تەیمیە لە (مجموع الفتاوی ۳۵/۱۹)دا باسی کردوە کە زۆر کەس لەوانە فەرمایشتی خودا بە پیسایی دەنوسن و، ڕەنگە پیتەکانی فەرمایشتی خودا هەڵگێڕنەوە، جا یان پیتەکانی سورەتی فاتیحە، یان پیتەکانی (قل هو الله احد)، یا بێجگەلەوانە. باس لەوەش دەکا کە ئەوانە فەرمایشتی خودا بە خوێــن یــا پیســایی دیکــە دەنوسنەوە، یان شتی دیکە دەڵێن یان دەنوسن کە شەیتان ڕازی دەکا.

جا کاتێك ئــەو شــتانەیان گــوت یــا نوســیان کــە شــەیتانەکان پێــی ڕازیــن، ئەوانیش هەندێك پێداویستی بۆ جێبەجیْ دەکەن، وەك: نغرۆ بونی ئاویْ یا هەڵگرتنی بە حەوایدا بۆ هەندێك شوێنان، یان هەندێك پارەو ماڵی خەڵکی بۆ دێنن، هــەروەك شــەیتانەکان لــە مــاڵی خیانــەتکاران دەیــدزن دەیــهێنن، لەگــەڵ ئەوانەی کە ناوی خودایان لەسەر نەهاتوەو یا شتی دیکەیان بۆ دەکەن.

**پیاوانی پیوار:**

راڤەکاری طەحاوی دەڵێ: (جۆرێك لە شەیتانان هەن خەڵك بە پیاوانی پەنهان ناویان دەنێن و، خەڵکانێك هەن دەیاندوێنن و ئەوانەش شتی سەراسایان لێ رو دەدا، جا دەڵێن لە دۆستانی خودان، هەندێکیش لەوانە هاریکاری موشریکان دەکەن دژی موسڵمانان و، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداوە لەگەڵ موشریکان دژی موسڵمانان بجەنگێ، چونکە موسڵمان یاخیو گوناهبار بون).

لە دوای ئەوەش راڤەکاری طەحاوی دەڵێ: (لەڕاستیدا ئەوانە براگەلی موشریکانن، باسی ئەوەشی کردوە کە خەڵکی زانا لە بارەی پیاوانی پیوارەوە سێ کۆمەڵن:

١) کۆمەڵێك بونی پیاوانی پیوار وەدرۆ دەخەنەوە، بەڵام خەڵکی بە چاو دیویانن، لە کەسانێکیش سەلماوە کە دیویانن، یا لە کەسانێکی متمانەدارەوە بیستویانە کە دیویانە جا ئەوانە ئەگەر بیانبینن و لە هەبونیان دڵنیا بن، ملیان بۆ کەچ دەکەن.

٢) کۆمەڵێکیش هەن دەیانناسن و، بۆ قەدەر دەگەڕێنەوەو، بیرو باوەڕیان وایە کە بێجگە لە رێی پێغەمبەران، لەباطیندا رێیەکی دیکەش هەیە بۆ خودا.

٣) کۆمەڵێکیش هەن نەیانتوانیوە دان بە هیچ وەلی و دۆستێکدا بنێن بەدەر لە بازنەی پێغەمبەرێتی، ئەوانە دەڵێن: پێغەمبەر هەر موحەممەدە بۆ هەر دو تایەفە، جا ئەوانە پێغەمبەر بەمەزن دەگرن بەڵام ناشارەزاو نەفامن لە دینەکەی.

پاشان حەقیقەتی ئەوانەو شوێنکەوتوی ئەوانەی رون کردۆتەوە؛ راستی وایە کە ئەوانە شوێنکەوتەی شەیتانانن و پیاوانی پەنهانیش جنۆکەن، بەڵام

به پیاوان ناو دەبرێن، هەروەکو خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾: وە زۆر کەس لە ئادەمیان پەنایان دەبردە بەر جنۆکان کە بیانپارێزن، کەچی زێتر ماندویان دەکردن ﴾ (سورة الجن/٦).

هەرچی مرۆڤیشە هەمو دەبینرێن و، ئەگەر جارجارە پەردە پۆش و بزربن، بەلام بە بەردەوامی لە چاوی خەلکی بزرنابن، جا هەر کەس بە مرۆڤیان تێ بگا، بە هەلەدا چوەو فامکالە.

پاشان هۆی جیاڕایی ئەو سێ کۆمەلەی رون کردۆتەوە کە بریتیە لە جیاوازینەکردن لە نێوان دۆستانی شەیتان و دۆستانی خوداو، لەنێوان ئەوەی کە دەبێ کردەو گۆتەو باری خەلکی بەقورئان و سوننەت هەلسەنگێنرێ، جا ئەوی دەگەلیان رێك کەوت کارێکی چاکەو، ئەوەی پێچەوانەشیان بو کارێکی خراپە، مرۆڤیش هەرچی کردو چی نیشان دا، نابێتە بڕوادار و دۆستی خودا، ئەگەرچی بەحەوایدا بفرێو لەسەر ئاوێ بڕوا، هەتاکو پابەندی قورئان و سوننەت دەبێ. (شرح العقيدة الطحاوية ٥٧١-٥٧٢).

جا پێویستە بەندە ئەو تەرازوەی لەلا بێ کە دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان و چاکان و خراپانی پێ هەلسەنگێنێ و لێکدیان جوایەز بکاتەوە، دەنا بەهەلەدا دەچێو گومڕا دەبێو، دوژمنانی خودا بەدۆستی تێدەگا، ئەو تەرازوەش قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، جا ئەگەر بەندە پێیانەوە پابەند بو باشە، ئەگینا ئەو کەسە لەسەر هیچ شتێك نیە، تەنانەت ئەگەر ببینین مردوان زندی کاتەوەو، کانزای بێبەها بکاتە کانزای دەگمەن و گرانبەها. ئیبنی تەیمیە رحمه الله لە (جامع الرسائل ص ١٩٧)دا دەلێ: ئەوەی حالە خوداییەکانی جودا نەکردنەوە لە حالە دەرونیەکان، حەق و ناحەقی لێ تێکەل

دەبێ. هەر کەسێکیش خوای گەورە دڵی بە حەقیقەتی ئیمان و شوێنکەوتنی قورئان روناك نەکردەوە، ئەوا رێی حەقخوازو ناحەقخوازانی لێ ون دەبێ‌و کاروباری لێ تێکەڵ دەبن، هەروەك حاڵی موسەیلەمەی یەمامەو درۆزنەکانی دی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد لە خەڵکی تێکەڵ بو.

هەروەها ئیبنی‌تەیمیە کتێبێکی مەزنی داناوە کە ئەگەر تێیدا شارەزا بوی هەست بە جیاوازی گەورەی نێوان دۆستانی خوداو دۆستانی شەیتان دەکرێ، بە شێوەیەك پاش هەنگی چی‌دیکە کاروباری دۆستانی شەیتانت لێ تێکەڵ و ون نابێ، ناویشی لە کتێبەکەی ناوە (الفرقان بین اولیاء الرحمن واولیاء الشیطان).

### حوکمی بەکارهێنانی جنۆکان:

ئەوەی ئاشکرایە خودا وەڵامی سلێمانی داوتەوەو موڵکێکی داوەتێ لە پاشەوی بۆ کەس نەبوە، جا ئەگەر جنۆکەیەك گوێڕایەڵی یەکێك لە مرۆڤانی کرد، ئەوە بەشێوەی خستنە ژێربارو رامکردنی نیە، بەڵکو بەرەزامەندی جنۆکەکەیە، بەڵام ئایا دروستە؟ ئیبنی تەیمیە لە (مجموع الفتاوی ٣٠٧/١١)دا دەڵێ:

### جنۆکە چەند بارێکیان لەگەڵ خەڵکیدا هەیە:

هەر مرۆڤێك فەرمان بە جنۆکان بدا فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی لە بەتەنیاپەرستنی خوداو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی و، هەروەها ئەم فەرمانانە بە مرۆڤیش بدات، ئەو کەسە لە چاکترین دۆستەکانی خودایەو بەم کارەی دەبێتە جێنشین و نوێنەری پێغەمبەر ﷺ.

هەر کەسێکی جنۆکەش لەوکارانە بەکاربێنێ کە بۆی موباحە، وەکو ئەو

کەسە وایە لە کاری موباحدا مرۆڤ بەکاربێنێ، وەك ئەوەی فەرمانیان پێ بکا بەو شتانەی لە سەریانە و بەرهەڵستییان لێ بکا لەوشتانەی کە پێیان حەرامەو، بەکاریان دێنێ لەوشتانەی بۆی موباحە، بۆیە لە پلەو پایەی ئەو پاشایانە دەبێ کە لەم جۆرە کارانە دەکەن، جا ئەگەر ئەوەش لە دۆستانی خودا بو دەبێ لە تێکڕای دۆستانی خوادا بێ، وەك پەیامبەری پاشا، لەگەڵ بەندەی رەوانە کراوە، وەکو: سلێمان و یوسف لەگەڵ ئیبراهیم و موساو عیساو موحەممەد (علیهم الصلاة والسلام).

هەر کەسێك جنۆکە بەکار بێنێ لەو کارانەی کە خوداو پێغەمبەرەکەی نەهییان لێ کردوە، جا لە شیرك بێ یا لە کوشتنی کەسێك بە ناحەق، یا لە دژایەتیەکی بێکوشتن وەکو نەخۆش خستن و زانست بیربردنەوەو جۆری دیکەی ستەم، یا بۆ داوێن پیسی وەکو هێنانی یەکێك کە داوای داوێنپیسی لێبکا، ئەوە کۆمەکخوازی لێ کردوە بۆ خراپەکاری و دوژمنایەتی، پاشانیش ئەگەر بۆ کوفر کۆمەکخوازیان لێبکا، کافر دەبێ، بۆ گوناهان کۆمەکیان لێ بخوازێ یاخیو گوناهکار دەبێ؛ جا یا لە دین دەردەچی یا توشی تاوانباری دێ.

بەڵام ئەگەر زانستێکی شەرعی تەواوی نەبو، کۆمەکخوازیشی لێکردن بۆ هەندێك شتی کە بەکەرامەتیان تێ دەگا، وەکو ئەوەی بۆ حەج کردنی یارمەتی بدەن، یان لەکاتی گوێندەیی بیدعەدا بیفڕێنن، یا خود بەرەو عەرەفات هەڵی بگرن و، ئەو حەجە شەرعیە نەکا کە خوداو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێداوە، یا لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە هەڵی بگرن، ئەوە لە خۆبایی بوەو فێڵیان لێ کردوە.

# هێنانی گیانان

لەم سەردەمەی ئێمەدا باسی هێنان و ئامادەکردنی گیانان بۆتە بنێشتە خۆشکەی سەرزاران، کەسانێکی زۆریش لەوانەی خەڵك بەزاناو هۆشمەندیان تێدەگەن باوەڕیان پێهێناوە.

ئەو گیان هێنانەی باسیش دەکرێ، یەك جۆرو ڕێگەی نیە، هی وای تێدایە درۆی ڕاشکاون و فروسمانی دەرونیو جیاوازی تێدا بەکار دێ، لەگەڵ هەندێك فێڵی زانستی، هی واشی تێدان بەکارهێنانی جنۆکەو شەیتانەکانە.

مامۆستای دکتۆر موحەممەد موحەممەد حوسین لە کتێبی (الروحیة الحدیثة)دا، گەلێك تەڵەکەبازیو ساختەکاری ئەوانەی ئاشکرا کردوە، ئەوانە تاقیکردنەوەکانی خۆیان تەنیا لەژێر تیشکێکی کزی سور ئەنجام دەدەن، دیاردەکانی بەرجەستە کردن و دەنگی ڕاستەوخۆو گواستنەوەی تەنەکان و جوڵاندنیان لە تاریکاییەکی نوتەکدا ڕودەدەن، بۆیە چاودێر ناتوانێ بزانێ شوێنی دانیشتوەکان لە کوێیەو سەرچاوەی دەنگەکان لە کاملایە. هەروەها ناتوانێ بە شوێنەکە ئاشنابێو نازانێ دیوارەکان یا دەرگەکان یان پەنجەرەکان چۆنن.

هەروەها دکتۆر موحەممەد لە بارەی (حەشارگە) دواوە کە ژورێکی لاوەکی دابڕاوە لە ئامادەبوان یا بەشێکی ئەو ژورەیە کە لێی دانیشتون، بەڵام بە پەردەیەکی چڕ جودا کراوەتەوە، جا ئەو کەلێنە جیاکراوەیە بۆ هەندێ ئامادەکراوە تا ئەو پێناوەی لێ دانیشێ کە دیاردە هەڵبەستراوەکانی

بەرجەستەکردنی لە سەردەستان رودەدا، جا لەو شوێنەی کە بێجگە لە تاریکی بە پەردەش داپۆشراوە گیانە بەرجەستەبوەکان دێنە دەرێ و، پاش کەمێکیش هەر بۆ ئەوێ دەگەڕێنەوە، ئامادەبوانیش بۆیان نیەو ڕێگەیان پێ نادرێ دەست لە خێوەکان بدەن.

جا دکتۆر وا دەبینی کە گیانیەکان لەو کەشە تاریکەدا کالآیەکی زانستییان لەبەر نابڕێ تاکو بیکەنە بەر بالآی فیڵ و تەڵەکەکانیان، ساختەکاری و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی بەفێڵ وتەڵەکان لە زوەوە ناسراوەو مرۆڤ وشەیتانەکان بەندەکانی خودای پێ گومڕا دەکەن، لەنێوخەڵکیدا داوای بەرچاویو ڕێز دەکەن، هەروەکو داوای پارەش دەکەن.

ئیبنی تەیمیە لە (مجموع الفتاوی ٤٥٨/١١)دا، باسی تیپێکی سەردەمی خۆی دەکا کە بە (البطائحیة) ناو دەبران، ئەوانە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە زانستی پەنهان و کەشفیان پێیە، هەروەك دەیانگوت کە بە خۆیان پیاوانی پەنهان دەبینن و بە خەڵکیشی پیشان دەدەن، پاشان هەندێك لە فرت و فێڵیان ئاشکرا بو، چونکە هەندێك ژنیان بۆ هێندە مالآن ڕەوان دەکرد، تاکو هەواڵی حاڵی نادیاری ئەوماڵەیان بۆ بێنن، ئەوجا ئەوانەیان بۆ خاوەن ماڵەکە ئاشکرا دەکردو دەیانگوت؛ ئەمە لەو کارانەیە کە بەتەنێ ئەوان بۆیان هەیە سەری پێدا بگرن.

بەڵێنیان بە پیاوێك دا کە بەتەمای مولکیان کرد بو پیاوانی پیواری پێ پیشان بدەن، جا داری درێژیان دروست کرد، خەڵکێکیان دانا لەسەری بڕوا وەکو ئەوەی بە گۆی شوشە گەمەی بکا، وایان کرد بەسەر کێوی (المزة)دا بڕوا، ئەو هەڵخەڵەتاوەش لە دورڕا دەیدیت خەڵکانێك لەدەوری کێوەکە دەسوڕێنەوەو پێیەکانیشیان لەزەوی بەرزن، جا پارەو ماڵێکی زۆریان لێستاندو، لەدوایش مەسەلەکەی بۆ ئاشکرا بو.

ساختەیان لەگەڵ یەکێکی دیکەش کرد کە ناوی (قەفجەق) بو، پیاوێکیان ناردبوە ناو گۆڕەکی و قسەی دەکرد، وایان تێگەیاند کە مردو قسان دەکەن، جا هێنایانە گۆڕستانەکانی (باب الصغیر) بۆلای پیاوەکەو نزیکیان نەخستەوە، بەڵکو هەر لەدورڕا تاکو بەرەکەتەکەی بەسەردا بڕژێ! وە گوتیان ئەوە داوای کۆمەڵە پارەیەکی کردوە، قەفجەق گوتی: شێخ کەشفی پەنهانی هەیەو دەزانێ گەنجینەکانی من هێندەیان تێدا نیە، جا قەفجەق نزیك بۆوەو موەکەی راکێشاو ئەو پیستە بزنە هەڵقەنا کە لە پیستی کابرایان چەسپ کردبو.

هەروەها دکتۆر موحەممەد موحەممەد حوسێن دەڵێ: پێناو کەسێکەکە گیانییان دەڵێن ئامادەییەکی ڕێختی تێدایە دەیرەخسێنێ تا ببێتە ئامڕازێك لەویڕا پێوەندی بکرێ، زۆربەی کات ئەو پێناوە فێڵ وتەڵەکەبازێکی گەروەو ساختەچیەکی نەقۆڵا دەبێ، ئەوەشی ئاشکرا کردوە کە چۆن زۆر لەو پێناوانە نە ئاکاریان هەیە نە ئایین، بەڵکو گیانیەکان هیچ لەو شتانە بۆ پێناو بەمەرج ناگرن، کارەساتێکیشی باس کردوە راستەوخۆ بەسەر خۆیدا هاتوە، پاش لێکۆڵینەوەی بابەتەکەش لای رون بۆتەوە کە پێناوەکە ساختەچیو تەڵەکەبازو درۆزن بوە.

هەروەك ئەوەی رون کردۆتەوە کە هەندێك لە ئامادەبوان لەگەڵ گیانهێنەکان رێك کەوتون و چۆن وە ئاگادەبن لە هەڵبژاردنی ئەوان کەسانی رێگەیان پێدەدرێ لەم جۆرە کۆڕانە ئامادەبن و چۆن بیانو پاساو بۆ کەوتنەکەیان، دێننەوە، کاتێك کەسانێکی زیرەك و هۆشمەند لە نێو ئامادە بواندا بن.

### بەکارهێنانی جنۆکەو شەیتانان:

هەروەها دکتۆر موحەممەد موحەممەد حوسێن بە درێژی لە بارەی رێگەی یەکەم دواوە، کە گیانیەکان وا هەڵدەبەستن کە گیانەکانی پێ دەهێنن کە

ڕێگەی ساختەکاریی و درۆو بەکارهێنانی ئاوازی کاریگەری دەرونی و فرت و فێڵی زانستیە.

هەر تەنها ئاماژەیەکیشی بۆ ڕێگەی دوەم کردوە، کە بریتیە لە بەکارهێنانی جنۆکەو شەیتانان، منیش وای بۆ دەچم زۆرینەی بانگەشەکانی هێنانی گیانان لەم جۆرەیە.

**هێنانی گیانان بانگەشەیەکی کۆنە:**

بەم شێوەیە دەزانین ئەم بانگەشەیە نوێ نیە، بەڵکو کۆنەو یەکجار کۆنیشە، پێشتر باسی ئەوەشمان کرد چۆن هەندێك خەڵك پەیوەندییان بە جنۆکان دەکرد، بەڵکو کتێبە متمانەدارەکان باسی ئەوان کەسانەمان بۆ دەکەن کە دەڵێن گیانی مردوان پاش مردنی بۆ ژیان دەگەڕێتەوە، ئیبنی تەیمیە لە (جامع الرسائل ١٩٤-١٩٥)دا دەڵێ: (خاوەن حاڵەشەیتانیەکان لە بێبڕواو موشریکان و جادوگەران و هاوەشێوەی ئەوان، هی وایان تێدایە ئەگەر یەکێکیان لێ بمرێ، بیرو باوەڕیان وایە لە پاش مردنی دێتە لایان و لەگەڵیان دەئاخێوێ و قەردەکانی خۆی دەداتەوەو، ڕاسپاردەکانی لای بۆ خاوەنەکانی دەگێڕتەوەو وەسیەتیشیان بۆ دەکا، بەهەمان ئەو شێوەیەی زیندێتی دێتە لایان، جا ئەوە شەیتانە لەوێنەی وی خۆی ڕانواندوەو، ئەوانیش وا گومان دەبەن کە خۆیەتی).

**ئەزمونی هاوچەرخێك:**

ئەم ئەزمونە بەسەر ئەحمەد عیززەدینی بەیانونی نوسەردا هاتوە، لەکتێبی بڕوا بەفریشتان باسی کردوەو، منیش بە چاکم زانی بە دەقی خۆی ڕایگوێزم، لەم بابەتە دەڵێ:

ئەو باسە هەڵبەستراوەی هێنان و ئامادەکردنی گیانان دەمێك بو لە ڕۆژاواو

رۆژهەڵات بیری خەڵکی خەریك کرد بو، جا بەزمانی جیاجیا زۆر وتاری لە بارە نوسران و لە گۆڤارە عەرەبیو بیانیەکان بڵاوکرانەوە، هەروەها گەلێك کتێبی لەبارە نوسراون و، تۆژەران لێیان کۆڵیەوەو، ئەزموندارا‌ن ئەزموناندیان، لە پاشاندا هۆشمەندەکان گەیشتنە ئەوەی کە تەنیا درۆو بوختانەو، بانگەشەیە بۆ کوفرو تۆغیان.

ئەوگیان هێنانەی هەڵیدەبەستن درۆو دەلەسەو خەڵەتاندنە، ئەوانەی پێشیان دەڵێن گیان هەر شەیتانەکانن گەمە بە مرۆڤ دەکەن و هەڵیاندەخەڵەتێنن.

لە توانای کەسیشدا نیە، گیانی یەکێکی بانگ بکاو بیهێنێ، چونکە کە گیانەکان لە جەستە دادەبڕێن، دەچنە جیهانی بەرزەخ.

ئەوجا یا لە نیعمەت و خۆشیدا دەبن، یا سزاو ئازاردان، زۆر لەوەش خەریکترە بە حاڵی خۆیەوە کە گیان هێنەکان باسی دەکەن.

منیش بۆ ئەم مەسەلەیە بانگ کرام، لەلایەن ئەو گیانانەوەو، بە خۆم زۆر بەدرێژی تاقیم کردەوەو ئەزموناندم و، بۆم دەرکەوت درۆو خەڵەتاندنە، هەندێك شەیتان قەشمەریو گاڵتەی پێدەکەن و ئەنجامی دەدەن، مەبەستیشیان هەر گومڕاکردن و خەڵەتاندنی خەڵکیەو دەیانەوێ دۆستایەتی هەندێکیان بۆ خۆ ڕاکێشن..

**سەرەتای ئەزمونەکە:**

پێش زێتر لە دەساڵان پیاوێکم دەناسی وای هەڵبەستابو کە جنۆکان بۆ کاروباری چاك لەرازەی مرۆڤ بەکار دێنێ، بەهۆی پێناوێکی مرۆڤ.

دەشیگوت بە هۆی خوێندنەوەو زیکری دور و درێژ بەمەگەیشتوە کە

کاتێکی زۆری تێدا بەسەر بردوەو، هەندێك کەسی شارەزا لەو (زانستە) فێریان کردوەو پێیان نیشان داوە!

رۆژێك پێناوەکە هاتەلام ئەوەم پێ ڕابگەیەنی فلاّنە پیاو فلاّنە ژن لە جنۆکان بۆ قسەیەکی گرنگ منیان دەوێ ودەسکەوتێکی مەزنی بۆ من تێدایە، منیش لە کاتی دیاریکراودا پشت بەخوا زۆر بە شادیەوە چوم بەڵکو لەم ئەزمونەدا شتێکی نوێ فێربم.

**خەڵەتاندنەکە چۆن دەستی پێ کرد؟**

یەکەم شێوازی خەڵەتاندن کە لەگەڵەمن بەکارهات، ئەوە بو کە چۆنیەتی گیان هێنانەکە، داوای لێخۆشبون و (لا الە الا اللە) گوتن و یاداوەری بو، ئەمەش لە سەرەتادا وای لە مرۆڤ دەکرد وابزانێ دەگەڵ گیانە بەرزو راستگۆو بێگەردەکاندا دەدوێ.

لە ماڵی پێناوەکە چومە ژورێو، بەتەنێ جێیان هێشتین، ئەو لەسەر نوێن دانیشت، بە ئامارەی وی دەستم بە (استغفر اللە) و (لا الە الا اللە) گوتنێ کرد، هەتا بۆرژا، ئەوجا من هەستام و لەسەر نوێنەکە درێژم کردو، چۆنی فێرکردبوم دامپۆشی، جا دەنگێکی هێدی هاتە گوێم و خاوەنەکەی سلاّوی لێ کردم و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم و خۆشحاڵی خۆی بە من دەربڕی‌و، خۆی پێناساندم، کە ئافەریدێکە، گوایە نە لە فریشتانەو، نە لە جنۆکانە، بەڵکو ئافەریدێکی دیکەیە لە جۆرێکی‌تر، بە فەرمایشتی خوای گەورە: (کُن) ببە، هاتۆتە بون.

جا وای هەڵدەبەستا گوایە جنۆکە لە فەرمانی وی دەرناچن و، بۆ فەرمان وەرگرتن لەنێوان ئەو وخودای بەرزدا تەنها چوار پێناو هەن، کە پێنجەمییان جیبریلە، ئەوجا دەستی کرد بە پیاهەڵدانم و، دەیگوت: هەمو پەیوەندیەکی

خۆیان لەگەڵ مرۆڤ دەپچڕێنن و تەنیا بە دیداری من وازدێنن، بە قسەی ئەوان گوایە من لەو سەردەمەدا خاوەنی تایبەتمەندێتیم و شوێن چاوەدێری خودای بەرزم، هەر خودای بەرزیش بۆ هەندێ منی هەڵبژاردوە.

جا بەڵێنی زۆر بەپێزی پێدام، کە شتی زۆر سەیرو سەمەرەی تێدا بو.

منیش خۆم دابەدەست ئەو ئەزمونە نوێیەو بانگەشەخەڵەتێنەو پشتم بەخودای بەرزو بەدەسەلات بەست، هەر لەخودا دەپاڕامەوە لە خلیسکان بمپارێزێو، بۆ رەوای رون رێنوێنیم بکاو، بەروناکی زانست رێگەی راستیم بۆ رۆشن بکاتەوەو، سوپاس وستایشیش هەر بۆ خودای بەرز.

جا کە یەکەم دیدار کۆتایی هات و، بۆ دیدارێکی دیکە بانگێژی کردم، لە ژوانێکیتردا، پاشان هەر بەخۆی فێری خوێندنێکی کردم بۆ بەئاگاهێنانەوەی پێناوەکە.

هەرواش رویداو، پێناوەکە دانیشت و، چاوی هەڵپشافت، وەکو یەکێك لە خەوێکی قوڵ وەگاهاتبێ و نەزانێ چ رویداوە.

دوبارە لەژوانی دیاریکراو گەڕامەوەو، دیدار دوای دیدارمان هەبو بۆ ماوەیەکی درێژ، لەهەر چاوپێکەوتنێك، زێتر بەڵێنی باشی پێدەدام و، ئەو داهاتوە جوانەی بۆ وەسف دەکردم کە چاوەڕێم دەکا، لەگەڵ ئەو سودە مەزنەی کە ئوممەت لەسەر دەستی من دەیبینێ.

**پەرەسەندنی بابەتەکە:**

مەسەلەکە گوڕاو پەرەی ستاند چو، لە هەر دیدارێکدا چەندین گیان دەهاتنە سەردانم، جا هەندێك زیکری پێشین هەبوایە یان نا، جار هەبو لەگەڵ پێناوەکەی لەسەر نانخواردن بوین، یا خەریکی چاخواردنەوە بوین، وەکو

هەمو جارێ دەبۆرژاو، سەری بەلای پێشەوەدا لار دەبوەوەو چەناگەی لە سینگی دەچەقی، جائەو میوانە کە خۆی بە فریشتە یان جنۆکە یا هاوەڵێکی پێغەمبەرﷺ یا یەکێك لە ئەولیاکان دادەنا، بەشێوەیەك لەگەڵم دەئاخاوت کە مۆرکی رێزو قەدرو و پیرۆزمەندی سەردانەکەی منی پێوە دیار بو، جا موژدەی داهاتو و دوارۆژی پیرۆزو درەوشاوەی پێدەدام و دەڕۆیشت، بێجگە لەوی و بێجگە لەوی دەهاتن..

## میوانەکان کێن؟

وەکو بۆیان هەڵدەبەستام، چەند یەکێك لە فریشتان و، چەند یەکێکی جنۆکان سەردانیان کردم، لەگەل ئەبوهورەیرە رضي الله عنه لە هاوەڵان و کۆمەڵێك لە پیاوچاکانی وەکو ئەبولحەسەنی شازلی رضي الله عنه، هەروەها لە زاناو پیاوچاکانی دیکە، کە گەواهی زانست و خواناسیان بۆ دراوە وەکو شێخ ئەحمەدی تەرمانینی، هەندێك لەو زاناو پیاو چاکانەی من خۆم بە ژیان دیبومن و پاشان کوچیان کردبو، باوکیشم یەکێك بو لەوان رەحمەتی خوای لێبێ.

جا پێشتر موژدەی ئەوەیان دامێ کە بابم سەردانم دەکا، لە کاتێکی ئەوان دیاریان کردبو، منیش زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ژوانەکە بوم.

کە کاتەکەی هات، رایان سپاردم بەدەنگ سورەتی (الواقعة) بخوێنم، منیش خوێندم، جا کە لێبومەوە، گوتیان: پاش ماوەیەکی کەم بابت ئامادە دەبێ، چی پێگوتی گوێی لێ ڕابگرەو، هیچ پرسیارێکی لێ مەکە!!!

## سەرەتای هۆشیار بونەوەم:

پاش چەند خولەکێك ئەوەی دەیگوت گوایە باوکمە، هاتە لام و سلاوی لێکردم، شادمانی خۆی بە دیدارم دەربڕی، دڵشاد بو بەوەی پەیوەندیم بەو گیانانە کردوە، رایسپاردم چاوم لە پێناوەکەو خانەوادەکەی بێ! بە چاوی

سۆزو چاکەکاریەوە چاوەدێری بکەم، چونکە لەم رێیەوە نەبێ هیچ دەرامەت و داهاتێکی دیکەی نیە.

ئینجا بە درودیئیبراهیمی کۆتایی بەقسەکانی هێنا، منیش دەمزانی کە باوکم زۆر متوی درودناردن بو بۆ پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی درودی ئیبراهیمی. سەیریش لەوەدا بو، شێوەزاری قسەکەرەکە تاڕادەیەك بەهی باوکم دەچو. دوایێ سلاوی کردو رۆیشت.

جا پرسیارم لە خۆم دەکرد بۆچی رایانسپاردم هیچ پرسیارێکی لێ نەکەم؟

بێگومان ماستەکە مویەکی تێدایەو کارەکە رازێکی تێدایە.

ئەو نهێنیە پەنهانەی ئەوکاتی بۆم ئاشکرا بو ئەوە بو کە باوکم نیە، بەڵکو هاودەمە جنۆکەکەیەتی، کە بەدرێژایی ژیان لەگەڵیدا بو، کە هاتۆتە لام دەنگی خۆی بە ئیوی چواندوەو تایبەتمەندێتیەکی ئەویشی هەڵگرتوە، رایانسپاردم کە هیچ پرسیارێکی لێ نەکەم، چونکە ئەو هاودەمەو جنۆکەیە هەرچی دەربارەی بابم بزانێو ئەزبەری کردبێ، هێشتا ناتوانێ هەمو ئەو وردەکاریانە ئەزبەر کا کە کوڕ دەربارەی باوکی دەیزانێ، جا نەوەکو پرسیارێکی لێ بکەم، وەلامی پێ نەبێو مەسەلەکە ئاشکرا بێ.

لە دیدارەکانی داهاتوم لەگەڵ کەسانی دی شێوازیان گۆڕی، هەتاکو کاتی رۆیشتن ناوەکانیان پێ نەدەگوتم، ئەوجا هەریەکە دەیگوت: من فلانم، جا سلاوی دەکردو یەکسەر دەڕۆیی.

نهێنی ئەو مەسەلەیەش هەر ئەوەیە کە باسم کرد؛ ئەگەر یەکێکیان خۆی پێ ناساندبام، کە پیاوێکی زاناو شارەزاشە، منیش گرفتێکی زانستیم لەگەڵی بتۆژیباوە، لەوەلامدانەوە دەستەوسان دەبو و کارەکە ئاشکرا دەبو.

جارێکیان یەکێك هاتە لام و لە بابەت موباحێتی دەرخستنی روی ئافرەت گفتوگۆی لەگەڵ کردم، کە گوایە عەورەت نیە، منیش وەڵامم داوە، جا وەڵامێکی دامەوە بۆنی زانستی پێوە نەبو، ئینجا مشتومڕی نێوانمان توند بو.

پێم گوت: بە چی وەڵامی گۆتەی ئەو فەقیهانە دەدەیەوە کە دەڵێن؛ روی ئافرەت عەورەتە، لە ترسی گەندی دەبێ داپۆشری؟

مشتومڕەکەمان بەبێ هیچ ئەنجامێك تەواو بو، ئەوجا پێی گوتم کە ئەوە شێخ ئەحمەدی تەرمانینیەو، رۆیشت.

منیش گومانم لەوەدا نەما کە درۆیە، چونکە شێخی ناوبراو لە گەورە فەقیهەکانی شافیعییانەو، ریزدارانی شافیعییانیش دەڵێن: ئافرەت هەموی عەورەتە، هەر چەندە پیرەژنێکی رزاوەش بێ، جا ئەگەر ئەوە شێخی ناوبراوبایەو، کە لەجیهانی بەرزەخدایە شتی نوێی بۆ ئاشکرا ببوایە، پێی دەگوتم و بەڵگەکانیشی نیشان دەدام.

بەڵام ئەوە درۆو خەڵەتاندنەو، ویستێکە بۆ گومڕاکردن، ستایش و سوپاس بۆ خوای بەرز کە رینوێنی کردم و لەسەر راستیو رێنوێنی جێگیری کردم، چونکە رو دەرخستنی ئافرەتان، بە تایبەتی لەم سەردەمە گەندەڵەو لەم کۆمەڵە نەخۆشەدا کارێکە مرۆی خاوەن هۆش و دین پەسندی ناکا.

**دەرکەوتنی راستی:**

جار لەدوای جار و ئەزمون لەدوای ئەزمون روی راستیەکانم زیاتر بۆ دەردەکەوت، تاکو دڵنیا بوم لەوەی مەسەلەکە هەموی درۆو بۆختانەو تەڵەکەو تۆغیانە، هیچ بناغەیەکی پارێزکاری نیەو چ کۆڵەگەیەکی دینیشی لەبەر نیە، چونکە ئەو پێناوەی هێندە گرنگی پێ دەدەن و، بە چاك چاودێریکردنی و رێزلێنان راسپێری دەکەن، بابایەکی نوێژنەکەرەو، فەرمانی نوێژکردنیشی

پیٚناکەن، ردێنی دەتاشیٚ پێی ناڵێن بەریدەوە.

هەروەها ماڵی خەڵکی بە ناهەق دەخوا، بە هۆی بەڵێنی خەڵەتێنەرو هیچ داهاتێکی دیکەشی نیە لەم رێیە پیسەوە نەبیٚ.

پیاوێك هاتە لام پاش ئەوەی بە پەیوەندیەکەمی زانیبو بەو پێناوە گلەوگازاندەی ئەوەی لەلا دەکردم کە هەڵیخەڵەتاندوەو، سیٚسەد لیرەی سوری لیٚ خواردوەو، ئەویش زۆر هەژارو ئاتاجە.

جا زۆرم لە پێناوەکە کرد ماڵەکەی بۆ بگێڕتەوە، ئەویش ئیشەکەی ئەنجامدا، چونکە بەخۆی و بەشەیتانەکان لەسەر مانەوەی پەیوەندیم لەگەڵیاندا سور بون، سەرەڕای ئەمەش پێناوەکەو خێزانەکەشی لە زۆربەی کاروبارياندا ژيانيان هەر لەسەر درۆيە.

## کۆتایی:

جا پاش ئەوەی مەسەلەکەم تەواو لەلا ئاشکرا بو، ئەو گیانانە هەوڵیان دا رێبازی گەفوگورم لەگەڵدا بگرنەبەر، بەڵام سوپاس بۆ خوای بەرز ئەوە هیچی لە دڵ نەلەرزاندم.

لەم ماوە دورو درێژەشدا دو پەڕاوی گەورەم نوسیبۆوە کە زۆربەی ئەو قسانەی گرتبوە خۆ کە لەم ماوەیەدا لە گەڵیان کردبوم، کاتیٚ کە تەواو ناحەقەکەشم لەلا رون بۆوە بە شێوەیەکی حاشا هەڵنەگر بۆم ئاشکرا بو، پەیوەندیم لەگەڵیاندا بڕیو، بەحوکمی خۆم حوکمم لە سەردان و، ئەو دو پەڕاوەشم سوتاند کە بە درۆودەلەسان پڕ ببۆوە.

ئەو گیانانەش کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گیانی هاوەڵان و ئەولياو پياو چاکانن، هەمويان شەيتانن و بڕواداری هۆشمەندو زيرەك نابیٚ پێی هەڵخەڵەتیٚ.

هەمو ئەو وێنەو شێوازانەش کە گیانهێنەکان لێی راهاتون درۆو ناهەقە. جا چ شێوازی پێناو بێ کە ئەمن باسم کردو وەکو ئەزمون پێیدا تێپەڕیم، یا شێوازی مێزو فنجان بێ، کە هەندێك لەوانی تاقیان کردۆتەوە باسیان بۆ کردوم و گەیشتونەتە هەمان ئەو ئەنجامەی کە من پێی گەیشتبوم.

سەیریش لەوەدایە، پاش ئەو روداوە هەندێ کتێبم خوێندەوە کە لەو بابەتە دەدوان، دیتم هەر کەسێکی تێگەیشتو و ژیرە گەیشتۆتە هەمان ئەنجامەکانی من و حوکمیان لەبارەی ئەو گیانانە ئەوە بوە کە هاودەمی جنۆکەکانی ئادەمیزادن، هەروەکو سوپاس بۆ خودا، پێشتر منی رێنوێنی کردبو.

منیش بەو قسانەم ئەو ئامۆژگاریەم گەیاند کە لەسەر شانم بو، خوداش رێنوێنە بۆ راستەرێ.

**ترکزەیی ئەم بانگەوازانە:**

ئەو بانگەوازانەی گوایە توانای هێنانی گیانانیان هەیە، لەلایەن شەیتانەکانی جنۆکەو مرۆڤ، بۆ گەندکردن و شێواندنی دین قۆزراوەتەوە، چونکە ئەو گیانانەی دەهێنرێن کە لەڕاستیدا شەیتانەکانن قسەی وا دەکەن کە دین تەفرو تونا دەکەن و هەندێك رێ وبیروبۆچونی نوێ دێنن لەگەڵ رەواو راستی تەواو ناکۆك و دژن، جا لە یەکێك لەو کۆڕانەدا گیانەکە (شەیتان) وای هەڵبەستا لەسەر زاری پێناوەکە کە جیبریل لەو کۆڕەدا ئامادەیە، کە زانی ئامادەبوان جیبریل ناناسن، گوتی: (ئەی جیبریل ناناسن کە قورئانی بۆ موحەممەد دادەبەزاند؟! ئەو ئەم کۆبونەوەیە پیرۆز دەکا)، هەروەها دکتۆر موحەممەد موحەممەد حوسین، لە گۆڤاری (جیهانی گیان)دا، لە وتارێك بە ناوی (ئاخاوتنی گیانی گەورە هوایت هۆك) ئەمە رادەگوێزێ: (پێویستە لەم بزوتنەوەدا یەك بگرین، لەم دینە نوێیەدا، دەبێ خۆشەویستی باڵی بەسەرماندا

بکێشی، هەروەها پێویستە توانای خۆگرتن وتێکگەیشتنمان هەبێ.. پەیامی من (لێرەدا هەر گیانەکەیە قسە دەکا واتە شەیتان) ئەوەیە کە دڵی بێبەشان بدەمەوەو، هاوکاری مرۆڤ بکەم تا لەدەرونەوە خۆی لە خوای بەرز قوتار کا: (راست دەڵێ، ئەمە پەیامەکەیەتی، کەوا لە مرۆ بکا کوفر بەخوا بکا) مرۆڤ خواوەندێکە بەرەگەزەکانی زەوی داپۆشراوە، (بەم شێوەیە مرۆڤ پڕ با دەکاو درۆی بۆ دەکا، تاکو گومڕای کا) جا مرۆڤ پەی بەوە نابا چی لە تواناکدا هەیە، هەست بەبەشە فریشتەییە خوداوەندیەکەی خۆی دەکات، گیانایەتی لە ڕێبازەکانی دی توانای زیاتر دەبێ بۆ دامەزراندنی دینێکی فراوانی نوێ بۆ هەمو جیهان).

هەر لە هەمان گۆڤارەوە پێناسەیەکی ئەو ڕێکخراوە دەگوازێتەوە کە بۆ ئەم مەبەستە دامەزراوە: (ئەم ڕێکخراوە بۆ هەمو مرۆڤایەتیە، لە میانەی ئەمەوە دانیشتوانی جیهانی گیانی، شێوازێکی تازەی ژینمان بۆ رون دەکەنەوەو، بیرۆکەیەکی دیکەمان دەدەنێ لە بارەی خوداو ویستی خودا، ئەوان ئاشتیو دڵئارامی و ئاسودەیی دەرون و دڵمان بۆ دەهێنن. بەربەستی نێوان میللەتان و تاکەکان و نێوان بیروباوەڕو دینەکان دادەڕوخێنێ، (بەم شێوەیە)... ئەندامێتش لەم ڕێکخراوەدا بە چاوپۆشینە لە نیشتمان یا رەنگ یان دین یا ڕاڕەوی رامیاری).

گیانەکان وا هەڵدەبەستن گوایە پەیامبەری رەوانەکراون لەلای خودا، دکتۆر باسی ئەوە دەکا کە موحەممەد فەرید وەجدی لەم گیانانەوە (واتە شەیتانەکان) دەگوازێتەوە کە دەڵێن: (ئێمە لەلای خودا رەوانە کراوین، هەروەکو پێغەمبەرانیش لە پێش ئێمە ناردراون، بەڵام ئەوەندە هەیە دەستورەکانی ئێمە لە هی ئەوان باڵاترە، خودای ئێمە خودای ئەوانە، بەڵام خوداوەندی ئێمە دیارترە لە خوداوەندی ئەوان و سیفەتی مرۆڤانەی کەمترەو سیفەتی خوایانەی

**زێتره...ناکەوێتە بەر هیچ بیروباوەڕێکی مەزەبیو، بەبێ بینین و رامانیش هیچ دەستورێك قبوڵ ناکات کە پشت بە ژیری نەبەستێ).**

**هەروەها ئەوانە وایان هەڵبەستاوە کە پێغەمبەران تەنها هێندێك پێناون کە پلەی پێناوێتیان بەرزە، ئەو پەرجوانەی لەسەردەستی ئەوانیش روی داوە تەنیا برتیین لە دیاردەی گیانی، هەروەکو ئەو دیاردانەی لە زۆری گیانهێنان رودەدەن، هەروەك وا هەڵدەبەستن کە دەتوانن هەمو ئەوان روداوان سەرلەنوێ دووبارە بکەنەوە لەو گیانانەی دراونەتە پاڵ مەسیح، هەندێك رۆژنامەش شاڵاوی بانگەوازی گەورەیان سازکرد، کە یەکێك لە گیانهێنەکان لە ئەمریکا دەتوانێ هەمان پەرجوەکانی مەسیح ئەنجام بدا، سۆما بۆ کوێران دەگەڕێنێتەوەو دوان بۆ لاڵان و شەپلەلێدراو دەخاتەوە جوڵە، هێندەی ماوە بزانی ئەو دکتۆرە هەڵبەستراوە منداڵێکی دەساڵانەو ناوی (میشێڵ)ە، کە نەخۆشێك دێتە لای پەنجەکانی خۆی لەسەر دادەنێو بە هەندێك دوعاو گوتنێ دەکەوێتە بۆڵەبۆڵ و، پەرجوەکە دێتە ئارا، دەشڵێن ئەو منداڵە ئەو بەهرە گیانانیەی لە باب یەوە بۆ بەجێماوەو، هیچ پارەش وەرناگرێ لە پای ئەو نیشانەی دەیکات، (سەیری پاشکۆی رۆژنامەی (القبس)ی کویتی بکە ١٩٧٧/١٠/١٧)، مەسەلەی میراتگری ئەو منداڵەش بۆ ئەم جۆرە کارانە لە باوکیەوە، چیرۆکێکمان دەهێنیتەوە بیر کە لە هێندێك ناوچەی فەڵەستین دەگێڕدرێتەوە، دەڵێن پیاوێك کە چاکیو خۆپارێزی دەردەخست، کاروباری سەمەرەی دەکرد، لەو کاتی نە تەیارە هەبو نە سەیارە، ئەوجە ئەو کابرایە لە شەوی عەرەفاتێ بەرەو حەج بەڕێ دەکەوت، رۆژەکەی دەگەڵ حاجیان بەسەردەبردو، نامەی خزم و خۆێشی وانی پێ دەگەیاندن و، وەرامنامەی لێ وەردەگرتن و لەشەوەکەی دی دەگەڕاوەو ئەمانەشی دەگەیاندە خزم و دۆستان، گەلێك خەڵك باوەڕیان بە پیاوچاکیو خێرمەندی ئەو پیاوە هەبو، هەر**

چەندە کە دەچوە حەجیٚ بە تەواوی حەجەکەی بەجیٚ نەدەگەیاند، تەنانەت کاتی پێویست لە مینادا نەدەماوەو شەیتانیشی رەجم نەدەکرد، پاشان خودا ویستی ناڕەوای ئەو پیاوە دەربخاو بە خەڵکی پیشان دا، کە لەسەرەمەرگدا بو، کوڕە گەورەکەی گاز کردو پێی گوت: ساڵانە لە شەوی عەرەفات وشترێك دیٚ و بەرەو کێوی عەرەفات هەڵی دەگریٚ، جا کە وشترەکە هات وکوڕە سواری بو بەینێکی هاژۆت راوەستاو دەگەڵ کوڕەی کەوتە قسان و پێی راگەیاند کە شەیتانەو باوکی ئەویش دەیپەرست و سوژدەی بۆ دەبرد، ئەمیش لە پای هەندیٚ ئەم جۆرە راژانەی پێشکەش دەکرد، بەڵام کە کوڕەکە سوژدەی بۆ نەبردو خۆی بەخودا لێی پەنادا، لە بیاباندا جێی هێشت و بە قەدەری خودا گەڕایەوەو راستەقانی باوکە کافرەکەی دەرخست، (ئەلبەیانونی) لە کتێبی (الملائكة)دا کورتتر لەمە ئەم چیرۆکەی هاوردوە.

### ئایا دەکریٚ گیانەکان بهێنرینەوە؟

گۆواری (سانیتفیك ئەمێریکان)، پاداشێکی ماڵی زلی تەرخان کرد، بۆ هەر کەسێکی بیانویەك بۆ راستی دیاردە گیانیەکان بهێنیٚ، تا ئێستاش ئەم پاداشتە لە گۆڕێیەوە کەسێك وەدەستی نەهێناوە، هەر چەندە لەئەمریکادا گیانانیەکان بڵاون و لێهاتویی‌و دەسەڵاتیشیان هەیە.

پاداشێکی دیکەش چۆتە پاڵ هەمان ئەم پاداشە کە دینینجەری جادوگەری ئەمریکایی بۆ هەمان مەبەست تەرخانی کردوەو تا ئێستا کەسێك وەدەستی نەهێناوە.

بەڵام ئایا هەلوێستی ئیسلام لە ئاست هێنانی گیانی کۆچکردوان چیە؟

رامان لەو دەقانەی لەم مەسەلەیەدا هاتون وا لە توێژەر دەکا بەدڵنیاییەوە بڵیٚ ئەمە مەحاڵە، خودای بەرز هەواڵی پێداوین گیان لە جیهانی پەنهان دایەو

چ ڕێیەك نیە بۆ پەی پێ بردنی ﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً: لە بابەت گیان پرسیارت لێدەکەن، بڵێ: گیان شتێکە تەنیا پەروەردگارم لێی ئاگایەو، ئێوە هەر زانستێکی کەمتان پێ بەخشراوە ﴾ (سورة الإسراء/٨٥).

هەروەها هەواڵی داوە کە خودا لە کاتی مردندا گیانان دەکێشێ ﴿ اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى: خودا لەکاتی مەرگدا گیانانێك دەستێنێ و ئەوکەسەی لە خەوی خۆیدا نەمردوە، جا گیانگەلێك دەکێشی کە فەرمانی مەرگیان بۆ هاتوە، ئەوانی دیکەش تا سەردەمی دیاریکراو رادەگرێ ﴾ (سورة الزمر/٤٢).

خودای گەورە گیانەکانی بەفریشتان ئەسپاردە کردون، ئەگەر ناشادو بێباوەڕبن، ئازاریان دەدەن و، ئەوەی چاکەکارو پارێزکاریش بێ لە نیعمەتی خودای دەهاوێن.

پێغەمبەریش ﷺ بۆی رون کردوینەوە، فریشتەی گیانکێشان چۆن چۆنی گیانان دەکێشێ و پاش هەنگی چیان لێدەکا.

کاتێك گیانەکانیش لەلای خوداوە گیرا بن، بە پارێزەری بەهێزو لێزان راسپێردراون و، ناتوانێ بەملاو بەولادا بچێ و هەڵبێ، چ جای ئەوەی بێتە لای ئەوانەی گەمە بە هۆشی بەندان دەکەن.

هیندێکیش لەوانە دەڵێن گوایە گیانی یەکێك لە بەندە چاکەکانی خودای لە پێغەمبەران و شەهیدان هێناوە، جا چۆن ئەمانە بەهەشتی نەمری جێ دێڵن بۆ

ژوری تاریکی گیانهێنان، خوای گەورەش پێی راگەیاندوین کە شەهیدان لە لای پەروەردگاریان زندون ﴿ وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ.. : هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی لەرێی خوادا شەهید کراون، مردون، بەڵکو زندون و لەلای پەروەردگاری خۆیان رزق و رۆزی دەدرێن ﴾ (سورة آل عمران/١٦٩).

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((أن ارواح الشهداء في حواصل طيور خضر تسـرح في رياض الجنة، تأكل من ثمارها وتشرب من أنهارها وتأوي إلى قناديل معلقـة في سـقف عـرش الرحمـن: گیانی شەهیدان لە چکڵدانەی باڵندەگەلێکی سەوزدان، لە مێرگەکانی بەهەشتێدا ئازادن و چینە دەکەن، لە بەروبومی بەهەشت دەخۆن و لە روبارەکانی دەخۆنەوە، لە چراگەلێکی هەڵواسراو بە عەرشی خودای میهرەبانیشدا دەحەوێنەوە)). جا چۆن تەڵەکەبازانی سەردەم وا هەڵدەبەستن کە گیانی ئەوانە دێنن؟ ﴿ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ إِنْ يَقُولُونَ إِلاَّ كَذِبًا ﴾ .

### گومانێك و وەڵامێك:

دەڵێن جا چۆن پاساوی ئەوە دەدەنەوە کە گیانەکان شارەزای ئاکارو کردەوەی ئەو کابرایەن کە گوایە لەنێو جەستەی ویدا بونە؟

دەڵێین ئەوەی هەڵدەبەستیٚ کە گیانە، لە راستیدا شەیتانە، رەنگە ئەو شەیتانە هەمان ئەو هاودەمە بێ کە لەگەڵ مرۆڤ دایە.. باسی ئەو دەقانەشمان کرد کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەمو مرۆڤێك شەیتانێکی هەیە، جا ئەم هاودەمەی هەمیشە لەگەڵ مرۆڤ دایە، گەلێك شتی لەبارەی ئاکارو نەریت و سیفەتەکانی دەزانیٚو خزم و دۆستانی دەناسیٚ.

كە تاقی دەكرێتەوە، زۆر بەئاسانی دێتەگۆو وەلامان دەداتەوە، ئەگەر بشگوترێ چۆن ئەو وەرامە زانستییانە لێك دەدەنەوە كە هەندێك جار لە گیانانەوە گوێ بستیان دەبن، دەڵێین: پێشتر ئەوەمان رون كردەوە كە شەیتانەكان و جنۆكە توانای زانستی وایان هەیە بتوانن وەڵام بدەنەوەو سود بگەیەنێ.

بەڵام سودێك كە گومڕاكردنێكی گەورەی لە خۆ حەشار دابێ، چونكە ئەوان بە بڕێكی دیاریكراو نەبێ سودمان پێ ناگەیەنن، تەنها بۆ ئەوەی متمانەیان پێبكەین و ئینجا كویان بوێ ئاوا بەرەو خراپەو گومڕایی ئاڕاستەمان بكەن، كە لە دونیاو لە قیامەتدا توشی هەشبەسەریمان بكەن.

دەستبەرداری شەیتانەكان لە شوێنكەوتەكانیان:

ئەوانە كە(گیانانی)یان پێ دەگوترێ‌و وا هەڵدەبەستن گوایە گیانان دەهێنن و چارەسەرییان پێدەكەن، درۆزنن، ئەو گیانانەش لە شەیتان بترازێ چی دیكە نین، واش دەبێ شەیتانەكان واز لەوانە بێنن و روزەردو شەرمەزاریان بكەن، رۆژنامەی (القبس)ی كوێتی لە پاشكۆكەیدا، لە ١٩٧٨/٦/١٢ وتارێكی بڵاو كردەوە، تێیدا هاتبو؛ لەم رۆژانەدا تێكڕای بەریتانیا لەبارەی (پیتەر گۆدوین)ی زانای گیانانی دەدوێ، كە كۆمەڵێك بەهرەی گیانانی لە سنور بەدەری هەبو، بەهۆی ئەم بەهرانەوە دەیتوانی نەخۆشی گران چارە بكاو شتی ون بو بدۆزێتەوەو، گیانان رام كا بۆ راژەی مرۆڤ.

پیتەر گۆدوین توانایەكی ناوازەی هەبو، دەیتوانی لەیەك كاتدا لە زێتر لە شوێنێك بێ، بۆ نمونە جار هەبو هاوڕێكانی لە لەندەن دەیاندیت، هێندێكی دیكەش لەهەمان كات لە لیڤەربول دەیاندیت و، كەسانێكی دیكەش لە

مانشستەر، کۆمەڵی چوارەمیش بەدڵنیاییەوە دەیانگوت نەلەویٚ بوەو نەلەویٚ، بەڵکو لە ماڵی خۆیدا لەگەڵ ژنی ومنداڵەکانی دانیشتبو.

هەندێك جاریش، جەستە ئەثیریە جیاوازەکانی پێکەوە لە شوێنێکدا جەم دەبون، بۆ نمونە لەنێوان هاوڕێکانی دادەنیشت، لە ناکاو کەسێتیەکەی تری خۆی لە هەموان وەژور دەکەوت و، لەگەڵیان دادەنیشت و.. کەسێتی سێیەم دەهات و، چوارەم و پێنجەمیش لە پاشەوی، جا پیتەر گودوین دەبوە پێنج کەسێتی و لەگەڵ ئامادەبوان دادەنیشت و لەگەڵیان دەئاخێویٚ، یان لەنێو خۆدا پێکەوە قسانیان دەکرد، لەکاتێکدا کە هەمو سەرسوڕماو و واق وڕماون...کتوپڕ پیتەر گۆدوین هەمو شتێکی لەدەست چو، بوە مرۆڤێکی ئاسایی، چی دی نەیتوانی نەخۆشان چاکاتەوەو، بزربوان وەدۆزیٚو، داهاتو ئاشکرا کا، یان گیانان بۆ راژەی خەڵکی رام کا. تراژیدیای گۆدوین لە پارەوە دەستی پێکرد، کاتێك هەوڵیدا ئەو بەهرانەی خودا پێیداوە، بیانقۆزێتەوە بۆ دەستخستنی قازانج و سودی مادی... ئێستاش لە رابردوە نێزیکەکەی دەڕوانیٚو دەڵیٚ: ئەوی بەسەرەمن هات، لە خەیاڵاندا نەبو، گیانەکان لێم توڕە بون و بەرەکەتی خۆیان لیٚ ستاندمەوە.

### سەرەتای چیرۆکەکە:

چیرۆکەکە ئەوەیە کە پیتەر گۆدوین ساڵی پار هەوڵیدا، چەند بنکەیەك بۆ چارەسەریگیانی لە درێژی و پانی بەریتانیا بکاتەوەو، لەهەر شارێکی گەورەی بەریتانیا بنکەیەك دامەزرێنیٚ، بۆیە بانگەوازێکی لە هێوارەنامەی (بۆنماوت) بلاوکردەوە، داوای مەشق پێکراوی تۆژینەوە گیانیەکانی کردبو، بەدەوامێکی تەواو یا نیو دەوام، پرۆژەکەش داهاتێکی هەفتانە ٤٠ هەتا ٥٠

جونەیهی وەدەست دێنێ.

پاش ئەوەی پیتەر گۆدوین بانگەوازەکەی بڵاو کردەوە، داواکاری بەسەردا ڕژان، لەنێو ئەوانەی بەدەنگ داواکەیەوە هاتبون، نوسەرێکی تەمەن بیست و نۆ ساڵان بو، ناوی رۆبین لاسی بو، لەگەڵ ژنێکی شەست و پێنج ساڵان بە ناوی جین بارتلیت و پیاوێکی سی ساڵان کە ناوی ئارثەر جیفری بو.. بەڵام هەر کە پیتەر گودوین دەستی بە چاوپێکەوتنەکان کرد، گرفتی لە رێ پەیدا بون، رۆبین لاسی دەڵێ:

(سەیرم پێهات کاتێك ئامادەی دیدارەکە بوم، پیتەر گۆدوین بە خۆی لەوێ نەبو، ژنێکی پەنجاساڵانە چاوپێکەوتنی دەکردین و گەنجێك و ژنێکی تەمەن گچکەی زۆر جوان یاریدەیان دەدا.. پرسیارەکانمان بەسەر دابەشکرا، داوای وەڵامیان لێ کردین.. لە نێو پرسیارەکاندا ئەمانە هاتبون: ئایا لە ژینی خۆت قەتت گیان دیون؟ ئایا بڕوات بە ئەنجامی گیانان هەیە؟ ئایا تلیاك بەکار دێنی؟ ئایا پێشتر سەردانی نەخۆشخانەی نەخۆشیەکانی دەمارت کردوە؟ جا ژنە پەنجا ساڵانەکە پێی گوتین کە پیتەر گۆدوین بنکەیەکی گیانی لەهەمو بەریتانیا دادەنێو بۆ چارەسازیگیانی راماندەهێنێ بە شێوەیەك بتوانین لەو بنکانەدا کار بکەین، پاشان خەڵکمان دەنێرێتە لا، بەمەرجێك لە پای هەر دانیشتنێك پێنج جونەیهی ئیسترلینی وەرگرین و، بەتێکڕایی ٤٠ نەخۆش لە هەفتەیەکدا چارەسەر بکەین.. بەمەرجێك پیتەر گۆدوین نیوەی یەکەمین پێنج هەزار جونەیهی ئیستەرلینی بۆ خۆی هەڵبگرێو نیوەکەی دیکەش بۆ ئێمە.. زۆربەمان بە هەندێ دڵسارد بوین، دەنگی نارەزاییش لە دژ ئەمە لەلایەن ئەوانەی داواکاریان پێشکەش کردبو بەرز بۆوە، زۆربەشمان پێش تەواو پڕکردنەوەی پسولەی داواکاری ژورەکەمان بەجێ هێشت.

**ئەوانە بە چاوی خۆیان دیتیان چی دەڵێن؟**

لەگەڵ ئەوەشدا، هێندێکیان لێ هەڵبژێردران و رێیان دان لە ژورێکی‌تر چاویان بە پیتەر گۆدوین بکەوێ، دیداری یەکەمین کەس ٢٠ خولەکی خایاندو ئەم کاتە بەرەبەرە کورت بۆوە، کە نورەی دوامین کەس هات دیدارەکەی هەر پێنج خولەکی خایاندو، لە کۆتاییدا چەند کەسێك هەڵبژاێردرا تاکو پیتەر گۆدوین راهێنانیان بگرێتە ئەستۆ..

یەکێك لەوان کەسانی هەڵبژێردران جین بارتلیت بو کە ئەندازیارێکی خانەنشینی دیکۆر بو، مێردەکەشی کە ناوی ئارثەر بارتلیت بو.. جین دەڵێ:

(هیچ تێنەگەیشتم لەوەی پیتەر گۆدوین فێری دەکردم، هەردەم لەکاتی مەشق کردندا شڵەژاو بو، بەم دواییەش، وانەکانی لەسەر کاسێت تۆمار دەکردو، تێیاندا دەربارەی ئاسۆکانی مرۆڤ لە ژیاندا دەئاخاوت. جارێکیان داوای لێمان کرد پەیکەرێکی لە قوڕ بۆ دروست بکەین لە مرۆڤ بچێ. خویندنی هەندێك جەلجەلوت و شتیشی فێرکردین تا لەسەری بیخوێنین، بەلأم ئەوە هەموی بێسود بو.. هەروەك پیتەر گۆدوین هەندێك تێبینیشی پێ گوتین، کە هیچی لێ تێنەگەیشتین).

هەروەها ئارثەر جیفری و ئەنجیلای ژنی لەو کەسانە بون کە هەڵبژێردرا بون، ئەنجیلا دەڵێ:

(لەسەرەتادا، هەستمان کرد کەشێکی زانستی وانەو موحازەرەکانی داگرتوە، بەلأم گۆدوین بەردەوام شڵەژا بو، بەرە بەرە کاریگەری خۆی لەدەست دەدا، تا پاش چەند رۆژێك بوە مرۆڤێکی ئاسایی وەك ئێمە، بەهرەی هیچ

توانایەکی لەرادەبەدەری پێ نەما، کاتێك هەستمان بەمەکرد، کە چی‌دی ئیشە سەیرەکانی لە پێش ئێمە ئەنجام نەدا، بەڵکو وانەکانی لەسەر کاسێت تۆماردەکردن و، ئێمەش هەر لە کاسێت گوێمان دەدایێ بێ ئەوەی بیبینین، بۆیە هەمومان وازمان لە موحازەرەکانی هێناو ئەو خەرجیەشمان بڕی کە پێشتر دەماندایێ‌و بەتێکڕای دە جونەیهی ئیستەرلینی بو بۆ هەر وانەیەك).

لە نوسینگەکەی لە باسنکسشوك لە هانز، پیتەر گۆدوین، ئەو پیاوەی متمانەی گیانانی لە دەست دا گوتی: (پلانەکەم وا بو هێزە گیانیەکانی قوتابیانم پەرەپێبدەم، پاشان بڕوانامەیەکیان بدەمێ ئەوە بسەلمێنێ، تا بتوانن ئیش و کارەکانیان بکەن و، سودمەندبن و سودبگەیەنن، هەروەك منیش سود وەرگرم، لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند نامەو پەیامێکی گیانیم پێ گەیشت، کە ئەو بەهرانەی خودا پێی‌داوم بۆ قازانجی مادی نەیانقۆزمەوە، بەڵام من گوێم نەدایێ، تاوای لێهات بەرەبەرە تواناکەم نەدەما، تا بە تەواوی بزر بو، بەڵام چۆن ئەوە روی دا، من تا ئێستا نازانم).

رای ئێمە لەسەر ئەم روداوە:

١- ئەوەی کە ئەو پیاوە هەڵی دەبەستا، گوایە گیانان دێنێ، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، بەڵگەش بۆ ئەوەی کە شەیتانەکانی هێناون، ئەوەیە کە فەرمانی بە شوێنکەوتەکانی کرد پەیکەران دروست بکەن و جەلجەتوت و شتی دیاریکراوی بەسەردا بخوێنن، ئەمەش شەیتان رازی دەکاو خوداش تورە دەکا.

٢- ئەگەر بشڵێین ئەم گیانانە شەیتانەکانن، ئەو دیاردەیەمان بۆ شیکار دەبێ کە پیتەر لەیەك کاتدا لە چەند شوێنێکی جودا ئامادە دەبو، چونکە شەیتان دەتوانێ شێوەی خۆی وەکو مرۆڤ لێ بکا.

ئەم دیاردەیەش لەرابردو روی داوەو ئێستاکەش رو دەدا هەروەك لە شەڕی بەدردا ئیبلیس بەوێنەی سوراقەی کوڕی مالیك هاتە لای هاوبەشکاران، ئیبنیتەیمیەش زۆرشت لەم بابەتە دەگێڕتەوە، منیش هەندێکیانی لێ دێنمەوە تاکو خوێنەر بزانێ ئەوە لە زوەوە هەبوە.. ئیبنی تەیمیە لە بارەی خۆی دەڵێ:(هەندێك لە هاوەڵانم گوتیان کە لە هێندێك تەنگانەی بەسەریان هاتبو هانایان وەبەر هێناوم، یەکێکیان لە ئەرمەنان ترسابو، ئەوی دی لە تەتەران ترسابو، هەریەکەیان دەیگوت کە هاواری منی کردوە، لە حەوای دیتومی دوژمنەکەیم لەکۆڵ کردۆتەوە. منیش (ئیبنی تەیمیە) پێم راگەیاندن، کە هەستم بەوە نەکردوەو کەسیشم لەکۆڵ ئێوە نەکردۆتەوە، بەڵکو ئەوە شەیتان بوە، کە شیرکتان بەخودای بەرز کردوە بۆ هەریەکەتان خۆی رانواندوە تا فریوتان دا).

دەڵێ: (جا ئەمە بەسەر زۆر شێخاندا هاتوە لەگەڵ هاوەڵەکانیان، کە یەکێکیان هاواری شێخ دەکا، دەبینی شێخ دێ و ئاتاجیەکەی بۆ جێبەجێ دەکا، شێخیش دەڵێ: من بەمەم نەزانیوە، جا رون دەبێتەوە کە ئەوە شەیتانێك بوە).

هەروەها دەڵێ: (یەکێك لە هاوەڵانم بۆی گێڕامەوە کە هاواری دو کەسانی کردوە کە باوەڕی پێیان هەبوە، هەردوکیان لە حەوای هاتونە لای وپێیان گوتبو: دڵت باش بێ، ئێمە ئەوانەت لەکۆڵ دەکەینەوەو کاران دەکەین.

منیش پێم گوت: هیچ لەوە رویدا؟ گوتی: نەخێر، جا ئەوەش بەڵگەیە کە ئەوانە شەیتان بونە، چونکە هەرچەندە شەیتانەکان هەواڵی روداوێك یا چیرۆکێك بەمرۆڤ بدەن، چەند هێندە درۆشی لەگەڵ دەکەن، هەروەکو جنۆکە لەگەڵ پێشبینەکان دەیانکرد).

٣- شەیتانەکانی پیتەر دەستبەرداری بون، وەك چۆن ئەو شەیتانانەی خۆ دێننە سەر وێنەی شێخان واز لەو کەسانە دێنن کە وادەو بەڵێنی پاراستن و سەرخستنیان داونیۆ، هەروەك شەیتان دەستبەرداری راهیبەکە بو لەگەڵ ئەوەی بەڵێنی سەرخستنی پێدابو، ئەمەش ریسواکردن و سەرشۆرکردنی کەسێکە کە تا دوینێ جێی رێزی خەڵك بو.

٥- پیتەر کە وای هەڵبەست گوایە ئەو گیانانە پاڵپشتێکن لە خوداوە، درۆیەو هیچ بەڵگەیەکی نیە.

# جنۆکەو پیوارزانی

لە نێو خەڵکێکی زۆر وا بڵاوە کە جنۆکە پەنهان دەزانن و، ئەرژەنگی جنۆکانیش هەوڵ دەدەن ئەم بۆچونە هەڵەیە لەنێو خەڵکی بچەسپێنن، خودای گەورەش بۆ خەڵکی رون کردەوە کە ئەم بانگەشەیە درۆیە، کاتێك گیانی سلێمان پێغەمبەری کێشاو هەر بەوەستاوی هێشتیەوە، ئەو جنۆکانەی کە بۆ سلێمان ﷺ رام و کەوی کردبون و لەبەردەستی کاریان دەکرد، لە کارەکانیان بەردەوام بون و، نەیاندەزانی کۆچی کردوە هەتا مۆرانە ئەو گۆپاڵەی خوارد کە پاڵی وێدابو و، بەربوەوە، ئەوجا لای خەڵك رون بۆوە جنۆکە درۆدەکەن و پیوار نازانن: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلاَّ دَابَّةُ الأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتْ الْجِنُّ أَنْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ: جا کاتێك سلێمانمان مراند، هیچ شتێك جنۆکەکانی لە مردنی وی ئاگادار نەکردەوە، هەتا مۆرانە داردەستەکەی ئەوی خوارد، جا کاتێك بەربۆوە، جنۆکەکان زانیان، ئەگەر پەنهانیان بزانیبا لەو ئەشکەنجە پەستەدا نەدەمان ﴾ (سورة سبأ/١٤).

پێشتریش باس کرابو جنۆکە چۆن هەواڵی ئاسمانیان دەدزی و، چۆن لە پاش ناردنی پێغەمبەر ﷺ ئێشکگرتن لە ئاسماندا پتر بوەو، کەم وا دەبێ جنۆکەیەك بتوانێ هەڵکشێ و گوێ راگرێ.

## پێشبین و فاڵچیەکان:

بەم جۆرە مەزنێتی ئەو هەڵەیە دەزانین کە رەشۆکی خەڵك تێی دەکەون کە ئیتقاتیان بە هەندێك مرۆڤی وەکو فاڵچی و کاهینەکان هەیە گوایە پەنهان دەزانن، دەیانبینی دەچنە لایان و دەربارەی هەندێ شت پرسیاریان لێ دەکەن کە رویان داوە، وەك دزی و تاوان، هەروەها دەربارەی شتانێکیش لێیان دەپرسن کە رویان نەداوە داخۆ چی بەسەر خۆیان و منداڵەکانیان دێ، خاوەن پرسیار و پرسیارلێکراویش دڵساردو شەرمەزارن، چونکە تەنها خوا بە پەنهان زانایەو، لە هەندێك بەندەی چاکەکار بترازێ کە خۆی دەیەوێ، بۆ کەسی دی ئاشکرا ناکا: ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا۝ إِلاَّ مَنْ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا۝ لِيَعْلَمَ أَنْ قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا: هەر خودایە بە پەنهان ئاگادارەو کەس بەسەر نهێنی خۆی ئاگادار ناکا، مەگەر پێغەمبەرێکی هەڵبژێردراو، بێگومان خودا ئاگادارو چاودێر لەبەردەمی‌و لەپشتیەوە دەنێرێت، تا بزانێ کە سروشی خوای خۆیان گەیاندوەو خودا ئاگادارە بەوەی کە لەلایانە.. وە هەموشتێکی بە تەواوی هەڵژماردوە ﴾ (سورة الجن/٢٦-٢٨).

هەر بیروباوەڕێکیش وابێ کە فلانەکەس پەنهان دەزانێ، بیروباوەڕێکی تاوانکاری گومڕایەو، ناکۆك و پێچەوانەی بیروباوەڕی راستەقینەی ئیسلامیە کە زانستی پەنهان تەنها دەداتە پاڵ خودای مەزن.

بەلأم کە کارەکە دەپەڕێتەوە بۆ پرسوڕا بە بانگەشەکارانی پەنهانزانی، تاوانەکە زۆر مەزنتر دەبێ، لە صەحیحی موسلیم و موسنەدی ئەحمەددا هاتوە لەیەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، لە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ((من أتـــى

عرافا فسأله عن شيء، لم تقبل له صلاة أربعين ليلة: **هەر کەسێکی چوە لای فاڵچیەك و لە بارەی شتێك پرسیاری لێکرد، چل شەوان نوێژی لێ قبوڵ ناکرێ))**.

**باوەڕ پێکردن و بەڕاستزانینی ئەوانەش کوفرە، هەروەکو لە موسنەددا لە ئەبوهورەیرە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((من أتى عرافاً او كاهناً، فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد: **هەر کەسێکی چوە لای فاڵچیەك یا پێشبینێك و، چی گوت باوەڕی پێکرد، کوفری کردوە بەو دینەی دابەزیوەتە سەر موحەممەد))**.

**ڕاڤەکاری عەقیدەی طەحاوی دەڵێ:** (**ئەستێرەگرەوەش لەلای هەندێ زانایاندا وەبەر نێوی فاڵچی دەکەون و، لەلای هەندێکی دیکە هەر هەمان واتای هەیە، پاشان دەڵێ: جا ئەگەر ئەمە حاڵی خاوەن پرسیارەکە بێ، پرسیار لێکراو دەبێ حاڵی چۆن بێ؟**)، **مەبەستی ئەوەیە ئەگەر خاوەن پرسەکە چل ڕۆژان نوێژی قبول نەبێ‌و ئەوی کاهینێك یا فاڵچیەك بەڕاست بزانێ توشی کوفر بێ بەوەی دابەزیوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، ئایا دەبێ حوکمی کاهین و فاڵچیەکە چۆن بێ؟**

### پرسین لە فاڵچی و پێشبینان بۆ تاقیکردنەوە:

**ئیبنی تەیمیە وای بۆ دەچێ، کە پرسیار لە پێشبینان بەمەبەستی تاقیکردنەوەی باریان و ئەزموناندنی دەرونیان بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی‌و درۆیان دروستە، فەرمودەیەکی هەردو صەحیحانیشی بەبەڵگە هێناوەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە ئیبنی‌صەیادی پرسی‌و فەرموی:** ((مايـأتيك؟: **چ دێتەلات))**، **گوتی: ڕاستگۆو درۆزنم دێنە لا، فەرموی:** ((ماتراى؟: **چ دەبینی))**، **گوتی عەرشێك دەبینم لەسەر ئاوە، فەرموی:** ((فاني قد خبأت لك خبيئا: **من شتێکم بۆ تۆ لە دڵدا گرتوە))**، **گوتی:** (**الدخ، الدخ**)، **فەرموی:** ((أخسأ، فلن تعدو قدرك، فإنما

أنت من إخوان الكهان: زەبون و روزەرد بە، ناتوانی لە قەدەری خۆت رەت بی. تۆش هەر برای پێشبینانی))، دەبینی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لەو بانگەشەکارە کرد تا کارەکەی بۆ خەڵکی دەرخاو رونکاتەوەو بە خەڵکی بناسێنێ.

## ئەستێرەگەران:

کردەی ئەستێرەگەری لە ناوەڕۆکدا بریتیە لە زانینی حوکمی و کاریگەری، ئەمەش ناسینەوەی روداوەکانی زەویە بەهۆی بارە گەردونیەکان یان چاوگێرانە بە مەنزڵگاکانی گەردون و زەویدا؛ بەپێی قورئان و سونەت کردەیەکی حەرامە، بەڵکو لەسەر زاری سەرجەم پێغەمبەران حەرام کراوە، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَلاَ يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى: جادوگەر بۆ هەر شوێنێك بڕوا رزگارو سەرکەوتونابێ ﴾ (سورة طة/٦٩).

هەروەها دەفەرمێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنْ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ: ئەدی نەتدیت کەسانێك کە بەشێکیان لە کتێبی خودا پێدرابو، کەچی بڕوایان هێنابو بەبت و پێشبین و جادوگەرو تاغوتان ﴾ (سورة النساء/٥١).

## گومانێك:

رەنگە هەبێ بڵێ فاڵچی و کاهین و ئەستێرەگران جار هەیە راست دەکەن، وەڵام ئەوەیە: کە زۆر جاران راستیەکانیان روکێش کردنە بەسەر خەڵکدا، چونکە ئەوان قسەیەکی گشتی بە خەڵکی دەڵێن کە گەلێك باری لێکدانەوە هەڵدەگرێ، ئەگەر روداوێکیش رویدا ئاوایان بۆ لێك دەداتەوە دەگەڵ قسەکانی خۆی رێك کەوێ.

ئەگەر لەهەندێك مەسەلەی لاوەكیش ڕاست بكەن، ئەوە وەبەر سەرناسی و پێشبینی دەكەوێ، یان ئەوەتە ئەو وشە ڕاستەیە كە جنۆكە لە هەواڵەكانی ئاسمانیان ڕفاندوە، لە هەردو صەحیحان و موسنەدی ئەحمەددا لە عائیشەوە هاتوە، دەڵێ: دەربارەی پێشبینان پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا؟ فەرموی: ((لیسوا بشيء: هیچ نین))، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، جار وەیە شتی وا دەڵێن ڕاست دەردەچی! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((تلك الكلمة من الحق يخطفها الجني فيقرها في اذن وليه، فيخلطون فيها اكثر من مائة كذبة: ئەو وشە ڕاستە جنۆكەكە رایدەڕفێنیو دەیخاتە گوێچكەی دۆستەكەیو ئەوانیش زێتر لە سەد درۆیانی دەگەڵ تێكەڵ دەكەن)).

جا ئەگەر قسەكەی ڕاست دەرچو لە بابەت شتێك كە روی دابێ وەكو ناسینی دزو، زانینی ناوی كەسێكی بۆ یەكەم جار دێتە لای بە ناوی منداڵ و خێزانەكەیەوە، ئەوە ڕەنگە بەهۆی فێڵێكەوە بێ، وەكو ئەوەی یەكێك دادەنێ پرسیار لە خەڵكی بكا پێش ئەوەی بچنە لای، بەخۆشی ئامرازێكی بیستنی داناوە، یان شەیتانەكان ئەنجامی دەدەن، ئەگەر شەیتانەكانیش شتێك بزانن كە پێشتر روی داوە، چ سەیرو سەمەرە نیە.

### پێشبینەكان پەیامبەرانی شەیتانن:

ئیبنیقەییم لە (الاغاثة ٢٧١/١)دا دەڵێ: (پێشبینەكان پەیامبەرانی شەیتانن، چونكە هاوبەشكاران هەڵدەكوتنە لایان و لەمەسەلە مەزنەكانی خۆیان دەچنە لای ئەوان و، باوەڕیان پێدەكەن و بەڕاستیان دەزانن و حوكمیان دەبەنە لاو بە حوكمەكانیان رازی دەبن، هەروەكو شوێنكەوتەی پێغەمبەران بە پێغەمبەرانی دەكەن، چونكە باوەڕیان وایە پێشبینەكان پەنهان دەزانن و هەواڵی ئەو پەنهانانە دەدەن كە كەسی دیكە نایانزانێ، جا ئەمانە

لــەکن موشــریکان لــە پایــەی پێغەمبــەرانن و، بەڕاســتەقانی پێشــبینەکان پەیامبەرانی شەیتانن، بۆ لای کۆمەڵەکەی خۆی لە هاوبەشکاران دەیاننێریۆ بە پێغەمبەرە راستگۆکانیان دەچوێنیٚ، تاکو کۆمەڵی شەیتان هەرێیان بۆ دەکەن و، پێغەمبەرانی خوداش بەوان دەچوێنیٚ تا لێیان دور کەونەوەو، پەیامبەرانی خۆی بەڕاستگۆو پیوارزان دەردەخا، جا لەبەر ئەو دژاتیە مەزنەی لەنێوان هەردو جۆردا هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (من أتى كاهناً، فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد: ئەوی چوە لای پێشبینێك و ، باوەڕی بەقسەکانی کرد، ئەو کەسە کوفری کردوە بەوەی بۆ سەر موحەممەد دابەزیوە)).

جا خەڵکی دو بەشن: شوێنکەوتەی پێشبینان و، شوێنکەوتەی پێغەمبەران، ناکریٚ لەیەك بەندەدا شوێنکەوتەیی بۆ هەردولا کۆبێتەوە، بەڵکو چەندی لە پێشبینەکە نزیك بیٚ هێندە لە پێغەمبەر ﷺ دوردەکەوێتەوە، چەندێکیش پێشبینەکە بەڕاست بزانیٚ هێندە پێغەمبەر ﷺ وەدرۆ دەخاتەوە.

دەڵێم: هەر کەسێکی دیرۆکی نەتەوان وەخوێنیٚ دەزانیٚ پێشبین و جادوگەران لە پایەی پێغەمبەراندا وەستاون، بەڵام پەیامبەری شەیتان بون، جادوگەران و کاهینەکان قسەیان لەنێو هۆزەکانیاندا دەڕۆیی، حەڵاڵیان دەکردو حەرامیان دەکردو، ماڵ و سامانیان دەبردو، فەرمانیان بە جۆرەها پەرستش دەدا کە شەیتانەکان رازی کا، هەروەك فەرمانیان بە پچڕینی پەیوەندی خزماتی و ئابڕوبردنی خەڵکی دەکرد، عەققادیش لە کتێبی (ابيلس)دا هەندێکی لەم بابەتە خستۆتە ڕو.

**ئەرکی ئوممەت لە بەرامبەر ئەوانەدا:**

ئەوەی ئەستێرەگەرو فاڵچیو، جادوگەران بانگەشەی بۆ دەکەن گومڕاییەك و تاوانێکی گەورەیە، جا ئەوانەی خودای مەزن دینی خۆی پێ بەخشیون و، قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی فێرکردون، دەبێ بە قسە بەرهەڵستی لەم گومڕاییە بکەن و، ئەم ناڕەوایە بەبەڵگەو بیانو ئاشکرا بکەن.

ئەوانی دەسەڵاتیشیان لە دەستە پێویستە دەست بدەنە بەر ئەوانەی بانگەشەی پەنهانزانی دەکەن لە فاڵچی و پێشبین و بەردو رەمل لێدەرەوان و ئەوانەی لە دەست و لە فینجانان دەڕوانن و، پێویستە لەسەریان بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە پڕوپوچیانە لە گۆڤارو رۆژنامەکان قەدەغە بکەن و، سزای ئەوانە بدەن کە بە کۆڵان و جاداندا دەسوڕێنەوەو ئەم کارانە دەکەن.

خودای گەورەش سەرزەنشت و زەمی ئیسرائیلزادانی کردوە، چونکە وازیان لەبەرهەڵستی خراپە هێناوە: ﴿كَانُوا لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ: یەکتریان نەدەگێڕایەوە لەو کارە خراپانەی کە دەیانکرد بەڕاستی کاروکردەوەیان بەدو خراپ بو﴾ (سورة المائدة/٧٩).

لە سونەنیشدا لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە بە گێڕانەوەی ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه کە دەفەرموێ: ((إن الناس إذا رأوا المنكر فلم يغيروه أوشك أن يعمهم الله بعقاب منه: ئەگەر خەڵکی خراپەکاریان دیت و خۆیان لێ نەبان کردو نەیانگۆڕی رەنگە خودا بەسزایەکی خۆی گشتگیریان بکا)).

# جنۆکەو دەفرە فڕیوەکان

لەم ماوەیەدا قسە لە بابەت دەفرە فڕیوەکان زۆر بوە، تاوای لێهاتوە هیچ هەفتەیەك تێناپەڕی گوێمان لێ نەبێ کەسێك یا چەند کەسێك دەفرێکی فڕیویان دیتوە، یا بەفڕیوی لە ئاسمانێیان دیوە، یا بەنیشتویی لەسەر زەوی، یا هێندێ ئافەریدەی شێوەجیاواز لە مرۆڤیان دیوە کە لێی دێنە دەرێ، کار گەیشتوەتە ئەوەی وا بانگەشە دەکرێ هێندێك لەو ئافریدانە داوایان لە هەندێك خەڵك کردوە لەگەڵیان بچنە نێو دەفرەکان و پشکنیویانن وتێیان راماون.

ئەوانەی ئەو بانگەشانەش دەکەن بەتەنێ خەڵکانێکی سادە نین، بەڵکو پیاوانێکی دیارو ناوداری وەکو سەرۆکی وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکایان تێدایە، کە باوەڕی وایە لە ساڵی ١٩٧٣دا شتێکی فڕیوی بە ئاسمانی جۆرجیاوە دیوەو نەیزانیوە چیە.

ئەو سەرۆکە گرنگیەکی تایبەت بە ئافەریدەکانیتر دەدا، کە دەستیان کردوە بە هێرش هێنان بۆ زەوی، جا هەروەك لە رۆژنامەکاندا پەخش کراوە سەرۆکی ئەمریکی هێوارەیەکی تەواوی بە گفتوگۆ لەگەڵ زانایەك بەسەر بردوە کە باوەڕی وایە مرۆڤ تاکە ئافەرید نیە لەم بونەوەرە، (فرانك پرێس)ی راوێژکاری زانستی سەرۆك کارتەر لەم دانیشتنەدا لەگەڵیدا بو، لە پاش ئەمەش لەنێو تەماشاگەی نەتەوەیی کارتەر سەیری چەند فلیمێکی کرد پوختەی دوائەنجامی لێکۆلینەوەی ئەو ئافەریدانە بون کە لە دەرەوەی زەویدا

دەژین، (کارل ساگان)ی بەڕێوەبەری کارگەی تۆژینەوەگەردونیەکانی زانکۆی (کورنێلْ) ئەم فلیمانەی پیشان دا، کە هەمیشە ئاژانسی گەردونناسی ئەمریکا پرسی پیْ دەکاو دەگەڕێتەوە لای، لە بارەی مەسەلەی تایبەت بەو ئافەریدانەی بەدەر لە چوارچێوەی هەسارەی زەویدا دەژین، (بگەڕێوە بۆ رۆژنامەی السیاسە–ی کوێتی، ژمارە (٣٣٩٩) ١٩٧٧/١٢/٥).

هەروەها پاشکۆی (الهدف)ی کوێتی کە لە ١٩٧٨/٣/٢٣دا دەرچوە، ئەوە دەداتە پالْ (ماو چی تونگ)ی سەرۆکی پێشوی چین، کە بڕوای بە هەبونی ئافەریدیتر هەبوە لە هەسارەکانی تردا.

هەروەها نوسەری وتارەکە باس لەوە دەکا کە ٦١٪ی گەلی ئەمریکا باوەڕیان بەم مەسەلەیە هەیەو، رۆژنامە ئەمریکاییەکانیش وا هەلْدەبەستن کە نێزیکەی نیو ملیۆن ئەمریکایی ئەو دەفرانەیان دیوەو، هێندێك لەوانە توانیویەتی راستەوخۆ پەیوەندییان پێوە بکات.

(ستیڤن سبیلبێرگ)ی دەرهێنەری سینەمایی ئەمریکا فلیمێکی دەرهێنا بەناونیشانی (روبەڕو بونەوەیەك لە جۆری سێیەم) کە بیست و دو ملیۆن دۆلاری ئەمریکی تێچو.

فیلمەکە پاش کۆکردنەوەی زانیاری لەوانەی دەفری فڕیوین دیوە یا پەیوەندیان پێوە کردوە، هاتە بەرهەم.

بۆ یەکەم جاریش ئەو فلیمە لە کۆشکی سپی پیشان دراو، سەرۆکی ئەمریکا یەکەمین بینەری بو.

پاش بەرهەمهێنانی ئەو فلیمە، ئاژانسی گەردونناسی ئەمریکا، باوەڕی هات بە پێداویستی تۆژینەوەی ئەم بوارەو لە ساڵی ١٩٧٩دا ملیۆنێك دۆلاری بۆ لێکۆڵینەوەکان تەرخان کرد، ناوی لە پرۆژە نێهینیەکەش نا (سیتی)، پوختەی مەبەستی ئەم پرۆژەیە ناردنی ئامێری تایبەت بو بۆ ئاسمانی دەرەوە بۆ گەڕان بە دوای نامەی بێتەلی نێردراو لە هەسارەکانی ترەوە.

جا لە پاش ئەو چاوپێداخشاندنە، دەتوانین ئەم خالآنە بڕیار بدەین:

١- بواری بەدرۆ خستنەوەی ئافەریدەی نامۆی بێجگە لە مرۆڤ نیە، چونکە بە دەیان هەزارو سەدان هەزار دیویانن، منیش بۆ ماوەیەکی درێژ بەشوێن ئەو بابەتەدا گەڕام، نزیکەی هەمو هەفتەیەك وتارێك یا زێتر یا کەمترم دەدیت لەوە دەدوا کە کۆمەڵێك یا تاکەکەسێك شتێکی لەم جۆرەیان دیوە.

٢- خەڵکی داماون لە ئاست لێکدانەوەو زانینی حەقیقەتی ئەو دەفرانەو، حەقیقەتی ئەو ئافەریدانەی بەکاریان دەهێنن، بەتایبەتی کە خێرایی ئەو دەفرە خەیاڵیەو لەسەرو ئەوخێراییانەیە کە مرۆڤ دایهێناوە.

٣- ئەمن بەدڵنیاییەوە دەڵێم ئەو ئافەریدانە لە جیهانی جنۆکانن کە هاونشینی ئێمەن لەسەر زەویەکەمان، کە لەوی رابورد باسمان کردون و، ئەوەمان رون کردەوە کە هێزو توانایان زێترە لە توانای مرۆڤ و، خێراییان زیاترە لە خێرایی دەنگ و تیشك، هەروەکو توانای شێوەگۆڕینیان پێ‌دراوەو، دەتوانن بە شێوەو وێنەی جیاجیا خۆیان بە مرۆڤ نیشان بدەن.

لێرەدا میهرەبانی خودامان بۆ دەردەکەوێ کە ئەو راستیانەی پێ ناساندوین، بە تایبەتی کە ئێمە هەست بە سەرلێشێوان و دڵەڕاوکێ دەکەین

لەلای ئەوانەی ئەو شتانە نازانن کە ئێمە دەیانزانین، بە هۆی ئەوەش وزەی ئاوەزو توانای زانستی و ماڵ و سامانمان بۆ دەگەڕێتەوە، تاکو بەرەو لایەنێکی سوددار ئاڕاستەیان بکەین.

ڕەنگە هەندێك هەبن بپرسن چ رازێك هەیە کە ئەو دەفرانە لەم سەردەمە دەردەکەون و لەسەردەمانی پێشو دەرنەدەکەوتن، وەڵام ئەوەیە کە جنۆکە لەهەر سەردەمێکدا بەرگی تایبەتی بەبەردا دەکێشێ، ئەم سەردەمەش سەردەمی پێشکەوتنی زانستیە، بۆیە دەیانەوێ مرۆڤ گومڕا بکەن بەو شێوازەی کە سەرنجیان دەوروژێنێ و دەرونیان رادەچڵەکێنێ و خەڵکیش هەڵپەی ئەوە دەکەن شتێك لەبارەی گەردونی فراوان بزانن و لە ئەگەری هەبونی ئافەریدی جگە لە خۆیان بپێچنەوە.

# بەندی پێنجەم

## چەکی باوەڕدار لە جەنگان دژی شەیتان

# چەکی باوەڕدار لە جەنگان دژی شەیتان

**یەکەم- وشیاری و ئاگا لەخۆ بون:**

ئەم دوژمنە چەپەڵ و فێڵبازە مکوڕە لەسەر گومڕاکردنی ئادەمیزادو ئێمەش ئامانج و شێوازەکانی ویمان لە گومڕاکردن زانی، جا بە بڕی شارەزابون لەم دوژمنەو لە ئامانجەکانیو لە شێوازەکانیو، لەو ڕێچکانەی بۆ گومڕاکردنی ئێمە دەیانگرێتە بەر، دەتوانین خۆمانی لێ ڕزگار کەین، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لەم مەسەلانە بێئاگا بێ، دوژمنەکەی دیلی دەکاو چۆنی بوێ ئاوای ئاڕاستە دەکا، جا ئیبنیلجوزی لە (تلبیس ابلیس/٤٩)دا زۆر لێهاتوانە وێنەی ئەو کێشمەکێشمەی نێوان مرۆڤ و شەیتانی بۆ کێشاوین کە دەڵێ: (بزانە دڵ وەکو قەڵاتێك وایە کە شورەی لە دەور بێو، شورەکە دەرگەی تێدابێو کەلەبەریشی تێ کەوتبێ و عەقڵی تێدا نیشتەجێ بێ، جا فریشتە هاموشۆی ئەو قەڵاتەی بکەن و، مۆڵگەی ئارەزوەکانیشی لەپاڵدا بێ و شەیتانەکان بێ هیچ لەمپەرێك هاتوچۆی ئەم مۆڵگەیە بکەن و، شەڕیش لەنێوان دانیشتوانی قەڵاتەکەو مۆڵگەکە بەرپا بێ، شەیتانەکانیش بەردەوام لە دەوری قەڵاتەکە دەسوڕێنەوە، بەڵکو پاسەوانێك خافڵ بێو لە کەلەبەرێك خۆبپەڕێننەوە ژورێ، جا دەبێ پاسەوان هەمو دەرگەکانی قەڵاتەکە و هەمو کەلەبەرەکانی پێ بزانێ کە ئەسپاردەی کراون تا بیانپارێزێ، هەروەك نابێ یەك چرکەش لە پاسەوانی ساردبێتەوە، چونکە دوژمن ساردنابێتەوەو کۆڵ نادا.

پیاوێك لە حەسەنی بەصری پرسی: ئایا ئیبلیس دەنوێ؟ گوتی: ئەگەر بنوستبا حەسانەوەمان دەبو.

جا ئەم قەڵاتە بەیادی خودا روناکەو بەباوەڕ پڕشنگدارە، ئاوێنەیەکی رونی تێدایە، وێنەی هەمو ئەو شتانەی تێدا دەردەکەوێ کە پێیدا ڕەت دەبن، یەکەمین شتیش شەیتان لە مۆڵگەکەدا بیکا، بڵاوکردنەوەی چڕەدوکەڵە تادیوارەکانی قەڵاکە رەش کاو، نەینۆکەکە ژەنگ هەڵێنێ، جا تەواوی هۆش و بیر دوکەڵەکە دەڕەوێنتەوەو یادی خوداش نەینۆکەکە زاخاو دەدا.

دوژمن هێرش و شالاوانیش دێنی، جار هەیە لە قەڵاتێ وەژور دەکەوێ، پاسەوان دەستی لێ دەستێنێ و وەدەری دەنێ، جاری واش دەبێ وەژور دەکەوێو تێك دەداو ئەگەر بێئاگایی پاسەوانان شك ببا دەشمێنتەوە، رەنگە ئەو بایەی دوکەڵەکەش وەدەردەنێ دابمرکێو دیوارەکانی قەڵاتێ رەش هەڵگەڕێن و ئاوێنەکەش ژەنگ هەڵێنێ، جا شەیتان تێپەڕێ و کەسیش پێی نەزانێ، رەنگە پاسەوانیش لەبەر بێئاگایی بریندار بێو بکەوێتە داوی دیلیو بەکاریش ببرێ و فرت وفێلان هەڵیخێ بۆ رێکەوتن و یارمەتیدانی ئارەزو، تەنانەت ببیتە زانای خراپەکاریەکانیش.

**دوەم- دەستگرتن بە قورئان و سونەت:**

مەزنترین رێگەی خۆپاراستن لە شەیتان بریتیە لە دەستەبەری و پابەندبونی زانستیو کرداری بە قورئان و سوننەت، چونکە قورئان و سونەت راستەرێیان هێناوەو شەیتان کۆشش دەکا تا لەو شارێیە وەدەرمان نێو لارێمان کات، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ: ئەمە رێگەی منە کە راست و دروستە،

جا پێیدا بڕۆن و بەڕێبازی دیکەدا مەڕۆن، نەوەکو ئێوە لەڕێگەی خودا پەرتەوازەو جیا بکاتەوەو لاڕێبن، ئەمەیە خودا بە ئێوەی راسپاردوە، تا بەڵکو خۆپارێزبن ﴾ (سورة الأنعام/١٥٣).

پێغەمبەریش ﷺ ئەم ئایەتەی راڤە کردوەو رونی کردۆتەوە کە: بەدەستی خۆی هێڵێکی راکێشا، پاشان فەرموی: ((هذا صراط الله مستقيماً: ئەمە راستەڕێی خودایە))، جا هێلی دیکەی لە چەپەو راستەی کێشاو فەرموی: ((هذه السبل ليس منها سبيل إلا عليه شيطان يدعو اليه: ئەمانەش رێچکەن هیچ رێچکەیەکی تێدا نیە مەگەر شەیتانێکی لە سەرەو بانگەوازی بۆ دەکا))، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (رواه الامام احمد والحاكم وصححه النسائي).

جا شوێنکەوتنی ئەوەی لە خوداوە بۆمان هاتوە لە بیروباوەڕو کردەوەو گوفتارو پەرستش و یاساکان و وازهێنان لەو شتانەی نەرێیان لێکراوە، بەندە لە شەیتانی دەپارێزن، هەر بۆیەش خوای بەرز فەرمویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ: هۆ ئەوانەی بڕواتان هێناوە، هەموتان بڕۆنە نێو ئیسلام و ئاشتی و پەیڕەو و شوێنکەوتەی شەیتان مەبن، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە ﴾ (سورة البقرة/٢٠٨).

لێرەدا مەبەست لە ئاشتی ئیسلامە دەشلێن مەبەست تاعەتی خودایە، (موقاتیل)یش بەهەمو شێوەو جۆرەکانی چاکەکاری راڤەی کردوە، بەپێی ئەوە خودا فەرمانی بە بەندان کردوە کار بەهەمو لك و پۆپەکانی باوەڕ بکەن و بەپێی توانا هەمو یاساکانی ئیسلام پیادە بکەن، ونەرێی لێ کردون شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەون، جا ئەوەی دێتە ناو ئیسلام لە شەیتان و

هەنگاوەکانی دور دەکەویتەوە، ئەوەی شتێکی ئیسلامیش جێبێلی شوێن هەندێك لە هەنگاوەکانی شەیتان کەوتوە، هەر بۆیەش حەلاڵ کردنە حەرام و، حەرام کردنە حەلاڵ و، حەرام و گەندەخۆری و خراپەکاری، ئەمانە هەمو شونهەڵگرتنی شەیتان و شوێنکەوتنی هەنگاوەکانیەتی کە نەرێمان لێکراوە: ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلالاً طَيِّبًا وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ: ئەی خەڵکینە، ئەوی لە زەویدا پاك و حەلاڵە بیخۆن و شونی هەنگاوی شەیتان هەڵمەگرن و پەیرەوی مەکەن، بەڕاستی بەئاشکرا ئەو دژمنی ئێوەیە ﴾ (سورة البقـرة/١٦٨)، جا دەستەبەری قورئان و سونەت بە قسەو کردەوە شەیتان دەردەکاو رقێکی ئەستوری هەڵدەستێنێ، موسلیم لە صەحیحەکەی و ئەحمەد لە موسنەدەکەی و ئیبنیماجە لە سونەنەکەی لە ئەبوهورەیرەﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((إذا قرأ ابن آدم السجدة فسجد اعتزل الشيطان يبكي، يقول: ياويله امر ابـن آدم بالسجود فسجد فله الجنه، وامرت بالسجود فعصيت فلي النـار: ئەگەر ئادەمیزاد سوژدەی خوێندو سوژدەیەکی برد، شەیتان گۆشەگیردەبێ و دەگری، دەڵێ: هاوار لەخۆم، ئادەمی فەرمانی سوژدەی پێکراو سوژدەی برد جا بە هەشتی بۆ دەبێ‌و، منیش فەرمانی سوژدەم پێکراو یاخی بوم، جا ئاگر دەبێتە مایەی من)).

### سێیەم- پەنا بۆ خوا بردن و خۆپاراستن بە خوا:

چاکترین رێگە بۆ خۆپاراستن لە شەیتان و سەربازەکانی پەنابردن و خۆپاراستنە بەئاستانەی خوداو، هاناوەبەر بردنیەتی لە شەیتان، چونکە خودا توانای بەسەر شەیتاندا هەیە، جا ئەگەر دالدەو پەنای بەندەی خۆیدا شەیتان چۆن دەتوانێ بیگاتێ، خودای بەرز دەفەرموی: ﴿ خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ

عَنْ الْجَاهِلِينَ۝ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنْ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ: لێبوردن بگرە پێش و بە چاکەکاری فەرمان بدەو رو لە نەفامان وەرگێڕەو، هەر کاتێك وەسوەسەیەکی شەیتانت پێ‌بگا، پەنا ببە بەر خودا، بەڕاستی ئەو بیسەرو زانایە ﴾ (سورة الأعراف/١٩٩-٢٠٠).

خودای گەورەش فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە خۆی بەخودا پەنابگرێ لە بەدگۆیی‌و وئامادەبونی شەیتانەکان ﴿ وَقُلْ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ۝ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ: بڵێ؛ ئەی پەروەردەگارم من خۆم پەنا دەگرم بە تۆ لە وەسوەسەو دو دڵی شەیتانەکان، پەروەردگارم هەروەها خۆم بە تۆ دەسپێرم لە ئامادە بونی ئەوان ﴾ (سورة المؤمنون/٩٧-٩٨)، مەبەست بە (همزات الشياطين) وەسوەسەو تیختیخەدانیانە بۆ خراپەکاری، جا خودا فەرمانمان پێدەدا خۆ بەوی پەنابگرین لە شەیتانی دوژمن و کە هیچ مەرایی و چاکەیەك لە مرۆڤ قبول ناکا، لەبەر توندی دوژمنایەتیەکەی لەگەڵ ئادەم بەتەنیا تونابونی ئادەمیزادی مەبەستە. ئیبنی‌کەثیر لە تەفسیرەکەیدا (٢٨/١) دەڵێ: (الاستعاذة) هانابردنە بۆ خودای بەرزو لکانە بە ئاستانەی وی لە شەڕی هەمو شەڕخوازێك..

مانای (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم)یش وایە کە بە ئاستانەی خوا پەنا دەگرم لە شەیتانی بەردباران کراو، نە لەدینم و نە لەدنیام زیانم پێ‌نەگەیەنێ یا ڕێی ئەو کردەوانەم لێ بگرێ فەرمانم پێکراوە، یا گاڵم دا بۆ کردنی ئەوانەی نەرێم لێکراوە، چونکە تەنها خودا شەیتان لە مرۆڤ دور دەخاتەوە، بۆیەش خودا فەرمانی‌داوە لەگەڵ مرۆڤی شەیتان چاکەکاری بنوێنین، بەڵکو سروشتەکەی لەو خراپەکارییەی دەری دێنێ، فەرمانیشی پێکردوین پەنای وەبەر ببەین لە شەیتانی جنۆکە، چونکە ئەمیان بەرتیل وەرناگرێ و چاکەکاری

کاری تیٚناکا، چونکە هەر بە سروشت شەڕخوازو بەدکارەو بەو خودایە نەبیٚ کە ئەفراندویەتی لە کۆڵت نابتەوە).

پیٚغەمبەریش ﷺ بەزۆر شیٚوازی جودا پەنای دەبردە بەر خودا لە شەیتانی لە پاش دوعای دەسپیٚکی نویٚژیٚ دەیفەرمو: ((اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من همزة ونفخه ونفثه: خۆ پەنا دەدەم بەخوای بیسەری زانا لە شەیتانی بەردباران کراو، لە خنکاندن و لە زلفیزی و لە شیعری شەیتانی)) (رواه اصحـــاب السنن الاربعة).

## خۆ پەنادان لە کاتی چونە سەر پیٚشاو:

هەروەها کە دەچوە سەر پیٚشاو، خۆی پەنا دەدا لە نیٚریٚنەو لە میٚینەی شەیتانان هەروەك لە هەردو صەحیحاندا لە ئەنەسی کوڕی مالیك‌ رضي الله عنه دەڵیٚ: کە پیٚغەمبەرﷺ دەچوە سەر پیٚشاو دەیفەرمو: ((اللهم اني اعوذ بـــك مـــن الخبـــث والخبـــائث: خودایە من خۆم بە تۆ پەنا دەگرم لە نیٚرینەو میٚینەی شەیتانە پیسەکان)).

لە موسنەدی ئەحمەدو سونەنی ئەبوداوددا بە ئیسنادیٚکی صەحیح لە زەیدی کوڕی ئەرقەم، دەڵیٚ: پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((ان هـــذا الحشـــوش محتضرة، فإذا اتى احدكم الخلاء فليقل: اعوذ بالله من الخبث والخبـائث: ئەم بیٚستانانە ئاوەدانن، جا ئەوی چوە سەر پیٚشاویٚ بابڵیٚ: اعوذ بالله من الخبث والخبائث))

## خۆپەنادان لەکاتی توڕەبون:

دو کەس لەلای پیٚغەمبەر ﷺ قسەیان پیٚك گوت، یەکیٚکیان زۆر توڕە بو بگیٚڕەوەی فەرمودەکە دەڵیٚ؛ وام هەست دەکرد وا لە داخان و لە توڕەییان پارچەپارچە دەبیٚ، جا پیٚغەمبەرﷺ فەرموی: ((اني لأعلم كلمة لو قالها لذهب عنـــه

ما يجد من الغضب: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیلێ، سارد دەبتەوەو تورەییەکەی دەڕوا))، گوتیان: ئەو وشەیە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: ((اللـــهم اني اعوذ بك من الشيطان الرجيـم: خودایە، من خۆم بە تۆ پەنا دەگرم لە شەیتانی نەفرەت لێکراو)). رواه البخاري ومسلم وابوداود واحمد وهذا لفظ احمد.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە هاوەڵانی خۆی فێرکرد کە بڵێ: ((اللهم فاطر السموات والأرض، عالم الغيب والشهادة، لا إله إلا انت، رب كل شيء ومليكه ، اعـوذ بك من شر نفسي، ومن شر الشيطان وشركه، وان أقترف على نفسي سوءاً، او أجرّه إلى مسـلم: خودایە! ئەی وەدیهێنەرو ئافەریدگاری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و دیار، لە تۆ بترازێ چ خواوەندێکی دیکە نیە، پەروەردگارو پاشای هەموشتێکی، خۆم بە تۆ پەنا دەگرم لە خراپەی نەفسم و لە خراپەکاری شیرکی شەیتانیو، لەوەی کە بەدکاریەك لە ئاست نەفسی خۆمدا بکەم، یا موسڵمانێك پەلکێشی خراپەو بەدکاری بکەم)) رواه الترمذي باسناد صحيح(صحيح الجـامع ٥٦/٦).

## خۆ پەنادان لەکاتی سەرجێیی کردندا:

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فێری کردوین کە پیاو دەچێتە لای خێزانی بڵێ: ((بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا، فانه لوقضى بينهما ولد مـن ذلك لم يضـره الشـيطان ابـداً: بەناوی خودا، خودایە، شەیتانمان لێوەلادەو، شەیتان لەوەش لادە کە بە ئێمەی دەبەخشی، ئەگەر لەو شەویدا منداڵێکیان لە نێواندا پەیدا بو، شەیتان هەرگیز زیانی پێ ناگەیەنێ)) متفق عليه.

هەروەها ئەگەر مرۆڤ چوە دۆڵێك یا چوە ماڵێك پێویستە پەنا بە خودا بگرێ نەك پەنا بە جنۆکە و شەیتانان بگرێ هەروەك ئەهلی نەفامی دەیانکرد و

بۆ نمونه دەیانگوت: خۆ بە گەروەی ئەم دۆڵەی پەنا دەگرم لە هەرزەکانی قەومەکەی.

جا لە ئاکامیش جنۆکەکان لە خۆبایی بون و ئازاریان دان، هەروەك خودای گەروە لە سورەتی (الجن)دا بۆمان دەگێڕێتەوە: ﴿ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا: زۆران ئادەمی پەنایان دەبردە بەر جنۆکان کە بیانپارێزن، کەچی پتر ماندویان کردن ﴾ (سورة الجن/٦).

هەرچی موسڵمانیشە، پێغەمبەر ﷺ چاکی ڕێنمایی کردوە کە دەفەرمێ: ((لو ان احدکم إذا نزل منزلاً قال: اعوذ بكلمات الله التامة من شرّ ما خلق، لم يضـره في ذلك المنزل شيء، حتى يرتحل منــــه: ئەگەر هەریەکێك لە ئێوە کە لە نشینگایەك دابەزی گوتی: خودایە خۆم بەوشە تەواوەکانی تۆ پەنا دەگرم لە شەڕی ئەوەی کە خۆت ئافەریدەت کردون، لەم نیشنگەیەدا هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێ، تا لەوێ باردەکا)) رواه ابن ماجة باسناد صحيح.

**پەناگرتن بەخودا لە شەیتان، لەکاتی بیستنی زەڕینی کەر:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((إذا نهق الحمار فتعوذوا بالله من الشيطان الرجيم: ئەگەر کەر زەڕی، خۆتان بەخودا پەنا بگرن لە شەیتانی نەفرەت لێکراو)) رواه الطبراني في معجمه الكبير باسناد صحيح (راجع صحيح الجامع ١/٢٨٦).

لە پێشدا باسی ئەوەشمان کرد ئەگەر بەشەو کەرێك زەڕی شەیتانێکی دیوە.

**خۆپەنادان لە کاتی خوێندنەوەی قورئان:**

**خودای بەرز دەفەرموێ:** ﴿ فإذا قرأت القرآن فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم. إنه ليس له سلطان على الذين آمنوا وعلى ربهم يتوكلون: **جا کاتێك قورئان دەخوێنی، لە پیلانی شەیتانی دەرکراو پەنا ببە بەر خودا. بەڕاستی شەیتان بەسەر کەسانێکی بڕوادارو پشت بەخوا بەستو دەسەلاتی نیە** ﴾ (سورة النحل/٩٨-٩٩).

**جا ئیبنیقەییم لە (اغاثة اللهفان ١/١٠٩)دا، بۆمانی رون کردۆتەوە، حیکمەت چیە لە خۆپەنادان بەخودا لە شەیتان کاتی خوێندەوەی قورئان، و دەڵێ:**

**١-قورئانی پیرۆز چارەسەرە بۆ ئەو شتانەی لە سینەکاندا هەن، هەمو وەسوەسەو ئارەزو و ویستێکی گەندەڵ لا دەبا کە شەیتان لە دلانی دەهاوێ، دەرمانی فەرمانی شەیتانە بۆ دڵ، جا فەرمان کراوە کەرەستەی دەردەکە لابەین تا شوێنی لە دڵدا خاڵی بێ هەتاکو دەرمانەکە شوێنی خۆی دەگرێو دەستی لێ دەستێنێو کاری لێ دەکا، هەروەك دەڵێن:**

أتاني هواها قبل ان اعرف الهوى
فصـــادف قلباً خاليا فتمكنـــــا

**واتە: ئارەزوەکەی وی هاتە لام پێش ئەوەی ئارەزوان بناسم، روبەڕوی دلێکی چۆڵ بۆوە، جا دەستی لێ ستاند.**

**ئەو دەرمانە چارەسەرە دێ بۆ دلان و مەیدانیشی بۆ چۆڵ بوە، جا تێیدا سەردەکەوی.**

**٢- هەروەها قورئان کەرەستەو بابەتی رێنوێنیو زانست و چاکەیە لە دڵدا، هەروەکو ئاو کەرەستەی روەکە، جا شەیتان ئاگرێکە یەك یەکە روەکەکان**

دەسوتێنیٚ، هەر کاتێك هەست بە روەکی چاکە بکات لە دلدا هەولٚ دەدا دایبڕزێنیٚ و بیسوتێنیٚ، جا فەرمانمان پێکراوە خۆ پەنا بدەین بەخودای بەرزو تەوانا نەکو ئەوەمان لیٚ تێك دا کە بەهۆی قورئانیٚ دلٚ وەدەستی دێنیٚ، جیاوازیش لەنێوان ئەم خالەو خالی یەکەم ئەوەیە کە خۆپەنادان لە خالی یەکەم بۆ دەسخستنی سودی قورئان، کەچی لێرەدا بۆ مانەوەو پاراستنی سودەکەیە.

٣- فریشتەکان لە قورئانخوێن نێزیك دەکەونەوەو گویٚ بۆ خوێندەوەکەی رادەدێرن، هەوەکو لە فەرمودەی ئوسەیدی کوڕی خوضەیردا هاتوە کاتێك قورئانی دەخوێند وەك سێبەرێکی دیت کە چرای تێدا بو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو کە ئەوانە فریشتە بون، شەیتانیش دژو دوژمنی فریشتەیە، بۆیەش قورئانخوێن فەرمانی پێکراوە داوا لە خودای بەرز بکا دوژمنەکەی لیٚ دور بخاتەوە، تاکو فریشتەکان بێنە لای، چونکە ئەمە پایەیەکە فریشتەو شەیتانەکانی تێدا کۆنابنەوە.

٤- هەروەها شەیتان بە سوارو پیادەکانیەوە دێنە سەر قورئانخوێن هەتا لە مەبەستەکەی بە قورئانخوێندنەکە بیخافلێنی کە لیٚ وردبونەوەو تیٚڕامان و تێگەیشتن و زانیاریە لەوەی خودا فەرمویەتی، جا بە هەمو توانستی خۆی دەکۆشیٚ بۆ ئەوەی دلٚ وەدورخا لە مەبەستی قورئان خوێندن، بەمەش خوێنەرەکە لە سودی تەواو بیٚبەش دەبیٚ، جا فەرمانی پێکراوە کە دەستی بە قورئان خوێندنی کرد خۆی پەنادا بەخوا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو.

٥- هەروەها قورئانخوێن موناجاتی خودا دەکا بە فەرمودەکانی خۆی، خوداش گویٚ راگرترە بۆ قورئانخوێنی دەنگخۆش لە یەکێك کە حەزی لە گۆرانی بیٚو کەنیشکەکەی بۆی بلیٚ، شیعرو گۆرانیش خوێندنەوەی شەیتانن،

جا قورئان خوێن فەرمانی پێدراوە بە پەناگرتن شـەیتان وەدەرنـێ لـە کـاتی موناجاتی خودای بەرزو گوێ راگرتنی پەروەردگار بۆ خوێندنەوەکەی.

٦- هـەروەها لـە حیکمەتـەکانی خۆپـەنادان ئەوەیە؛ خـودای بـەرز هـەواڵی پێداوین کە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ لە کاتی خوێندنـەوەدا شەیتان شتی بۆ تێخستون، جا ئەگەر ئەوە کردەی شەیتان بێ لەگەڵ پێغەمبەران (علیهم السلام)، دەبێ لەگەڵ خەڵکی دی چۆن بێ.

هـەر بۆیـەش قورئان خوێـن جـار هەیـە هەڵـەدەکاو جـار هەیـە لێـی تێکـەڵ دەبێ‌و، دەپەشۆکێ‌و زمانی تێك دەئاڵێ، یا زەینی‌و دڵی تووشـی پەشـۆکان دێن، جا ئەگەر شەیتان لەکاتی قورئانخوێندندا لەوێ بوو، خوێنەر لە یەك لەو دوو شتە دەرباز نابێ‌و، رەنگە تووشی هەردووکانیش بێ.

٧- شەیتان ئەو کاتە لەسەر مرۆڤ مکوڕترە کە مرۆڤەکە تەمای چاکەیەکی هەبێ یا بە کاری چاکەوە خەریك بێ، لەو کاتە شەیتان لەسەری توندتر دەکا تا لە کارەکەی دابڕێ.

**پەنادانی منداڵ و خانەوادە:**

پێغەمبەر ﷺ حەسەن و حوسەینی پەنادەداو دەیفەرمو: ((اعیذکما بکلمـات الله تامة، من کل شیطان وهامة، ومن کل عین لامة، ثم یقول؛ هکذا کان ابي ابراهیـم ﷺ یعوذ اسماعیل واسـحق: هـەرودووکتان پـەنادەدەم بە وشـە تـەواوەکانی خـودا، لـە هـەموو شـەیتانێك و لـە هـەموو چاوێکی پیـس، پاشـان دەیفـەرمو: ئیبراهیمی باوکم ﷺ بەم شێوەیە ئیسماعیل و ئیسحاقی پەنادەدا)) (اخرجاه في الصحیحین).

ئەبو بەکری کوڕی ئەلئەنباری دەڵێ: (الهامة) تاکی (الهوام)ەو دەڵێن: بریتیە لە هەموو سروەیەك کە خراپەیەك ئەنجام بدا، (لامة) بەواتای (الملمة: چاوی

پیس) بۆیەش فەرمویەتی (لامة) تا لەگەڵ بێژەی (هامة) ڕێك بکەوی و لەسەر زمانی سوکتر بێ (تلبیس ابلیس/٤٧).

## چاکترین پەناگە بۆ ئەوانەی خۆ پەنا دەگرن:

چاکترین پەناگە بۆ پەناگران هەردوو سورەتی (الفلق)و (الناس)ە، لە عوقبەی کوڕی عامیر هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ان الناس لم یتعوذوا بمثل هاذین: (قل اعوذ برب الفلق)و (قل اعوذ برب الناس): خەڵکی خۆیان بەشتێك پەنا نەگرتووە وەکو هەردوو سورەتی (قل اعوذ برب الفلق)و (قل اعوذ برب الناس) )) رواه النسائي.

## پەندێکی مەزن:

لە هەندێك پێشینان دەگێڕنەوە کە بە قوتابییەکەی خۆی گوت: (چ دەکەی ئەگەر شەیتان گوناهی بۆ ڕازاندیەوە؟ گوتی: جیهادی لەگەڵ دەکەم، گوتی: ئەگەر هاتەوە؟ گوتی: جیهادی لەگەڵ دەکەم، گوتی: ئەگەر هاتەوە؟ گوتی: جیهادی لەگەڵ دەکەم، گوتی: جا ئەمە زۆر درێژە دەخایەنێ، ئەدی ئەگەر بەناو ڕانەمەڕێکدا تێپەڕیت و سەگەکەی پێت وەڕی و نەبهێشت ڕەت بی، گوتی: هەوڵی لەگەڵ دەدەم ودەیگێڕمەوە، گوتی ئەمە زۆر دەخایەنێ هانا وەبەر خاوەنەکەی ببە لە کۆڵتی دەکاتەوە) (تلبیس ابلیس/٤٨).

جا ئەمە پەندێکی گەورەو تێگەیشتنێکی مەزنە لەم زانا پایەدارەوە، چونکە خۆ پاراستن بە خوداو هانا وەبەربردنی تاکە ڕێیەکی بەهێزە شەیتان وەدەردەنێ و دووری دەخاتەوە، دایکی مەریەمیش وای کرد کە گوتی: ﴿ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: منیش مەریەم و زارۆکەکانی دەخەمە پەنای تۆ، تا لە شەڕی شەیتان دووربن ﴾ (سورة آل عمران/٣٦).

**گومانێك:**

هەندێك كەس هەن دەڵێن خۆ پەنا دەدەین بەخوا لەگەڵ هەندێشدا هەست دەكەین شەیتان وەسوەسەمان بۆ دەكاو بۆ خراپە دەنەمان دەدا لە نوێژەكانمان دەمانخافڵێنێ.

لە وەرامدا دەڵێین؛ خۆ پەنادان وەكو شمشێری دەست جەنگاوەر وایە، ئەگەر دەست و بازووی بەهێز بێ، رەنگە دوژمنەكەی بكوژێ، ئەگەرنا رەنگە هەر كاری تێنەكا هەر چەندە تیغەكەی دەبانیش بێ.

بەم شێوەیە خۆپەنادانی پارێزكاری بەتەقوا ئاگرێكە شەیتان دەسوتێنێ، ئەگەر لە بابایەكی باوەڕلاوازەوەش بێ ئەو كاریگەریە بەهێزەی بۆ دوژمن نابێ.

ئەبولفەرەجی ئیبنیجەوزی رضي الله عنه لە (تلبیس ابلیس/٤٨)دا دەڵێ: نمونەی شەیتان لەگەڵ مرۆڤی پارێزكارو مرۆڤی بێتەقوا، وەكو پیاوێكە دانیشتبێ خواردن و گۆشتی لە پێش بێ، سەگێكی بەلادا تێپەڕێ، ئەویش چەغەی لێبكاو سەگەكە بڕوا، جا ئەو سەگە بەلای یەكێكی دیكە تێپەڕێ ئەویش خواردن و گۆشتی لە بەردەم بێ، بەڵام هەر چەند چەغە لە سەگەكە بكا، وازی لێنەهێنێ و جێی نەهێڵێ، جا پیاوی یەكەم وەكو مرۆڤێكی پارێزكارو بەتەقوایە كە شەیتان بەلایدا ڕەت دەبێ هەر بەیادی خودا دەری دەكا، دووەم كەسیش وەكو بابای كەم تەقوایە كە هەر شەیتانی لێ دانابڕێ، خودا پەنامان بدا لە شەیتان.

جا ئەو موسڵمانەی دەیەوێ لە دەست شەیتان و تەڵەو داوەكانی رزگار بێ، دەبێ خۆی بە بەهێزكردنی باوەڕی و خۆ پاراستن بە خوداو هاناوە بەر بردنی و توانا لێخواستنی خەریك بكا.

**چوارەم- خەریك بوون بە یادی خودا:**

یادی خودا مەزنترین شتە کە بەندە لە شەیتان رزگار بکا، باسی ئەو فەرمودەیەش دێتە پێشێ کە تێیدا یەحیای پێغەمبەری خوا بە پێنج شتان فەرمان بە ئیسرائیلیان دەکا، لەوانە دەڵێ: (فەرمانتان پێ دەکەم یادی خودای بەرز بکەن، چونکە ئەمە وەك ئەوە وایە کە دوژمن زۆر بە هەڵەداوان بەدوای پیاوێك کەوتبێ، تا کابرا دەکاتە قەڵایەکی پتەوو خۆی تێدا چەپاڵەدەدا، هەر ئاوا بەندەش تەنها بەیادی خودا دەتوانێ خۆی لە شەیتان بپارێزێ)، ئیبنیقەییم لە (الوابل الصیب/٦٠)دا دەڵێ:(جا ئەگەر یادی خودا تەنها یەك سودی هەبا، دەبوایە بەندە زمانی هەر بۆ یادی خودای بەرز بگەڕێو بە یادەوەری پاراو بێ ، چونکە بە یادی خودا نەبێ ناتوانێ خۆی لە دوژمنەکەی چەپاڵە بدا، ئەو دوژمنەش هەر لە دەرگەی خافڵان و خەریك بوون لێی دەچێتە ژورێ و، هەمیشە بۆی لەکەمین دایە، هەر کاتێکی خافڵ بێ خۆی تێ دەکاو تێکیدەشکێنێ، بەڵام ئەگەر یادی خودای کرد ئەو دوژمنەی خودا هەڵدێ و بچووك دەبتەوەو زەلیل دەبێ، هەتا لە چۆلەکە بچووکتر دەبتەوەو وەك مێشی لێ دێ، هەر بۆیەشە بە (الوسواس الخناس) ناوزەد کراوە، واتە وەسوەسە لە دڵاندا دەکاو، کە یادی خودا دەکرێ هەڵدێ و ئەو جێدێڵێ و وازدەهێنێ، ئیبنیعەبباس دەڵێ: شەیتان لەسەر دڵی ئادەمیزاد رۆنیشتووە، ئەگەر بێئاگاو خافڵ بێ وەسوەسە دەکا، بەڵام ئەگەر یادی خودا بکا هەڵدێ و وازدەهێنێ.

هەروەها ئیبنیقەییم لە (ص١٤٤)دا دەڵێ: (لەگەڵ ئەوەی شەیتانەکان دوژمنی بەندەن، چوار دەوریان گرتووە؛ گومان بە چی دەبەی کە پیاوێك لە هەر چوار لاوە بە دوژمنانی رق ئەستوری دەورەدرابێ و، هەریەکەیان چەندی

**پیّ بکریّ ئازارو ئەشکەنجەی بدات، تاکە ڕێگەش بۆ پەرتەوازە کردنیان هەر یادی خودای بەرزو بەدەسەڵاتە).**

**لە پاش ئەوە ئیبنیقەییم فەرمودەکەی عەبدوڕەحمان کوڕی سەمورەی هێناوەتەوە کە دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، بە سەرمانەوە وەستاو فەرموی:** ((إني رأيت البارحة عجباً، رأيت رجلاً من أمتي أتاه ملك الموت ليقبض روحه، فجاءه بره بوالديه، فرد ملك الموت عنه، ورأيت رجلاً قد بسط عليه عذاب القبر، فجاءه وضوؤه فاستنقذه من ذلك، ورأيت رجلاً من أمتي قد احتوشته الشياطين، فجاءه ذكر الله عز وجل، فطرد الشيطان عنه، ورأيت رجلاً من أمتي قد احتوشته ملائكة العذاب، فجاءته صلاته فاستنقذته من أيديهم، ورأيت رجلاً من أمتي يلتهب –وفي رواية: يلهث – عطشاً كلما دنا من حوضٍ منع وطرد، فجاءه صيام شهر رمضان، فاسقاه وارواه، ورأيت رجلاً من امتي، ورأيت النبيين جلوساً حلقاً حلقاً، كلما دنا إلى حلقةٍ طرد، فجاءه غسله من الجنابة، فأخذ بيده، فاقعده إلى جنبي، ورأيت رجلاً من أمتي بين يديه ظلمة، ومن خلفه ظلمة، وعن يمينه ظلمة، وعن يساره ظلمة، ومن فوقه ظلمة، ومن تحته ظلمة، وهو متحير فيها، فجاءه حجه وعمرته، فاستخرجاه من الظلمة، وادخلاه في النور، ورأيت رجلاً من أمتي يتقي بيده وهج النار وشرره، فجاءته صدقته، فصارت سترة بينه وبين النار، وظللت على رأسه، ورأيت رجلاً من أمتي يكلم المؤمنين ولا يكلمونه، فجاءته صلته لرحمه فقالت: يامعشر المسلمين، إنه كان وصولاً لرحمه فكلموه، فكلمه المؤمنين وصافحوه وصافحهم، ورأيت رجلاً من أمتي قد احتوشته الزبانية، فجاءه امره بالمعروف ونهيه عن المنكر، فاستنقذه من ايديهم، وادخله في ملائكة الرحمة، ورأيت رجلاً من أمتي جاثياً على ركبتيه، وبينه وبين الله عز وجل حجاب، فجاءه حسن خلقه، فاخذ بيده، فادخله على الله عز وجل، ورأيت رجلاً من أمتي قد ذهبت صحيفته من قبل شماله، فجاءه خوفه من الله عز

وجل، فاخذ صحيفته فوضعها في يمينه، ورأيت رجلاً من أمتي خف ميزانه، فجاءه افراطه فثقلوا ميزانه، ورأيت رجلاً من أمتي قائماً على شفير جهنم، فجاءه رجاؤه في الله عز وجل، فاستنقذه من ذلك ومضى، ورأيت رجلاً من امتي قد أهوى في النار، فجاءته دمعته التي بكى من خشية الله عزوجل، فاستنقذته من ذلك، ورأيت رجلاً من أمتي قائماً على الصراط يرعد كما ترعد السعفة في ريح عاصف، فجاءه حسن ظنه بالله عز وجل، فسكن رعدته ومضى، ورأيت رجلاً من أمتي يزحف على الصراط، ويحبو احياناً، ويتعلق أحياناً، فجاءته صلاته علي فاقامته على قدميه، وانقذته، ورأيت رجلاً من أمتي انتهى إلى ابواب الجنة فغلقت الأبواب دونه، فجاءته شهادة أن لا إله إلا الله، ففتحت له الأبواب وادخلته الجنة: **دوێنێکه شتێکی سەیرەم دیت: پیاوێکم دیت لە ئوممەتی خۆم فریشتەی مەرگەوان هاتبووە لای تاگیانی بکێشی، جا چاکەکاری بەرامبەر دایك و باوکی هاتن و، مەرگەوانیان لێی گێڕاوە، پیاوێکشم دیت ئەشکەنجەی گۆڕی بۆ ئامادە کرابوو، جا دەستنوێژەکەی هات و لەو ئازارو ئەشکەنجەیە قوتاری کرد، پیاوێکیشم دیت لە ئوممەتی خۆم کە شەیتانەکان دەوریان لێدابوو، یادی خودا هات و شەیتانی دەرکرد، پیاوێکی دیکەم دیت لە ئوممەتی خۆم فریشتەکانی ئەشکەنجەدان دەوریان تەنیبوو، نوێژەکەی هات و لەدەستی دەرێنان، پیاوێکی ترم لە ئوممەتی خۆم دی لە تێنان هێنکەی براببوو هەڵدەقرچا، هەرکە لە ئەستێڵکێك نێزیك دەبۆوە، رێی لێ دەگیراو دەردەکرا، رۆژی مانگی رەمەزان هات، تێراوی کردو بری شکاند، پیاوێکیشم دیت لە ئوممەتی خۆم، پێغەمبەرانیشم دیتن کۆڕکۆڕ بازنەیان بەستبوو، ئەو پیاوە لەهەر کۆڕێك نێزیك دەبۆوە دەردەکرا، غوسلی لەش پیسی هات و دەستی گرت و، هێنای لە پاڵ منی دانا، پیاوێکیشم دیت لە ئوممەتی خۆم بەردەمی تاریك بوو، پشت سەری تاریك بوو، لای راستی تاریك بوو، لای چەپیشی هەر تاریك**

بوو، سەرەوەی هەر تاریك وخوارەوەشی هەر تاریك بوو، ئەویش لە نێو ئەو تاریکیانەدا سەرگەردان بوو، جا حەج و عومرەکەی هاتن و لە تاریکیی دەریان هێناو، بردیانە نێو روناکی، پیاوێکی دیم لە ئوممەتی خۆم دیت، بە دەستەکانی خۆی لە کلپەو بڵێسەی ئاگر دەپاراست، خێروماڵبەخشینەکەی هات و، بووە لەمپەرێك لە نێوان وی و ئاگرداو سایەی لەسەری کرد، پیاوێکیشم لە ئوممەتی خۆم دیت قسەی لەگەڵ بڕواداران دەکرد کەسیش لەگەڵەوی نەدەدوا، جا سیلەی رەحمی هاتە لای و گوتی: هۆگەلی موسڵمانان، ئەمە سیلەی رەحمی دەگەیاند جا قسەی لەگەڵ بکەن، ئەو جا بڕواداران کەوتنە ئاخاوتن لەگەڵیداو دەستی یەکتریان گوشی، پیاوێکی دیکەم لە ئوممەتی خۆم دیت فریشتە ئاگرەوانەکان دەوریان دابوو، فەرمانەکانی بەچاکە و بەرهەڵستی کردن لەخراپە هات و، لەدەستی دەرهێنان و رزگاری کرد و، بردیە نێو فریشتەکانی میهرو بەزەیی، پیاوێکیشم لە ئوممەتی خۆم دیت کەوتبوە سەر هەردو چۆکان و، پەردەیەك لە نێوان ئەو و خودای بەرزدا بو و، رەوشت و رەفتاری جوانی هات و، دەستی گرت و بردیە لای خودای مەزن، پیاوێکی ترم دیت لە ئوممەتی خۆم کردەوەنامەکەی درابووە دەستە چەپی، ترسانی لە خودای گەروە هات و کارنامەکەی وەرگرت و دایە دەستەڕاستی، پیاوێکی دیم دیت لە ئوممەتی خۆم تای ترازوی خێری سوك بوو، ئەو زاروکانەی کە بە بچووکی مردبوون هاتن و تای ترازوەکەیان قورس کرد، پیاوێکیشم دیت لە ئوممەتی خۆم لەسەر لێواری دۆزەخ راوەستابوو، جا تکاکانی لە خودای گەورە هات و، لەوێ دەربازی کردو رۆیشت، پیاوێکیشم دیت لە ئوممەتی خۆم بۆ ناو ئاگری هەڵدێرا، ئەو فرمێسکەی هات کە لە ترسی خودای مەزن پێی گریابوو، دەربازی کرد، پیاوێکی دیکەم دیت لە ئوممەتی

**خۆم لەسەر صیرات راوەستا بوو، وەك چلەدارخورمای بەر رەشەبا دەلەرزی، جا گومانی چاکی بەخودا هاتە لای و، لەرزەکەی داسەکاندو تێپەڕی، پیاوێکی ترم دیت لە ئوممەتی خۆم لەسەر صیرات دەخشی جار هەبوو گاگۆڵەی دەکردو جاریش هەبوو خۆی شۆڕدەکردەوە، درودناردنی بۆ من هات و لەسەر پێیانی راگرت و رزگاری کرد، پیاوێکیشم دیت لە ئوممەتی خۆم دیت گەیشتبوە دەرگەکانی بەهەشت، بەلاّم لەرووی داخرابوون، شەهادەی (لا اله الا الله هات)، دەرگەکانی بۆ کردەوەو بردیە بەهەشت. ))** رواه الحافظ ابو موسى المديني في كتاب (الترغيب في الخصال المنجية، والترهيب من الخلال المردية) وبني كتابه عليه وجعله شرحاً له، وقال: هذا حديث حسن جداً، رواه عن سعيد بن المسيب: عمرو بن آزر، وعلي بن زيد بن جدعان، وهلال أبو جبلة.

**ئیبنیتەیمیەی شێخولئیسلام پایەی ئەو فەرمودەی بەمەزن دادەناو دەیگوت نیشانەی راستی دیارن و مەبەست ئەوەبوو کە دەیفەرموو: ((رأيت رجلاً من أمتي قد احتوشته الشياطين، فجاءه ذكر الله عز وجل، فطرد الشيطان عنه)) ئەمەش لەگەڵ فەرمودەی حاریسی ئەشعەری یەکە.**

**هەروەها کە دەفەرمێ: ((وآمركم بذكر الله عز وجل، وان مثل ذلك كمثل رجل طلبه العدو، فانطلقوا في طلبه سراعاً، وانطلق حتى اتى حصناً حصيناً، فأحرز نفسه فيه: فەرمانتان پێدەکەم یادی خودا بکەن، چونکە ئەمە وەك پیاوێك وایە دوژمنی بەدواوەبێ و، بە خێرایی شوێنی کەوتبن، ئەویش هەڵێ هەتا دەچێتە ناو قەلاّتێکی پتەو، جا خۆی تێدا حەشار دەدا)).**

**بەم شێوەیە بەندەکان ناتوانن خۆ لە دەست شەیتان چەپاڵە بدەن مەگەر بە یادی خودا نەبێ، لە تیرمیذیدا لە ئەنەسی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((من قال –يعني إذا خرج من بيته –بسم الله، توكلت على الله، لا**

حول ولا قوة الا بالله، قال له: كفيت وهديت ووقيت، وتنحى عنه الشـيطان، فيقـول لشيطان آخر: كيف لك برجل قد هدي وكفي ووقي؟: **هەر کەس کە لە ماڵی خۆی چووە دەرێ، گوتی : بە ناوی خودا، پشت بە خودا دەبەستم، هیچ هەوڵ و توانایەك نیە لە خوداو بە خودا نەبێ، پێی دەگوترێ: هێندەت بەسە، رێنماکرای و هێندەت بەسەو پارێزرای، شەیتانیش خۆی لێ لادەداو بە شەیتانێکیتر دەڵێ: چ لە پیاوێك دەکەی رێنمون بوەو بەسی کردووەو پارێزراوە))** رواه ابو داود والنسائي والترمذي وقال: حديث حسن، **بە صەحیحیش لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە فەرمویەتی:** ((من قال في يوم مائة مرة لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، كانت له حرزا من الشيطان حتى يمسي: **هەر کەسێك لە رۆژێکدا سەد جاران گوتی:** لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، **بۆی دەبێتە پەناگەیەك لە شەیتانی تا ئێوارەی بەسەردادێ)). سوفیان هێناویە لە ئەبو زوبەیر، لە عەبدوڵڵای کوڕی زەمرە، لە کەعب دەڵێ:** (( قال: اذا خرج الرجل من بيته فقال: بسم الله قال الملك: هديت، واذا قال: توكلت على الله: قال الملك: كفيت، واذا قال: لا حول ولا قوة الا بالله قال الملك: حفظت، فيقول الشياطين بعضهم لبعض: ارجعوا، ليس لكم عليه سبيل، كيف لكم بمن كفي وهدي وحفظ؟: **ئەگەر پیاو لە ماڵ هاتەدەر گوتی:** بسم الله، **فریشتەکە دەڵێ: رێنمایی کرای، وە ئەگەر گوتی:** توكلت على الله، **فریشتەکە دەڵێ: هێندەت بەسە، وە ئەگەر گوتی:** لا حول ولا قوة الا بالله، **فریشتە کە دەڵێ: پارێزراو بووی، جا شەیتانەکان بە یەکتر دەڵێن: بگەڕێنەوە، بە چ رێیەك نایگەنێ، چۆن دەگەینە یەکێك خودا ئەو بەهرانەی پێدابێ)).**

**هەروەها ئەبو خەلادی میصری دەڵێ: هەرکێ هاتە نێو ئیسلام، لە قەڵاتێك دێتە ژورێ و، ئەوی لە مزگەوتێك وەژورکەوت، لە دوو قەڵاتان دێتە ژور،**

هەرکەسێکیش لە کۆڕێکی دانیشت زیکرو یادی خودای تێدا دەکرا، لە سێ قەلاتان چۆتە ژور.

ئەبو موسای حافیزیش لە کتێبەکەیدا لە ئەبوعیمرانی جونی دەگێڕێتەوە، لە ئەنەس، لە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((إذا وضع العبد جنبه على فراشه، فقال بسم الله، وقرأ فاتحة الكتاب، أمن من الجن والإنس ومن كل شيء: کاتێك بەندە دەچێتە ناو جێ، ئەگەر بڵێ: بە ناوی خوداو سورەتی فاتیحە بخوێنی و لە شەڕو خراپەی جنۆکە و مرۆڤ و هەموو شتێك ئارام و بێنیاز دەبێ)) ذكره السيوطي في (الجامع الكبير) ونسبه للبزار والديلمي، قال الهيثمي في (المجمع): وفيه غسان بن عبيد، وهو ضعيف، ووثقه ابن حبان، وبقية رجاله رجال الصحيح (محقق الوابل الصيب).

لە صەحیحی بوخاریشدا لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە، لە ئەبو هورەیرە، گوتی: پێغەمبەر ﷺ منی لەسەر زەکاتی رەمەزان دانا تا چاوم لێبیّو بیپارێزم، یەکێك هاتە لام و، دەستی پێ کرد بە کۆڵمان لە خواردنەکەی دەدا، منیش گرتم، گوتی: بەرەڵام کە جارێکیدی ناگەڕێمەوە... تادوایی فەرمودەکە، جا دەڵێ: لە جاری سێیەمدا گوتی: هەندێك وشەت فێردەکەم خودا بەوان وشان سودت پێدەگەیەنێ، ئەگەر چویە نێو نوێنەکەت، ئایەتولکورسی لەسەرەتا تا کۆتاییەکەی بخوێنە، تا سبەینێ پارێزگارێکی خودات لەسەر دەبێ و شەیتانت لێ نزیك نابتەوە، جا بەرەڵای کرد سبەینێ چوەلای پێغەمبەرو بۆی گێڕاوە، فەرموی: ((صدقك وهو كذوب: لەگەڵ ئەوەی درۆزنە، بەلاّم راستی پێ گوتوی)).

هەروەها ئەبوموسای حافیز لە فەرمودەیەکی ئەبو زوبەیر لە جابیرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((إذا أوى الإنسان إلى فراشه، ابتدره ملك وشيطان

فيقول الملك: اختم بخير، ويقول الشيطان: اختم بشر، فإذا ذكر الله تعالى حتى يغلبه -يعني النوم- طرد الملك الشيطان وبات يكلؤه، فإذا استيقظ، ابتدره ملك وشيطان، فيقول الملك: افتح بخير، ويقول الشيطان: افتح بشر، فإن قال: الحمدلله الذي احيا نفسي بعد موتها ولم يمتها في منامها، الحمدلله الذي يمسك التي قضى عليها الموت ويرسل الأخرى إلى أجل مسمى، الحمدلله الذي يمسك السموات والأرض أن تزولا، ولئن زالتا إن أمسكها من أحد من بعده، الحمدلله الذي يمسك السماء أن تقع على الأرض إلا بإذنه، طرد الملك الشيطان وظل يكلؤه: **كە مرۆڤ چووە نێو جێگەکەی، فریشتەیەك و شەیتانێك دەچنە لای، فریشتەکە دەڵێ: باپایانی کارت خێر بێ، شەیتانەکەش دەڵێ با پایانی کارت شەڕبێ، جا ئەگەر یادی خودای کرد تا چاوی دەچێتە خەوێ، فریشتەکە شەیتانەکە دەردەکاو تا سبەینێ تێیهەڵدەدا، کە لە خەویش هەستا، فریشتەیەك و شەیتانێك دێنە لای، فریشتەکە دەڵێ: با دەسپێکی کارت خێربێ، شەیتانەکەش دەڵێ: با دەسپێکی کارت شەڕبێ، جا ئەگەر گوتی: ستایش بۆ ئەو خودایەی کەنەفسی منی پاش مردن زندو کردەوەو، لە نوستنێدا نەیمراند، ستایش بۆ ئەو خودایەی ئەوان گیانان دەگرێ کە دەمرن و ئەوانی دی تا کاتێکی دیاریکراو لێدەگەرێ، ستایش بۆ ئەو خودایەی ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ کە لەنێو نەچن و ئەگەر لە نێویش بچن لەوی بترازێ کەسی دیکە پاشی وی نایانگرێتەوە، ستایش بۆ ئەو خودایەی کە ئاسمانی راگرتووەو نایەڵی بەسەر زەویدا بەربێتەوە، مەگەر بە ئیزنی خۆی، ئەگەر وای گوت، فریشتەکە، شەیتانەکە وەدەردەنێ‌و بە شاپان تێی هەڵدەدا)).**

**لە هەردوو صەحیحیانیش هاتووە لە فەرمودەی سالمی کوڕی ئەبو جەعد، لە کورەیب، لە ئیبنی عەبباسەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:** ((أما إن أحدكم إذا أتى أهله قال: بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان ما رزقتنا،

فيولد بينهما ولد لا يضـــره شـــيطان أبـــداً: ئەگەر یەكێك لە ئێوە كە چووە لای خێزانەكەی گوتی: بەناوی خودا، خودایە شەیتانمان لێ لادەو، شەیتان لەوەش لادە كە پێمان دەبەخشی، جا ئەگەر منداڵێكیان لە نێوان كەوتەوە، هەرگیز شەیتان زیانی پێناگەیەنێ))[4].

دیسان ئەبوموسای حافیز، لە حەسەنی كوڕی عەلیەوە دەڵێ: من ئەوە دابین دەكەم هەركەسێكی ئەم بیست ئایەتە بخوێنێتەوە خودای‌بەرز لە هەموو شەیتانێكی ستەمكارو، لە هەموو شەیتانێكی پیس و، لە هەموو دڕندەیەكی زیانمەندو، لە هەموو دزێكی زۆردار بیپارێزێ؛ ئایەتولكورسی‌و سێ ئایەت لە سورەتی (الاعراف) ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ . . . . . . ﴾ (سورة الاعراف/٥٤-٥٧)، و دە ئایەت لە سورەتی (الصافات) (١-١٠)و، سێ ئایەت لە سورەتی (الرحمن) ﴿ يامعشر الجن والانس ﴾ (سورة الرحمن/٣٣-٣٤)، لەگەڵ دواینی سورەتی (الحشر): ﴿ لو انزالنا هذا القرآن.. ﴾ (سورة الحشر/٢١-٢٤).

هەروەها موحەممەدی كوڕی ئەبان دەڵێ: پیاوێك لە مزگەفتێ خەریكی نوێژكردن بوو، هەستی كرد شتێكی لە پاڵە، لێی راجڵەكی، گوتی: لێم مەترسێ، هەر لەپێناو خوای‌بەرز هاتیمە لای تۆ، بڕۆ لای عوروەو لێی بپرسە، چۆن خۆی لە ئیبلیسی ئیبلیسان پەنادەدا، گوتی: بڵێ: (آمنت بالله العظيم وحده، وكفرت بالجبت والطاغوت، واعتصمت بالعروة الوثقي لا انفصام لها، والله سميع عليم، حسبي الله وكفى، سمع الله لمن دعا، ليس وراء الله منتهى: بە تەنیا بڕوام بە

[4] رواه البخاري ٣٢١/١٣، باب السؤال بأسماء الله تعالى، وفي بدء الخلق، باب صفة ابليس وجنوده، وفي الدعوات، باب الدعاء للمتزوج، ومسلم رقم ١٤٣٤ في النكاح، باب ما يستحب أن يقوله عند الجماع. (محقق الوابل الصيب)

خودای مەزن هێناو، بێبڕوام به جادوو به تاغوتان و، خۆم به بیرو باوەڕێکی پتەوی نەپچڕاو پاراستووه، خوداش بیسەرو زانایه، هەر خودام به تەنێ بەسەو، خودا دوعای داواکاران دەبیستێ، له پاش خودا کۆتایی نیه).

بیشری کوڕی مەنصوریش دەڵێ: له ووهەیبی کوڕی وەرد، دەڵێ: ساتێکی شەوێ تێپەڕیبوو، پیاوێك چووه نێو گۆڕستانێ، دەڵێ: دەنگێکی گەورەم گوێ لێبو، دیتم تەختێکیان هێناو، دایاننناو، شتێکیش هات لەسەری دانیشت، دەڵێ: جا سەربازەکانی لەدەوری کۆبووەنەوه، ئەوجا هاواری کردو گوتی: کێ عورووەی کوڕی زوبێرم لەکۆڵ دەکاتەوه؟ کەس وەرامی نەداوه تاکو چەند دەنگی خودای مەزن ڤانی لەسەر بوو به دوای یەکدا هاتن، ئەو جا یەکێك گوتی: مـن لـه کۆڵتـی دەکەمـەوه، دەڵـێ: جـا رووی لـه مەدینـه کـرد، منیـش دەمدیت، پاش ماوەیەك گەڕاوەو گوتی: به هیچ شێوەیك ناکرێ بۆ عورووه بچم، وەگوتی: واوەیلا بۆ ئێوه، دیتم سبەینان و هێواران هەندێك وشان دەڵێ: تا ئەو شانه بڵێ ئێمه نایگەنێی، پیاوەکه گوتی: بۆ سبەێنی، به خانەوادەکەم گوت: بارم بـۆ ڕێکخـەن، جـا هاتمـه مەدینـه، بـه پرسیاران عـورووەم دیتـەوه، پیرەمێردێکی گەورە بوو، پێم گوت ئەتو سبەینان و هێواران چ دەڵێی؟ رازی نەبوو پێم بڵێ، جا چیم دیت و بیستم بۆیم گێڕاوه، ئەوجا گوتی: نازانم، تەنیا سبەینان سێجار دەڵێم: (آمنت بـالله العظيـم، وكفـرت بـالجبت والطـاغوت، واستمسكت بالعروة الوثقى التي لا انفصام لها، والله سميـع عليـم)، هێوارانیش سێ جاران دەیڵێم.

هـەروەها ئەبوموسا لـه موسلیمولبوطەین دەگێڕتـەوه، دەڵـێ، جیـبریل بـه پێغەمبەری ﷺ گوت: دێوێك له جنۆکان داوت بۆ دەنێتـەوه، جا ئەگـەر چوەیـه سەرجێ‌و بالیفەکانت بڵێ: ((اعوذ بكلمات الله التامات التي لا تجاوزهن بر ولا فاجر، من شر ما ينزل من السماء وما يعرج فيها، ومن شر ما ذرا من الارض وما يخرج منـها،

ومن شر فتن الليل والنهار، ومن شر طوارق الليل والنهار، إلا طارقا يطرق بخير يـــارحمن: خۆ پەنادەگرم بە وشە تەواوەکانی خودا کە نە چاکەکاریان لێ تێدەپەڕێ نەخراپەکار، لە شەڕی هەموو ئەو شتانەی لە ئاسمانێ دادەبەزن و ئەوانەی تیایدا سەردەکەون و لەو شتانەی لەزەوی دەچنە خوارێ و لەوەی لێیەوە دەردەچن، هەروەها لە شەڕی ئاشوبەکانی شەوو رۆژو، لە شەڕی ئەوانە بە شەو لەدەرگا دەدەن بێجگە لەوانەی کە بۆ خێر دەرگە دەکوتن، ئەی خودای میهرەبان))[٥].

هەروەها بەپێی فەرمودەی صەحیح سەلماوە کە شەیتان لە دەنگی بانگ هەڵدێ.

سوهەیلی کوڕی ئەبو صالح دەڵێ: باوکم جەوانێکی خۆمانی بەگەڵ دام و بۆ بەنیحاریسەی ناردم، لە دیوارێکەوە یەکێك بە ناوی خۆیەوە بانگی کرد، جا ئەوی لەگەڵمدا بوو سەرێکی لە دیوارەکە هەڵکێشا، هیچی نەدیت، منیش ئەمەم بۆ بابم گێڕاوە، گوتی: ئەگەر بمزانیبا تووشی ئەوشتە دێی نەمدەناردی، بەلأم ئەگەر گوێت لە دەنگێك بوو، بانگی نوێژ بدە، چونکە من گوێم لێبوو، ئەبو هەورەیرە لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕاوە، کە فەرمویەتی: ((ان الشـــيطان اذا نودي بالصلاة، ولى وله حُصاصٌ: ئەگەر بانگی نوێژی درا، شەیتان هەڵدێ و تڕان دەکەنێ)). لە ریوایەتێکی دیکەشدا هاتووە: ((اذا سمع النداء ولى وله ضراط، حتى لا يسمع التأذين....: کە شەیتان گوێی لە بانگ دەبێ هەڵدێ و تڕان دەکەنێ، تا دەنگی بانگەکە نەبیستێ))[٦] الحديث.

---

[٥] وإسناده منقطع، ورواه مالك في (الموطأ)٢/٩٥١و٩٥٢ في كتاب الشعر، باب مايؤمر به من التعويذ عن يحيى بن سعيد مرسلا. قال الزرقاني في (شرح الموطأ): ووصله النسائي من طريق محمد بن جعفر، عن يحيى بن سعيد، عن محمد بن عبدالرحمن بن سعد بن زرارة، عن ابن عباس السلمي، عن ابن مسعود. قال الزرقاني:

[٦] رواه البخاري ٢/٦٩و٧٠ في الأذان، باب فضل التأذين، ومسلم رقم ٣٨٩ في الصلاة، باب فضل الآذان وهرب الشيطان عند سماعه. (محقق الوابل الصيب).

**ئەبوموسای حافیز لە ئەبورەجاوە لە ئەبوبەکری صدیق دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:** ((استكثروا من لا اله إلا الله والاستغفار، فإن الشيطان قال: قـــد اهلكتـــهم بالذنوب، واهلكوني بقول: لا إله إلا الله والاستغفار، فلما رأيت ذلك منـــهم، اهلكتـــهم بالاهواء حتى يحســـبون انهـــم مـــهتدون، فـــلا يســـتغفرون: **زۆر بڵێن لا الـه الا اللـه واستغفرالله، چونکە شەیتان دەڵێ: من ئەوانم بە گوناهـان فـەوتاندو، ئـەوانیش بە لا الە الا اللە واستغفرالله منیان فـەوتاند، جا کـە ئـەمـەم لێ دیتن بـە ئـارەزوان تونام کردن، تا وایانزانی رێنمایی کراون، جا داوای لێخۆشبوونێ ناکەن))**[7].

**هـەروەها لـە ئـیبراهیمی کـوڕی حەکەمـەوە دەگێڕتـەوە، لـە باوکیـەوە، لـە عیکریمە دەڵێ: جارێك پیاوێك لـە گەشتێكدا بوو، بەلای پیاوێكی نوستوودا تێپەڕی کە دوو شەیتانی لەکن بـوون، گەشـتیارەکە گوێـی لێ بـوو یـەکێك لـە شەیتانەکان بە هاوەڵەکەی خۆی دەڵێ: برۆ دڵی ئەو نوستووە گەندەڵ کە، جا کە لە کـابرا نـێزیك بـۆوە، گـەڕاوە لای هاوەڵەکـەی و گوتـی: لەسـەر ئایـەتێك نوسـتووە چ ڕێـی بـۆ ئێمـە تێدانیـە، جـا شـەیتانی دووەمیـش چـووە لای نوستووەکە کەلێی نێزیك بۆوە، گەڕاوەو بـە هاوەڵەکـەی گـوت: ڕاسـت دەکـەی، جـا ڕۆیشـتن، ئـەوجا کـابرای گەشـتیار نوسـتووەکەی وەئاگـا هێنـاو چـی لـە شـەیتانەکانی دیتبـوو پێـی گـوت، جـا پێـی گـوت: پێـم بڵـێ پێـش نوسـتن چ ئایەتێکت خوێندبوو؟ گوتی: ئەم ئایەتەم خوێندبوو:** ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ: **پـەروەردەگاری ئێـوە ئـەو خودایەیەکـە ئاسمانـەکان و زەوی لـە شـەش ڕۆژان**

---

[7] ذكره الهيثمي في (مجمع الزائد) ونسبه لأبي يعلى. وقال الهيثمي. وفيه عثمان بن مطر، وهو ضعيف. (محقق الوابل الصيب)

ئەفراند لەسەر عەرشدا جێگیر بو و بەرز بۆوە، بە پەردەی تاریکی شەو، رۆژ دادەپۆشیێ و شەو بە دوای رۆژدا بەلەز دەڕواو، رۆژو مانگ و ئەستێرەکانی بەدی هێنا لە حاڵێکدا دەستەمۆی فەرمانی خودان، ئەفراندن وفەرمان هەر بۆ خودایەو بەرزو پیرۆزە خودای پەروەردگاری جیهانیان ﴾ (سورة الاعراف/٥٤).

ئەبوننەضر هاشمی کوڕی قاسم دەڵیێ: لە ماڵی خۆمدا ...[٨] دەبینی گوتیان: هۆ ئەبوننەضر لە پاڵ ئێمە لاکەوە، دەڵیێ: جا ئەمەم لیێ توندبوو، منیش بۆ ئیبنی ئیدریس و، مەحاریبی و ئەبوئوسامەم نووسی لە کوفەدا، مەحاریبی لۆی نوسیم: بیرێك لە مەدینەدا گوریسەکەی دەپسا، کاروانێکیان لەلا دابەزی، گازاندەی هەندێیان لەلا کردن، جا داوای دەولکە ئاوەکیان کردو، پاشان، ئەو قسانەیان لەسەر کردو، ئاوەکەیان هەڵڕشتە بیرکە، ئاگرێکی لیێ هەڵستاو لەسەر بیرەکە لەنگەری گرت، ئەبولنەضر دەڵیێ: منیش بادیە ئاوێکم هێنا، پاشان ئەوان قسانم بەسەری‌دا خوێندو لە گۆشەکانی ماڵێم رشاند، هاواریان لیێ کردم، سوتاندمانت، ئێمە لەلات باردەکەین، قسەکەش ئەوە بوو:(بسم الله، أمسينا بـالله الذي ليس منه شيء ممتنع، وبعزة الله التي لا ترام ولا تضام، وبسلطان الله المنيع نحتجـب، وبأسمائه الحسنى كلها عائذ من الابالسة، ومن شر شياطين الانس والجن، ومن شـر كـل معلن او مسر، ومن شر ما يخرج بالليل ويكمن بالنهار، ويكمن بالليل ويخرج بالنهار، ومن شر ما خلق وذرأ وبرأ، ومن شر ابليس وجنوده، ومن شر كل دابة انت آخذ بناصيتها ان ربي على صراط مستقيم، اعوذ بالله: بما استعاذ به موسى، وعيسى، وابراهيم الـذي وفى، من شر ماخلق وذرأ وبرأ، ومن شر ابليس وجنوده، ومن شر ما يبغي، اعوذ بالله السـميع العليم من الشيطان الرجيـم، ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَالصَّافَّاتِ صَفًّا ۞ فَالزَّاجِرَاتِ

---

[٨] شتێکی لێپەڕیوە، وادەگەیەنێت کەقسەی لەگەڵ ئەوانە کردووە کە دیتونی‌و پێیان گوتووە: ئەی ئەبوننەضر .....

زَجْرًا۞ فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا۞ إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ۞ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ۞ إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ۞ وَحِفْظًا مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ مَارِدٍ۞ لاَ يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ۞ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ۞ إِلاَّ مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ سورة الصافات/١-١٠: **بەناوی خوا، بەناوی خودا ئێوارەمان کردەوە کە هیچ شتێکی لێ قەدەغە نابێ‌و، بەعیززەتی خوا کە هەر بەردەوامەو لێی کەم نابێتەوە. بەدەسەڵاتی بەهێزو توانای خوا خۆ پەنا دەگرین و، هانا دەبەینە بەر هەمو ناوەجوان و پیرۆزەکانی لەئیبلیسان و لەشەڕی شەیتانگەلی مرۆڤ و جنۆکەو لەشەڕی هەمو شتێکی ئاشکراو نهێنی‌و لەشەڕی ئەوانەی لەشەوێ دێنە دەرو بەڕۆژ خۆ لەکەمین دەگرن و بەشەو لەکەمیندان و بەڕۆژ دێنە دەرو، لەشەڕی هەمو ئەو شتانەی ئەفراندونی‌و دروستی کردون و لە نەبوەوە وەدیهێناون. هەروەها لەشەڕی ئیبلیس و سەربازەکانی‌و لەشەڕی هەمو جوڵندەیەکی کە تۆ ئەی خودایە جڵەوگیرت کردوە، بەراستی ڕێی پەروەردگارم ڕلستەڕێیە. خۆبەخودا پەنا دەگرم بەوەی کە موساو عیساو ئیبراهیمی خاوەن بەڵێن پەنایان پێ‌گرتوە لەشەڕی ئەو شتانەی خودای بەرز ئەفراندونی‌و دروستی کردون و لەنەبوەوە وەدیهێناون و لەشەڕی ئیبلیس و سەربازەکانی‌و هەرشتێکی بەنیازە بیکا. خۆ بەخودای بیسەری زانا لەشەیتانی دەرکراو پەنا دەگرم؛ بەناوی خوای بەخشەرو دڵاوا. سوێند بەوانەی ڕیزیان بەستوەو، سوێند بەوانەی بەدەنگدان لەتاوان و خراپە دوردەخەنەوەو، سوێند بەقورئانخوێنان، بەراستی پەرستراوی ئێوە یەکێکە، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی‌و ئەوەی لەنێوانیاندایەو پەروەردگاری**

خۆرەلاّتەکانە، ئێمە ئاسمانی دنیامان بەئەستێران رازاندۆتەوەو، لەهەموو شەیتانێکی پاراستومانە، تا قسەی دانیشتوانی جیهانی بالاّ نەبیستن و ئەگەر گوێراگرن لە هەمو لایەکەوە تیربارن دەکرێن، تا دوربنەوە ئەوانە ئەشکەنجەیەکی بەردەوامیان بۆ ئامادەیە، مەگەر یەکێکیان لەناکاو شتێك برفێنێ ئەوجا تۆپەڵەئاگرێکی سمێنەری بەدوادا بێت).

جا ئەمە برێکە لەو شتانەی پەیوەندییان بە فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە بە بەندەکەی فەرمو: ((يحرز نفسه من الشيطان بذكر الله تعالى: بە یادی خودای بەرز خۆی لە شەیتان پەنادا)).

پێشم خۆشە ئەم بابەتە بە فەرمودەیەك کۆتابێنم کە ئیبنیقەییم نەیهێناوەتەوە، فەرمودەکەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە لە هەموو کاروبارێکدا یادی خودا شەیتان ریسوا دەکاو کارەکانی پوچەڵ دەکاتەوەو بەشەرمەزاری و دڵساردی دەیگەرێنێتەوە، ئیمام ئەحمەد دەگێرێتەوە کە تەمیمە لە یەکێك لە هاوەڵانی بیستووە کە لە پاشکۆی پێغەمبەر ﷺ سوار بووە، کە گوتویەتی: گوێ درێژەکەی پێغەمبەر ساتمەیەکی کرد، گوتم: چارەرەش بێ شەیتان، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا تقل تعس الشيطان، فإنك إذا قلت تعس الشيطان تعاظم، وقال: بقوتي صرعته، وإذا قلت باسم الله تصاغر حتى يصير مثل الذباب: مەڵێ شەیتان چارەرەش و تونا بێ، چونکە ئەگەر وابڵێی خۆی مەزن دێتە بەرچاو، دەڵێ بەهێزی خۆم بەزاندم، بەلاّم ئەگەر بڵێی بەناوی خوا وابچوك دەبێتەوە تا بەقەد مێشێکی لێدێ)) قال ابن كثير في (البداية ١/٦٥) تفرد به احمد واسناده جيد.

**پێنجەم- دانەبڕان لە کۆمەڵی موسڵمانان:**

**ئەوەی موسڵمان لە کەوتنە داوو تەڵەی شەیتانی بەدوور دەگری ئەوەیە کە لە نێو موسڵمانانیدا بژی و، چینێکی چاکەکار هەڵبژێری کە بۆ حەقخوازی هان ویارمەتی بدەن و، لە خراپەکاری بەرهەڵستی بکەن و بیگێڕنەوەو، خێرو چاکەی وەبیر بێننەوە، چونکە هێزێکی گەورە لە یەکبوون و جەمبووندا هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((من اراد منكم بحبوحة الجنة فليلزم الجماعة، فإن الشـيطان مع الواحد وهو من الإثنين أبعد: **هەر یەکێك لەئێوە ناوەڕاستی بەهەشتی گەرەکە با پابەندی کۆمەڵی موسڵمانان بێ، چونکە شەیتان لەگەڵ یەکێك دایەو لەدووان دوورترە**)) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، ورجاله ثقات والحديث صحيح وله طرق.

**لێرەدا مەبەست لە کۆمەڵیش کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانە، کۆمەڵیش لە ئیسلامدا هیچ بەهایەکی نابێ ئەگەر بەقورئان و سونەت پابەندو پەیوەست نەبوو، لە فەرموودەشدا هاتووە:** ((ما من ثلاثة في قرية ولا بدو، لا تقام فيهم الصلاة، إلا استحوذ عليهم الشيطان، فعليكم بالجماعة، فإنما تأكل الذئب من الغنم القاصية: **ئەگەر هەر سێ کەس لە گوندێك یا لە بیابانێك دابن و قامەتی نوێژی جەماعەتیان تێدا نەکرێ، شەیتان بەسەریاندا زاڵ دەبێ، جا لە کۆمەڵ دامەبڕێن، چونکە گورگ لە مەڕی دابڕاو دەخوا**)) اسناده حسن، رواه ابو داودو النسائي وغيرهما.

**هەروەها ئەبوداود لە سونەنەکەیدا لە فەرمودەیەکی موعاویەی ئەبوسوفیان دەگێڕتەوە، کە هەستاوەو گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا هەستاو فەرموی:** ((الا إن من قبلكم من اهل الكتاب افترقوا على ثنتين وسبعين ملة، وان هذه

الملة ستفترق على ثلاث وسبعين ملة، ثنتان وسبعون في النار وواحـــدة في الجنـــة وهـــي الجماعة: ئەوانی پێش ئێوە لە ئەهلی کیتاب بەسەر هەفتاو دوو کۆمەڵاْن دابەش بوون، ئەم ئوممەتەش بۆ هەفتاو سێ کۆمەڵ جودا دەبنەوە، هەفتاو دوویان بۆ ئاگرەو یەکێکیان دەچنە بەهەشت کە کۆمەڵن)) رواه ابو داود باسناد جيد.

## شەشەم- ئاشکرا کردنی تەڵەو پیلانەکانی شەیتان[٩]:

پێویستە موسڵمان ڕێچکە و شێوازەکانی شەیتان بۆ گومڕاکردن بزانێ و بۆ خەڵکی ئاشکرا بکات، قورئانی پیرۆزیش ئەمـەی ئـەنجام داوەو، پێغەمبـەری پێشەواش بە چاکترین شێواز بەم ئەرکە هەستاوە، قورئان ئەو شێوازەی پـێ ناساندوین کە شەیتان ئادەمی پێ خەڵەتاندووە، پێغەمبـەریش ﷺ بەهاوەڵانی دەگوت؛ شەیتان چۆن گوێ بۆ ئاسمانێ رادەگرێ و جا بە گوێی پێشبینێك یا جادوگەرێکی‌دا دەچرپێنێ و سەد درۆشی لەگەڵ تێکەڵ دەکات، بۆیـە ئـەوەی بۆ روون دەکردنەوە تا بەمجۆرە کەسانە هەڵنەخەڵەتێن، هـەروەها بۆی ئاشکرا کردن شـەیتان چۆن وەسوەسـەیان بۆ دەکاو لـە کـاتی نوێـژو پەرستشـەکانیان دەیانخـافڵێنێ و، چۆن هـەوڵ دەدا وایـان تـێ بگەیـەنێ کە دەسـنوێژیان بـەتاڵ بـووەو کـەچی واش نـەبێ و، چـۆن پیـاو و ژنـی لێـك جـودا دەکاتـەوەو، چـۆن وەسوەسە بۆ مرۆڤ دەکاو پێی دەڵـی کـێ فلانـێ ئـەفراندووەو کـێ فیسـاری ئەفراندووە تا پێی دەڵێ کێ پەروەردگارتی ئافەریدکردووە،

---

[٩] ئەگەر ویستت لەوردو درشتی تەڵەو داوو پیلانەکانی شەیتان شارەزا بیت کە چۆن بیروباوەڕو پەرستش و مامەڵـەکاری لەخـەڵکی پـەردەپۆش کـردووەو کـو گەمـەی بـە جولەکـەو دیـان و ئاگرپەرستان کردووە، پێویستە دوو کتێبە وەخوێنی؛ (تبليس ابليس- ابن الجوزي)، (اغاثة اللهفان- ابن القيم)

## هەفتەم: ناکۆکی لەگەڵ شەیتان:

هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد، شەیتان بەوێنەی ئامۆژگارێکی مکوڕ لەسەر بەرژەوەندی مرۆڤ دێو خۆی دەنوێنێ، جا پێویستە مرۆڤ پێچەوانەی فەرمانەکانی بکا وپێی بڵێ: ئەگەر بۆ یەکێك ئامۆژگاربای، دەبا ئامۆژگاری خۆتت کردبا، چونکە تۆ خۆت خستۆتە ئاگرەوەو خۆت تووشی توڕەبوونی خودای بالأدەست کردووە، جا ئەوی ئامۆژگاری خۆی نەبێ چۆن خەڵکی ئامۆژگاری دەکا، حاریسی کوڕی قەیس دەڵێ: (ئەگەر شەیتان لە نوێژدا هاتەلات و گوتی: تۆ ریایی دەکەی، نوێژەکەت درێژترکەوە) (تلبیس ابلیس /٣٨)، ئەمەش تێگەیشتنێکی چاك بووە لەوەوە رەحمەتیلێبێ-، هەروەها ئەگەر زانیمان شتێك لە خوو خدەکانی شەیتانەو حەزی لێیەتی دەبێ پێچەوانەی بین و وەکو وی نەکەین، بۆ نمونە شەیتان بەچەپەی دەخواو بەچەپە دەخواتەوەو بەچەپە وەردەگرێ، بۆیە بۆمە ئەرکە لەگەڵی ناکۆك بین وپێچەوانەی بکەین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ليأكل احدكم بيمينه، وليشرب بيمينه، وليأخذ بيمينه، فإن الشيطان يأكل بشماله، ويشرب بشماله، ويعطي بشماله، ويأخذ بشماله: با هەریەکێك لە ئێوە بەدەستی راست بخواو، بەدەستی راست بخواتەوە، و بەدەستی راست وەرگرێ، چونکە شەیتان بەدەستی چەپ دەخواو، بەدەستی چەپە دەخواتەوەو، بەدەستی چەپ دەبەخشێ و، بەدەستی چەپ وەردەگرێ)) رواه ابن ماجة باسناد صحيح (صحيح الجامع ٥/٨١).

هەروەها ئەگەر بەپێوە خواردمانەوە شەیتان لەگەڵمان بەژدار دەبێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ رینوێنی کردووین تا بەدانیشتن بخۆینەوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هانی داوین تا سەرخەوی نیوەڕۆیێ بکەین، چونکە شەیتانەکان ئەو سەرخەوە ناشکێنن کە دەفەرموێ: ((قيلوا فإن الشياطين لاتقيل: سەرخەوی پێش نیوەڕۆێێ بکەن، چونکە شەیتانەکان ئەو سەرخەوەناشکینن))

رواه ابونعيم في الطب باسناد حسن(صحيح الجامع ١٤٧/٤)، **هەروەك قورئانی پیرۆزیش لە دەستبلاوی ئاگاداری کردووینەوەو دەستشڕانی بە برایانی شەیتانەکان لەقەڵەم داوە، ئەمەش هەر لەبەر هەندێیە کە شەیتانەکان حەزدەکەن ماڵ بەفیڕۆ بدەن و، بەناڕێکی و نابەجێ خەرجی کەن.**

**هەروەها ناوماڵ و نوێن دانانی زۆرو ناپێویستیش نیشانەی دەست بلاٌویە. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ:** ((فراش للرجل، وفراش لامرأته، وفراش للضيف، والرابع للشيطان: **نوینێك بۆ پیاوو، نوینێك بۆ ژنەکەی‌و، نوینێك بۆ مێوان و چوارەمیش بۆ شەیتان**)) رواه ابوداود والنسائي واحمد باسناد صحيح (صحيح الجامع ٨/٤).

**جا هەر لەو بۆنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردووین پیسی لەو پارووە بکەینەوە کە لەدەستمان بەردەبێتەوەو، بۆ شەیتانی جێ نەهێڵین، هەروەك دەفەرموێ:** ((**إن الشيطان يحضر احدكم عند كل شيء من شأنه حتى يحضره عند طعامه، فإذا سقطت اللقمة فليمط ما كان بها من اذى، ثم ليأكلها ولا يدعها للشيطان، فإذا فرغ فليعلق اصابعه، فإنه لا يدري في أي طعامه البركة: لە هەموو کاروبارێکدا شەیتان لەگەڵ هەریەکێکتان ئامادە دەبێ، تەنانەت لەکاتی نانخواردنیش، جا ئەگەر پارویەکی لەدەست بەربۆوە، با چ پیسییەکی پێوە نوسابوو دایماڵێ و پاشان بیخواو، بۆ شەیتانی لێنەگەڕێ، ئەگەر لە خواردنیش بۆوە باپەنجەکانی بلێستەوە، چونکە ئەو نازانی بەرەکەت لە کامە بڕی خواردنەکەیدا بووە**)) رواه مسلم في صحيحه (صحيح الجامع ٧٥/٢).

### چارەوێ و ماڵی شەیتانەکان:

**گەڕێن وچارەوێی پێشان حوشتر و وڵاخ و کەر بوو، ئێستاش ترومبێل و شتی دیکەیە، کە بۆ سودی مرۆڤان هاتونەتە دی، جا ئەگەر خاوەنەکەی هەمووی نەگرتبوو، بەلای کەسانێکیشدا ڕەت بوو کە ئاتاج بوون بگۆزنەوە ئەو**

**شوێنەی خاوەن گەڕێنەکە بۆی دەچێ، پێویستە رێیان بدا بەکاری بێنن، دەنا دەبێتە گەڕێنی شەیتانەکان، لەفەرمودەشدا هاتووە:** ((تكـون إبـل للشـياطين، وبيوت للشياطين، فاما إبل الشياطين، فقد رأيتها يخرج أحدكم بجنيبات معه قد أسمنها فـلا يعلو بعيراً منها، ويمر بأخيه قد انقطع به فلا يحمله، واما بيوت الشياطين فلم ارها: **حوشتر هەن هی شەیتانانن و، خانو هەن هی شەیتانانن، هەرچی حوشتری شەیتانانە، ئەوا دیومن، یەکێك لە ئێوە حوشتری دابەستی دێنێتە دەرێ کە قەڵەوی کردوون، نەخۆی سواری هیچیان دەبێ، نە کاتێك بەلای برایەکی بێ‌باربەر رەت دەبێ، هەڵی دەگرێ ، بەڵام ماڵانی شەیتانانم نەدیوە))** رواه ابو داود باسـناد صحيـح (راجع الاحاديث الصحيحة ١/١٤٨).

**رەنگە لەم فەرموودەدا مەبەست بەماڵی شەیتانان ئەم ترومبێلانە بن کە خاوەنیان لای پێداویستان رەت دەبن و سواریان ناکەن.**

**ئەو ولاخ و بەرزانەی کە قومارو مەرجیان لەسەر دەکرێ و دەخرێنە پێشبڕکێ، ئەوانەش بە چارەوێی شەیتانان دەژمێردرێن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ فَفَرَسٌ لِلرَّحْمَنِ وَفَرَسٌ لِلْإِنْسَانِ وَفَرَسٌ لِلشَّيْطَانِ، فَأَمَّا فَـرَسُ الرَّحْمَنِ فَالَّذِي يُرْبَطُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَعَلَفُهُ وَرَوْثُهُ وَبَوْلُهُفي ميزانه، وَأَمَّا فَـرَسُ الشَّـيْطَانِ فَالَّذِي يُقَامَرُ أَوْ يُرَاهَنُ عَلَيْهِ، وَأَمَّا فَرَسُ الْإِنْسَانِ فَالْفَرَسُ يَرْتَبِطُهَا الْإِنْسَانُ يَلْتَمِسُ بَطْنَهَا فَهِيَ تَسْتُرُ مِنْ الْفَقْرِ: **ولاخ سێ جۆرن، ماینێکیان بۆ خودای میهرەبانە، ماینێکیان بۆ شەیتانە، ماینێکیان بۆ ئینسانە، هەرچی ئەو ماینەیە کە بۆ خودای میهرەبانە، ئەوەیانە کە لە پێناو خوادا جڵەو دەکرێ، جا ئالیك و پاشەڕۆك و میزەکەی دەچێتە تەرازوەکەی، هەرچی ماینی شەیتانە، ئەوەیە کە قومارو پێشبڕکێی پێدەکرێ، ماینی مرۆڤیش ئەوەیە کە مرۆڤ دایدەبەستێ و چاوی لەزگ وزایەتی، کە لە هەژاری دایدەپۆشێ))** رواه احمد باسناد صحيح (صحيح الجامع ٣/١٣٧).

**بلەزی لە شەیتانە:**

یەکێك لەو سیفەتانەی شەیتان خۆشی دەوێ خێرایی و لەزکردنە، چونکە گەلەك جار مرۆڤی پێ دەکەوێتە هەلاّن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((التأني من الرحمن والعجلة من الشيطان: لەسەرەخۆی لە خودای میهرەبانەو، لەزکردن و پەلەپەلیش لە شەیتانە)) رواه البيهقي في شعب الايمان باسناد حسن (صحيح الجامع ٣/٥٧)، جا دەبێ پێچەوانەی شەیتان بین و شوێنکەوتەی ئەوە بین کە خودا رازی دەکا، بۆیەشە پێغەمبەر ﷺ بەیەکێك لە هاوەلاّنی دەفەرمو: ((ان فيك خصلتين يحبهما الله ورسوله: الحلم والاناة: تۆ دوو رەفتارت هەن خوداو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن: هێمنی و لەسەرەخۆیی)).

**باوێشك:**

ئەوی لە مرۆڤ دایەو شەیتان حەزی لێ دەکا باوێشکە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ داوین چەندی پێمان دەکرێ قوتی دەینەوە، وەك دەفەرموی: ((التثاوب من الشيطان، فإذا تثاءب احدكم فليرده ما استطاع، فإن احدكم إذا قال: هـا، ضحك منه الشيطان: باویشك لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێکتان باویشکی هات، تاپێی دەکرێ با بیگێڕتەوە، چونکە ئەگەر یەکێکتان گوتی: ها، شەیتان پێی پێدەکەنی)) متفق عليه.

ئەمەش چونکە باوێشك نیشانەی تەمبەڵیە، شەیتانیش زۆر کەیفی بە تەوەزەلی و دەستساردی مرۆڤ دێ، چونکە بە هەندێ لەو کارو هەولاّنەی کەم دەبتەوە کە بۆ لای پەروەردگاری بەرزی دەکاتەوە.

**هەشتەم- ژیوانی و لێبورد نخوازی:**

هەروەها بەندە دەتوانێ رووبەڕووی تەڵەکەکانی شەیتان ببێتەوە بەهۆی خێرا گەڕانەوەو ژیوانی بۆ خودا هەر چەند جاری شەیتان بیخەڵەتێنی، دیارە ئەوەش دابی بەندە چاکەکارەکانی خودایە، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ: بەڕاستی پارێزکاران، کاتێك وەسوەسەیەکی شەیتانیان دەگاتێ، دەکەونە یادی خوداو چاویان دەکرێتەوەو بینا دەبن ﴾ (سورة الأعراف/٢٠١).

جاوشەی (طائف) بە گوناھ کردن لێکدراوەتەوە، (تذكروا) واتە یادی سزاو پاداشتی خودایان کرد، جا گەڕانەوەو ژیوان بوونەوەو خۆیان پەنادا بەخوداو هەر زوو بۆلای گەڕانەوە، (فإذا هم مبصرون) واتە: پاشان راستاڵ بوون و رابون لەوەی تێی کەوتبوون، ئەمەش وادەگەیەنێ کە شەیتان وا لە مرۆڤ دەکا کوێرو نابینا بێ‌و راستی‌و رەوای لەبەر چاوان ون بێ و نەیانبینێ، کاتێك بە شك و گومانان دڵانیان دادەپۆشێ.

پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی پێداین کە شەیتان بە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتی گوت: ((وعزتك يا رب لا ابرح اغوي عبادك ما دامت ارواحهم في اجسادهم، فقال الرب: وعزتي وجلالي لا ازال اغفر لهم ما استغفروني: پەروەدگارم، سوێند بە دەسەڵات و بەرزی تۆ، هەر خەریکی گومراکردن و فریودانی بەندەکانت دەبم تا گیانیان لەجەستەدا مابێ، پەروەردەگاریش فەرموی: سوێند بەدەسەڵات و شکۆی خۆم تا داوای لێخۆشبوونم لێبکەن لێیان خۆش دەبم)) رواه احمد في مسنده والحاكم في مستدركة (صحيح الجامع ٢/٧٢).

ئەمە باری بەندەكانی خودایە، كە زوو ژیوان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، لەمەشدا ئادەمی باوكیان بەپێشەنگ گرتووە، كاتێك كە لە دارەكەی خوارد، هەندێك وشەی لە پەروەردگاریەوە بۆ هات، تا خودا لێی خۆش بوو، ئادەم و هاوسەرەكەی روویان لەخودا كردو گوتیان: ﴿ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنْ الْخَاسِرِينَ: ئەی پەروەردگاری ئێمە ستەممان لە خۆمان كرد، جا ئەگەر نەمانبەخشی و رەحممان پێنەكەی لەزیانباران دەبین ﴾ (سورة الاعراف/٢٣).

هەرچی دۆستانی شەیتانیشن، خودای بەرز دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَإِخْوَانُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِي الغَيِّ ثُمَّ لاَ يُقْصِرُونَ: شەیتانەكانی برایان ئەو بێبڕوایانە بەرەو گومڕایی پەلكێش دەكەن و لە دواییشدا كۆتایی ناكەن ﴾ (سورة الاعراف/٢٠٢).

لێرەدا مەبەستیش بەبرایەكانیان؛ برایانی شەیتانە لە مرۆڤ هەروەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ: دەست شڕو زیادەڕەوان برای شەیتانەكانن ﴾ (سورة الاسراء/٢٧).

دیارە ئەوانەش شوێنكەوتەی شەیتانانن و، گوێیان بۆ رادەگرن و، فەرمانیان قبول دەكەن و، ئەوانەی بەڕازاندنەوەو شیرین و جوان كردنی تاوان و گوناهان لە گومڕایی درێژدادڕیان پێ دەكەن و، لە هەندێش بێزارو ماندی نابن، هەروەك دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَى أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا: ئەدی نەتدیت كە ئێمە شەیتانەكانمان ناردە سەر كافران تا بیانتاوێننەوەو رایان تلەكێنن ﴾ (سورة مريم/٨٣).

## نۆیەم: لابردنی ئەو تەمومژانەی شەیتانیان پێدا دێتە ناو ناخەوە:

لە شوێنی گومان و وێچوونان رامەوەستە، ئەگەر ئەوەش رووی دا، باری خۆت بۆ موسڵمانان روون بکەوە، تا ماوە بە شەیتان نەدەی وەسوەسە لە سینەی موسڵمانان بکا، لەمەشدا چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا لە صەفیەی کچی حویەی خیزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە، دەڵێ: (پێغەمبەری خودا ﷺ گۆشەنشین بوو، منیش شەوێك هاتمە لای وقسەم لەگەڵی کرد، پاشان هەستام بگەڕێمەوە، ئەویش هەستا رەوانم کاو بۆ ماڵەکەم بمگەڕێنێتەوە، ئەو کاتەش ماڵی لە خانوی ئوسامەی کوڕی زەید بوو، دووپیاو لە پشتیوانان بەوێدا تێپەڕین، کە پێغەمبەریان ﷺ دیت پەلەیان کرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((على رسلكما انها صفية بنت حي: لەسەرەخۆ بن ئەمە صەفیەی کچی حویەیە))، گوتیان: سبحان الله ئەی پێغەمبەری خودا!! فەرموی: ((ان الشيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم، واني خشيت ان يقذف في قلوبكما شراً او قال شيئاً: شەیتان لە ئادەمیدا بەرارەوی خوێندا دەڕوا، جا ترسام لەوەی شتێکی خراپتان بخاتە دڵ)).

خەتابی دەڵێ: (ئەو زانستەی لەو فەرمودەیە دەفامرێتەوە ئەوەیە کە وا خۆشخوازترە مرۆڤ لە شوێنگەی گومانان ئاگادار بێ، لە هەموو شتێکی خراپ کە بەخەیاڵ و گوماناندا بێ‌و، بەدڵاندا رەت بێ، هەروەها بە خۆدەرباز کردن لە گومانان لەدەست خەڵکیش سەلامەت بێ).

هەر لەم بارەیەوە لە شافعی پێشەوا ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتی: (پێغەمبەر ﷺ ترسی ئەوەی هەبوو کە شتێکیان بکەوێتە دڵی‌و کافر بن، جا وەك میهرەبانیەك

بۆ ئەوان پێی گوتن، نەك بۆ خۆی (تلبیس ابلیس /٤٦)، هەروەها خودا ڕێنوێنی کردوین بۆ قسەجوانی و گفت شیرینی لەتەك کەسانی دیکەدا، تا شەیتان نەکەوێتە بەینی ئێمەو براکانمان و دژاتی و کێشەو ڕقمان لەنێواندا نەنێتەوە، هەروەك دەفەرمێ: ﴿ قُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ: وە بەبەندەکانم بڵێ: قسەیەك بکەن کە باشترینی قسان بێ بەڕاستی شەیتان بەهۆی قسەی ناشیرین، ئاژاوەیان لە نێواندا سازدەدا ﴾ (سورة الأسراء/٥٣).

بەڵام ئەم مەسەلەیە لە لای خەڵکانێك سووك و سانا بووە و دەبینی قسەی نادیارو بەگومان دەکەن کە بە زۆر ڕووان لێك بدرێتەوەو ڕووی خراپیش هەڵبگرێ، هی واش هەیە قسەی ناخۆش بەبراکەی دەڵێ یان بە ناوو ناتۆرەی وا ناوزەدی دەکا کە کابرا دەیانبوغزێنێ وپێی ناخۆشە، جا ئەمە دەبێتە دەروازەیەك شەیتانی پێدا دێتە ژووری و لێکیان جوایەز دەکاتەوەو دژاتیان لەنێوان دەخاتەوە لە باتی ڕێکیو کۆکیو تەبایی.

# چارەی پەرکەم

لە پێشتدا باسمان لەوەی کرد ڕەنگە شەیتان مرۆڤ بپێکێ کە لەنێو خۆمان دەڵێین: خووی گرتووە، یان لەمەچێتر دەستیان لێ وەشاندووە، لێرەشدا دەکۆشین هۆکار و چارەسەری پەرکەم بخەینە روو.

**هۆیەکانی پەرکەم:**

ئیبنی تەیمیە لە (المجموع ۳۹/۱۹)دا روونی کردۆتەوە: (کە ڕەنگە لەبەر ئارەزوو عەشق و هەوەس و دڵتێچوون، جنۆکە مرۆڤ تووشی پەرکەم بکا، هەروەك لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ روودەدا...، زۆربەی جاریش لەبەر تۆڵەو رقە، بۆ نمونە هەندێك مرۆ ئازاریان دەدەن، یا وا تێ دەگەن بە ئەنقەست ئازاریان دەدەن، جا یا میزیان پێدا دەکەن، یان ئاوی گەرمیان بەسەردا دەڕێژن، یاخود هەندێکیان لێ دەکوژن، هەر چەندە مرۆڤ ئەوە نازانن و لێی بێئاگان، جنۆکەش نەزان و ستەمکاری تێدایە، بۆیە بەزێتر لەوەی شایانە تۆڵەی لێ دەکەنەوەو سزای دەدەن، واش دەبێ هەر لە خراپی خۆیان و بۆ کات بەسەربردن و رابواردن مرۆڤ ئازار دەدەن.

**ئەرکی ئێمە لە بەرامبەر ئەوان:**

باسمان کرد کە جنۆکە بەندەی فەرمان پێکروان و پەرستشیان بە شەریعەت جێبەجێ دەکەن، جا ئەگەر موسڵمانێك توانی بیاندوێنێ هەروەکو لەگەڵ ئەوان جنۆکان روودەدا کە مرۆڤ تووشی پەرکەم دەکەن، دەبێ بەم کارە هەڵسێ.

جا ئەگەر جنۆکەکە لەبەر هۆی یەکەم کە دڵتێچوون و ئارەزووە، مرۆڤی تووشی پەرکەم کرد، ئەوە بەدکاریە کە خودا لە مرۆڤ و لە جنانی حەرام کردووە، هەرچەندە بەرەزامەندی لایەنی دووەمیش بێ، چ جای ئەوەی کە بەزۆر بێ، ئەوە جەورو بەدکاریە، جا بەم شێوەیە جنۆکەکە دەدوێنێ و پێی دەڵێن ئەمە کارێکی خراپ و حەرامە و ستەمکاریە، تا بیانو یان لەسەر دروست کەن و، بزانن کە بە حوکمی خوداو پێغەمبەرەکەی حوکمیان دەکا کە خودا بۆ مرۆڤ و جنۆکەکانی ناردووە، ئەگەر لەجۆری دو ،میش بو ، کە هەندێك مرۆڤ ئازاریان دابوون، ئەگەر خەڵکەکە نەیانزانیبو ، بە جنۆکەکان دەگوترێ ئەو مرۆڤانە نەیانزانیوەو، ئەوەی بە ئەنقەستیش ئازار نەگەیەنێ شیاوی سزادان نیە، ئەگەر کابرا لەنێو ماڵ و موڵکی خۆشی کردەوەکەی ئەنجام دابێ، پێیان دەڵێن موڵکی خۆیەتی چی دروستە دەتوانێ تێیدا بیکات وە ئێوەش بۆتان نیە بەبێ مۆڵەت لەموڵکی مرۆڤدا بمێننەوە، بەڵکو جێگەو شوێنی ئێوە ئەوان شوێنانە کە مرۆڤی تێدا نیشتەجێ نیە وەك کاولگەو چۆڵەوانیان..

هەروەها ئیبنی تەیمیە لە (مجموع الفتاوی ٤٢/١٩)دا دەڵێ: (مەبەستیش ئەوەیە ئەگەر جنۆکە دەستدرێژیان کردە سەر مرۆڤ حوکمی خوداو پێغەمبەری خودایان پێ رادەگەیەنرێ و، بیانوو بەڵگەیان لەسەر دروست دەکرێ و بەچاکە فەرمانیان پێ دەکرێ و، لەخراپە بەرهەڵستی دەکرێن، هەروەکو لەگەڵ مرۆڤدا دەکرێ، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً: وە ئێمە هیچ کۆمەڵێك ئەشکەنجە نادەین تا پێشتر پێغەمبەرێکیان بۆ دەنێرین ﴾ (سورة الأسراء/١٥)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ أَلَمْ

يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا: **هۆ گەلی جنۆکەو مرۆڤ، ئایا پێغەمبەرانێك لە خۆتان نەهاتنە لاتان کە نیشانەی منتان بۆ بڵێن و ئێوە لەم رۆژە بترسێنن؟** ﴾ (سورة الأنعام/١٣٠).

**ناکردن لە کوشتنی ماری ماڵان:**

**ئیبنی تەیمیە دەڵێ: (بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستی لە کوشتنی ماری ماڵان کردووە، تا سێ جاران مۆڵەت دەدرێ، پێشتریش دەقەکانی ئەم بابەتەمان هێناوەتەوە، ئیبنی تەیمیەیش هەمان ئەو دەقانەی هاوردوە، پاشان هۆی ئەوەی روون کردۆتەوە کە بۆچی بەرهەڵستی لە کوشتنی جنۆکەی ماڵان کراوەو گوتویەنی: (لەبەر ئەوەیە کە کوشتنی جنۆکە بەناڕەوا دروست نیە، هەروەکو مرۆڤ کوشتنیش بەناڕەوا دروست نیە، ستەم و زۆریش بەهەر بارێك بێ هەر حەرامە، کەسێك بۆی حەڵاڵ نیە ستەم لە یەکێکی دیکە بکا هەر چەندە کافریش بێ، بەڵکو خودای بەرز دەفەرموێ:** ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى: **دوژمنداری لەگەڵ کۆمەڵ و هۆزێك واتان لێنەکا دادگەر نەبن، دادگەربن لە خۆپارێزی و تەقوا نێزیکترە** ﴾ (سورة المائدة/٨).

**جا رەنگە ماری ماڵان لە جنۆکان بن بۆیە سێجاران مۆڵەت دەدرێن، ئەگەر رۆیشت ئەگەر نا دەکوژرێ، جا ئەگەر بەڕاستی مار بووبێ ئەوا کوژرا، ئەگەر جنۆکەش بێ ئەوە لەسەر دژایەتی و خۆ بە مرۆڤ پیشاندان بەوێنەی مارو ترساندنیان رکەی گرتووە، جا بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژ بکا یان بۆ لا بردنی زیانەکانیان ئاساییە ئەگەر بە کوشتنیش بێ، بەڵام بەناڕەوا کوشتنیان دروست نیە.**

## لێدان و جوێندان بە جنۆکان:

ئیبنی تەیمیە باس دەکا کە ئەرکی بڕواداره برا زۆرلێکراوەکەی سەرخا، ئەو فێدارەش زۆرلێکراوە، بەلاّم سەرخستن دادگەرانە دەبیّ، هەروەکو خودا فەرمانی داوە، بەلاّم ئەگەر جنۆکەکە بەفەرمان و بەرهەڵستی و روون کردنەوە وازی نەهێناو ئەگەڕاوە، دروستە روشکێن بکریّو جوێنی پیّ بدریّ و گەڤوگوڕی لیّ بکریّ و نەفرەتی لیّ بکریّ، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر شەیتان کردی کە تۆپەڵە گڕەکەی هێنا بوو تا بە رووی پێغەمبەری ﷺ دادا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اعوذ بالله منك، العنك بلعنة الله ثلاثاً: خۆم بە خوا لەتۆ پەنا دەگرم، سیّ جارانیش فەرموی؛ بە نەفرەتی خودا نەفرەتت لیّ دەکەم)).

هەروەها باسی ئەوەی کردووە، رەنگە بۆ چاکردنەوەی پەرکەمدارو دەرکردنی جنۆکەکەی پێویست بە لێدان بکات، جا زۆر زۆری تیّ هەڵدەدریّ و لێدانەکەش بەر جنۆکەکە دەکەویّو پەرکەمدارەکە هەستی پیّ ناکا، تەنانەت کە پەرکەمدارەکە وە ئاگادیّ دەڵیّ هەستم بە هیچ نەکردووە، هەروەها کار لە جەستەشی ناکا، وا بووە بەگۆپاڵێکی ئەستور سیّصەد یا چارصەد جار یان زێتر لە پێیەکانی پەرکەمدارێك دراوە، کە ئەگەر بەر مرۆڤەکە کەوتبا دەیکوشت، بەلاّم بە جنۆکەکە دەکەویّ و هەر ئەویش هاوارو ناڵەیەتی و، زۆر قسەش بە ئامادەبووەکان دەڵیّ، ئیبنی تەیمیەش باس دەکا کە ئەم کارەی کردووەو گەلەك جاران بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆر تاقی کردۆتەوە.

## کۆمەکخوازتن دژی جنۆکان بە یادی خوداو خوێندنەوەی قورئان:

چاکترین یارمەتی و کۆمەك دژی ئەو جنۆکەی مرۆڤ تووشی پەرکەم کات یادی خوداو قورئان خوێندنە، لە هەمووی مەزنتریش خوێندنی ئایەتولکورسیە، ((فإن من قرأها لن يزال عليه من الله حافظ، ولا يقربه شيطان حتى يصبح: هەرکەس بیخوێنێ، تا بەیانی لێ دادێ خودا پارێزەرێکی بۆ دادەنێ و شەیتان لێی نزیك نابتەوە)) (كما صح الحديث بذلك وهو في صحيح البخاري).

ئیبنی تەیمیە لە(مجموع الفتاوى ۱۹/۵۵)دا دەڵێ: (لەگەڵ هەندێش خەڵکانێکی یەکجار زۆری لە ژمارە نەهاتوو، خوێندنی ئایەتولکورسییان ئەزموناندووە کە کاریگەرە بۆ وەدەرنانی شەیتانان و بەتاڵ کردنی حاڵیان، کە لەبەر زۆری و بەهێزی رێك ناخرێن، کاریگەریەکی مەزنی هەیە لە دەرکردنی شەیتانان لە دەروون و ناخی مرۆڤ و لە مرۆڤی پەرکەمدارو لەلای ئەوانەش کە شەیتانەکان یاریدەیان دەدەن، وەکو خەڵکی زۆردارو تورەو هەوەسباز و گوێندەو، ئەوانەی گوێ بۆ فیتەو چەپڵە رادەگرن، ئەگەر بە راستگۆیی بە سەریاندا بخوێنرێ شەیتانەکان دەردەکاو، ئەوان شتان بەتاڵ و پوچ دەکاتەوە کە شەیتان دەیهێنێتە بەر چاوان و، ئەو موکاشەفەو هەڵسوکەوتە شەیتانیانەش دەپوکێنێتەوە کە براکانی شەیتانەکان هەیانە، چونکە شەیتانەکان وایان دەخستە دڵ دۆستەکانی خۆیان کە خەڵکی نەزان بە کەرامەتی دۆستە پارێزکارەکانی خودایان تێ بگا، لە کاتێکدا کە وەبەرداکردنێکی شەیتانەکانە بۆ دۆستەکانی خۆیان کە خودا غەزەبی لێ گرتوون و گومڕاو سەرگەردانیشن).

## دەرکردنی جنۆکە لە جەستەی فێدار لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ:

پێغەمبەر ﷺ زێتر لە جارێك ئەمەی کردووە، لە سونەنی ئەبوداودو موسنەدی ئەحمەدی پیشەوا لە ئوم ئیبانی کچی ئەلوازعی کوڕی زاریعی کوڕی عامیری عەبدی هاتووە، لە باوکیەوە، کە زاریعی باپیری بەخۆیو کوڕێکی -یاکوڕەخۆشکێکی- شێتی چووە لای پێغەمبەر ﷺ، جا دەڵێ باپیرم گوتی: کە گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ پێم گوت: کوڕێکم -یا کوڕەخوشکێکم- لەگەڵە کەشێتە، هێناومە بۆلای تۆ تا بۆی لەخودا بپاڕێیتەوە، فەرموی ((ائتني به: بۆمی بێنە))، دەڵێ: لەگەڵ کارواندا بوو، داموەشاندو، جل و بەرگی سەفەرم لێی داماڵیو، دوو پارچە جلی جوانم کردە بەریو، دەستیم گرت تا گەیاندمە لای پێغەمبەر ﷺ، فەرموی: ((أدنه مني، اجعل ظهره مما يليني: لێمی نزیك بکەوەو پشتی لەمن کە))، ئەو جا جل وبەرگی خۆی کۆکردەوەو، پێی لە پشتی دەدا هەتا سپیاتی بن هەنگڵی دەرکەوت، دەشیفەرمو: ((اخرج عدوالله، اخرج عدوالله: بڕۆ دەرێ دوژمنی خوا))، تا شێتەکە وای لێهات بە چاوی ساغان سەیری دەکردو تێرامانی یەکەمی نەما بوو، ئەو جا پێغەمبەر ﷺ لە پێشەخۆی داینا، داوای ئاوی کردو رووی پێ سڕیەوەو دوعای بۆ کرد، جا پاش دوعاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاندەکەمان کەسێکی لەو چاکتر نەبوو.

دیسان هەر لە موسنەددا هاتووە لە یەعلی کوڕی موڕڕە دەڵێ: سێ شتم لە پێغەمبەر ﷺ دیت پێشەمن کەس نەیدیتبوو، لە پاش منیش کەس نایبینێ، لەگەڵ پێغەمبەردا بۆ سەفەرێك دەرچووین لە بەشێکی ڕێگەکە بە لای ئافرەتێکدا ڕەت بووین کە دانیشتبوو کوڕیژگەیەکی خۆی لەگەڵ بوو، جا گوتی ئەی پێغەمبەری خوا: ئەم کوریژکەیە تووشی بەڵایەك هاتووەو ئێمەشی تووش کردووە، نازانم رۆژی چەند جاران دەیگری، فەرموی: ((ناولینیه: بیدە بەمن))، ئافرەتەکەش منداڵەکەی بەرز کردەوە، پێغەمبەر خستیە نێوان خۆی و

پێشەوەی زینی چارەوێکەی. ئەوجا دەمی منداڵەکەی بەش کردەوە، سێ جاران فووی تیٚکردو فەرموی: ((بسم الله، انا عبدالله، اخسأ عدوالله: بە ناوی خودا، من بەندەیخوام، زەبون بە هەی دوژمنیخوا)). جا منداڵەکەی دایەوە دەست ئافرەتەکەو فەرموی: ((القینا في الرجعة في هذا المكان، فاخبرینا ما فعل: لەگەڕانەوەمان لەهەمان ئەم شوێنەدا بمانبینەوەو، پێمان بڵێ چی کردووە)).

دەڵێ: جا ئێمە رۆیشتین لەگەڕانەوەمان دیتمان وا ژنەکە لە هەمان جێی جارانەو سێ کاوڕی پێیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((ما فعل صبیك؟: کوریژگەکەت چی کردەوە؟)) گوتی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە، تا ئێستا هەستمان نەکردووە هیچ شتێکی لێ بێ، جا ئەم رانەمەڕە لەگەڵە خۆت ببە، فەرموی: ((انزل خذ منها واحدة ورد البقیة: دابەزە یەکێکیانی لێ بگێرەوەو ئەوانی دیکە بگەڕێنەوە)).

جا پێغەمبەر ﷺ جنۆکەکەی بەفەرمان و روشکاندن و نەفرەت وەدەرنا، بەلأم ئەمە بەتەنێ بەس نیە، بەڵکو هێزی باوەڕو جێگیری ئاوەرو پتەوی پێوەندی بەخودا کاریگەریەکی زۆری هەیە، ئەم رووداوەش بەڵگەیە:

**ئیمام ئەحمەد فەرمانی دەرچوون دەداتە جنۆکەیەك و ئەویش وەلأمی دەداتەوە:**

دەگێڕنەوە کە ئیمام ئەحمەد لە مزگەوتەکەی دانیشتبوو، هاوەڵێکی خۆی لەلای موتەوەکیلی خەلیفەوە هاتە لایو، پێی گوت: کەنیزەکێك لەماڵی ئەمیری ئیمانداران هەیە تووشی فێ بووە، ئەویش بۆلای تۆی ناردوم، تا دوعای چابوونەوەی لەخودا بۆ بکەی، جا ئیمام ئەحمەد جوتە قاپقاپێکی دارینی دایەو گوتی: بچۆ ماڵی ئەمیری ئیمانداران و، لەلای سەری کەنیزەکە دانیشەو بە جنۆکەکە بڵێ: ئەحمەد پێت دەڵێ: کامەت پێ خۆشترە؛ لەم کەنیزەکە بچیە دەرێ، یان بەو قاپقاپە هەفتا شاپت تێ هەڵدرێ؟

کابرا بە خۆو بەنەعلەکەوە چووە لای کەنیزکەوە، لەلای سەری دانیشت و ئەحمەدی پێشەوا چی گوتبوو، وای گوت.

خێوەکە لەسەر زاری کەنیزەکە ئاخاوت و گوتی:

گوێڕایەڵیمان بۆ ئەحمەد، ئەگەر فەرمانمان پێ بکا لە عێراق دەرچین، دەردەچین، ئەو فەرمانبەرداری خودایە، ئەوی فەرمانبەرداری خودا بێ، هەموو شتێك فەرمانبەرداری دەبێ.

ئەوجا لە کەنیزەکە هاتەدەرێ‌و، ئەویش هاتەوە سەرخۆو خودا منداڵیشی پێ بەخشی.

جا کە ئیمام ئەحمەد کۆچی دوایی کرد، خێوەکە بۆ کەنیزەکە گەڕایەوە، خەلیفە یەکێك لە هاوەڵانی ئیمامی بانگ کرد، ئەویش هات و جوتە نەعلەکەی لەلا بوو، بە خێوەکەی گوت، وەرە دەرێ دەنا بەو نەعلەی لێت دەدەم.

خێوەکە گوتی: نە بەگوێت دەکەم و نەدێمە دەرێ، هەرچی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، فەرمانبەرداری خودا بوو، بۆیە فەرمانمان پێ کرابوو گوێڕایەڵی بین.

**ئەو بارەی دەبێ چارەسازی تێدابێ:**

پێویستە چارەساز باوەڕو متمانەیەکی پتەوو بەهێزی بەخودا هەبێ، دڵنیابێ لە کاریگەری زیکرو قورئان خوێندن، هەرچەند باوەڕو پشت ‌بەستانی بەخودا بەهێزبێ ئەوەندە کاریگەری و شوێنەواری بەهێز دەبێ.

جا ڕەنگە لە جنۆکەکە بەهێزتر بێ‌و وەدەری نێ، یا جنۆکەکە لەو بەهێزتربێ‌و نەچتە دەرێ، واش ڕێدەکەوێ ئەو کەسی جنەکە دەردەکا لاوازبێ و، جنۆکەکەش بە ئەنقەست ئازاری بدا، بۆیە پێویستە زۆر لەخودا بپاڕێتەوەو

کۆمەکخوازی لێبکا دژی جنۆکـان و، زۆریـش قورئـان بخوێنـی، بـە تایبـەتی ئایەتولکورسی.

**نـوشـــــتە:**

ئیبنی تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێ لە (مجموع الفتاوی ٢٢٧/٢٤)دا دەڵێ: (هەرچی چارەکردنی پەرکەمداریشە بەنوشتەو دوعاخوێندن دوو رووی هەیە:

ئەگەر ئەو نوشتانە مانایان دیار بوو، لە ئاینی ئیسلامیشدا دروست بوو پیـاو بیـانڵێ، وەکـو پاڕانــەوە لــەخوداو، یــادکردنی و، ئاخــاوتن لەگــەڵ ئافەریدەکانی وشتی لـەم بابەتـە، دروسـتە بەسـەر فێداردا بخوێنـدرێو بـۆی هەڵواسرێ، بە صەحیحیش لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە: ((إنه أذن في الرقي مـا لم تكن شركاً: مۆڵەتی نوشتە کردنی داوە ئەگەر شیرکی تێدانەبێ)) كما صح الحديـث بذلك وهو في صحيح البخاري).

وە دەفەرموێ: ((من استطاع منكم أن ينفع اخـاه فليفعـل: هەریـەکێك لـە ئێوە توانی سوود بە براکەی بگەیەنێ با بیکا)) كما صح الحديث بذلك وهو في صحيح البخاري).

بەڵام ئەگەر وشەو واژەی حەرامی تێدا بوو، بۆ نمونە شیرکیان تێدا بوو یان مانای دیار نەبوو، مانای کوفریشی هەڵدەگرت، کەسێك بۆی نیە بیکاتە نوشتە یا دوعای پێ بنوسێ، یـا بـەختی پـێ بگرێتـەوە، هـەر چـەندە بـەهۆی ئەمـە جنۆکەکە واز لە فێدارەکەش بێنێ، چونکە هەر شتێکی خوداو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردبێ، بێگومان زیانی لە سوود پترە...

لە شوێنێکی دیکەشدا لە (مجموع الفتاوی ٤٦/١٩) دەڵێ: ئەوانەی بەنتکەو نوشتەی شیرکی هەڵدەواسن، گەلێك جار لـەدەرکردنی جنۆکەکە دەستەوسـان دەبن و، زۆر جاریش جنۆکە گاڵتـەیان پـێ دەکـەن کـە داوایـان لێ دەکـات ئـەو

جنۆکەیە بکوژن یا دەزیندانێی باوێن کە مرۆڤ تووشی فیَ دەکا، جا وای بە خەیاڵدا دێنن کە کوشتویانە یا زیندانیان کردووە، ئەمەش هەموو هەر بە درۆو ئەندێشە.

**رازیکردنی جنۆکە:**

خەڵکانێك هەن هەوڵ دەدەن ئەو جنۆکەیە رازی کەن کە مرۆڤێك تووشی پەرکەم دەکا، بەوەی کە سەربڕینی بۆ بکەن، ئەمەش شیرکێکە خوداو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە، دەشگێڕنەوە کە پێغەمبەر نەهی لە شتی سەربڕاو بۆ جنۆکان کردووە.

رەنگە کەسانێکیش بڵێن ئەوە دەکەوێتە بەر چارەکردن بەحەرام، ئەمەش هەڵەیەکی زەق و گەورەیە، راستیەکەی ئەوەیە کە خودا چابونەوەو دەرمانی لە شتی حەرام دانەوە، ئەگەر بشگوتریَ دەرمانکردن بەشتی حەرامی وەکو مردارو مەی دروستە، دروست نیە ئەمە بکرێتە بەڵگە بۆ سەربڕین بۆ جنۆکە، چونکە تیمارو چارەکردن بەحەرامان، کێشەی هەندێك لە زانایانی لەسەرە، کەچی تیمار کردن بە شیرك و کوفر چ گومان و جیاڕاییەك لەنێو زانایاندا نیە لەسە .ەرام کردنی و بەیەکدەنگی دروست نیە چارەسەری پیَ بکریَ.

## ڕاستی ململانێی نێوان شەیتان و مرۆڤ

لەکۆتایی ئەم بەندەدا حەزدەکەم بەندێکی گرنگ لە قسەی ئیبنیقەییم بهێنمەوە کە ڕاستیو سروشتی ململانێکەی وێنە کێشاوە، پوختەی قسەکانی ئیبنیقەییم لە (الوابل الصیب /٢١)دا دەڵێ: (خودا مرۆڤی لەنێو ئافەریدەکانی خۆی هەڵبژاردووە، جا ڕێزی لێناوەو بژاردویەتیو، کردویەتی بە کۆگەی بڕواو تەوحیدو دڵڕاستی و خۆشویستن و تکاو، بە ئارەزوو توڕەییو بێئاگایی تاقی کردۆتەوە، هەروەها بە دوژمنێکی ئەزموناندوە کە هیچ تووشی دەست و دڵساردی نابێ).

پاشان لەدەقی قسەکانی ئیبنیقەییمدا هاتووە: شەیتان لەو دەرگانەوە بۆی دەچێ کە لە دەروون و سروشتیدا هەن، جا دەروونی لەگەڵ لار دەبێتەوە، چونکە چی حەزلێیە شەیتان ئەوەی بۆ دێنی، ئەو جا شەیتان و نەفس و ئارەزوو دژی بەندە ڕێك دەکەون، سێ فەرماندەی بەدەسەڵات، ئەندامەکان بۆ تێرکردنی ئارەزووی خۆیان دەنێرن، ئەندامەکانیش ئامێری ڕامن و ناچارەن بە ناردرانێ ڕازی بن، جا ئەمە باری ئەو سێیەو ئەندامەکانە، ئەندامەکان هەر فەرمانبەرداری وان دەبن چۆن فەرمان بکەن و ڕوو لەکوێ کەن، ئەمە پێداویستی باری بەندەیە، بەزەیی پەروەردگاری دەسەڵاتداری دلاواش وای خواستووە بەسەربازی دیکە یاریدەری بداو، کومەکێکی بنێرێتە فریای کە بەرەنگاریو دەستوەکەری لەوانە پێبگا کە دەیانەوێ بیفەوتێنن، جا پەیامبەری خۆی بۆ ناردووەو، کتێبی خۆی بۆ دابەزاندووەو، فریشتەیەکی هێژا لە بەرامبەر شەیتانی دوژمنی پشتی گرتووە، ئەگەر شەیتان فەرمانێکی

پیٚبکا، فریشتەکە فەرمانی خودای پێ رادەگەیەنیٚو ئەوەشی بۆ روون کردۆتەوە کە گوێڕایەڵی دوژمنەکەی چ تونابوونێکی تێدایە.

جارێکیان ئەمە دەیگرێتەوە خۆی و جارێك ئەو، سەرکەوتووش ئەو کەسەیە خودا سەرکەوتنی پیٚ ببەخشیٚ، پارێزراویش کەسێکە خودای بەرز بیپارێزیٚ بەرامبەر نەفسی فەرماندەو نەفسێکی ئەرخەیان و ئارامی داوەتیٚ، ئەگەر دەروونی فەرماندە بەخراپەکاری فەرمانی پیٚبکا، دەروونی ئارام بەرهەڵستی دەکا، ئەگەر فەرماندەکەش بەرهەڵستی چاکەی لێکرد، دەروونی ئارام فەرمانی پیٚدەکا، ئەویش جارێك بەگوێی ئەم دەکاو جارێکیان بەگوێی ئەو، زۆربەی جار هەروایەو، دەشبیٚ یەکێکیان هەر بە تەواوی لە نێو بچیٚو هەرگیز سەر هەڵنەداتەوە.

هەروەها لەپای ئەو ئارەزووەی بۆ تاعەتی شەیتان هانی دەدا لەگەڵ دەروونی فەرماندە، رووناهیو چاوساغی داوەتیٚ لەگەڵ عەقڵ و هۆشێك کە بیپارێزیٚ لە بەگەڵ ئارەزوو کەوتن، جا هەر کاتێك بیەویٚ لەگەڵ ئارەزووی بڕوا، هۆش و چاوساغی و روونـاهی گـازی دەکەن؛ ئاگاداربە تۆفدان و لە نێوچوونت لەبەردەمەو، تۆ نێچیری دزان وریٚگرانی ئەگەر بەدوو ئەو ریٚنمایەدا بچی.

جا جارێك بەگوێی ئامۆژگارەکە دەکاو، ئەویش ئامۆژگاریو ریٚبەری دەکا. جارێکیش بەدوای ریٚنمای ئارەزوودا دەچیٚ، جا ریٚی لیٚدەگیریٚو مالی دەبردریٚو شمەکی لیٚ دەستێنریٚ، ئینجا پێی دەڵیٚ: دەبیٚ لە کوێرا هاتبیٚ، سەیریش ئەوەیە کە بەخۆی دەزانیٚ لە کوێوە هاتووەو، دەشزانیٚ چ ریٚیەکی لیٚبڕاوەو پێیدا براوە، کەچی مکوڕە لەسەر گرتنەبەری ئەوریٚیە، چونکە ریٚنماکەی دەستی لیٚ ستاندووەو، گیروبەندی کردووەو بەسەریدا زاڵ بووە،

بەلاّم ئەگەر بەپێچەوانەکردن لاوازی کردباو، ئەگەر بانگەشەی کردبا تێی راخوڕیباو، دژی جەنگابا کە دەیویست بیبا، دەستی لیّ نەدەستاند، بەلاّم بەخۆی بەسەرەخۆی زاڵی کردووە، دەستی داوەتە دەستیو، وەك ئەو پیاوە وایە کە دەستی لە دەست دوژمنی بیّو، ئەویش تووشی ئازارو سزای ناخۆشی بکا، جا هاوار دەکاو کەس بە هاواری نایێ، بەم شێوەیە دەبێتە دیلی شەیتان و ئارەزو و نەفسی فەرماندە، پاشان داوای رزگار بوونێ دەکاو ناتوانێ خۆی قوتارکا، بەلاّم کاتێك بەندە تووشی ئەو بەلاّیە دێ، بە سەربازو چەك و تفاق و قوللەو قەلاّتان یارمەتی دراو، پێی گوترا: دژی دوژمنەکەت بجەنگە و بکۆشە، ئەوانە سەربازن چەندی دەتەوێ لەگەڵ خۆتیان ببە، ئەمانەش قوللەو قەلاّتن لەکامەی دەتەوێ خۆت قایم کەو، تامردن سەنگەر بگرە، مەسەلەکە نێزیکەو، ماوەی سەنگەرگرتنەکەش گەلەك کەمە، جاوەك بلّێی مەزنترین پاشا پەیامبەرەکانی خۆی بۆ هەناردی و، تۆیان بۆ ماڵی ئەو گواستەوەو، لەو کۆشین و جیهادەی حەسایەوەو، تۆو دوژمنەکەت لێك جودا بوونەوە، لە خانووی رێزدا بەرهەلّدرای و چۆنی حەز بکەی ئاوا تێیدا گەوزان دەدەی و دوژمنەکەشت لە خراترین و توندترین زیندانان ئاخنراوەو تۆش دەیبینی. ئەو زیندانەی دەیویست تۆی تیّبهاوێ، خۆی تێیکەوت و دەرگەکانی لەسەر گاڵەدراو، لە بەرەڵلاّ بوون و دەربازبوونی بێهیوا بوو، تۆش لەنێو ئەوان شتان دای کە دەروونت ئارەزووی دەکاو چاوت ئۆقرەی پیّدەگرێ. وەکو پاداشتی ئارامیو خوڕاگریت بۆ ئەو ماوە کەمەو مانەوەت لە سەنگەرداو، ئەمەش تەنها ساتێك بوو، پاشان بەسەر چوو، وەك چۆن ئەو ناخۆشیە نەبووبێ ئاوا، ئەگەر نەفسیش لاواز بوو لەئاست تێبینی کردنی کورتی کات و خێرایی بەسەرچوونی، با لەم ئایەتە پیرۆزانەی خودای بەرز رامێنێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا

يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ: **كاتێك ئەو رۆژە دەبینن كە بەڵێنیان پێدرابوو، وەك ئەوە وایە لەساتێكی رۆژێك پتر لە ژیاندا نەبووبن** ﴾ (سورة الأحقاف/٣٥).

**هەروەها كە دەفەرموێ:** ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا: **بێبڕواكان كە ئەو رۆژە دەبینن، وادەزانن كە هێوارەیەك یا چێشتەنگاوێك نەبێ نەماونەتەوە** ﴾ (سورة النازعات/٤٦).

**دیسان دەفەرموێ:** ﴿ قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ۞ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ ۞ قَالَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ: **خوا دەفەرموێ: چەند لەسەر زەوی ماینەوە؟ لەوەڵامدا دەڵێن: رۆژێك یا نیوە رۆژێك، جا لەوانە بپرسە كە دەتوانن بژمێرن، فەرموی: بەڵێ؛ زۆر كەم ماونەتەوە ئەگەر زانینتان هەبێ** ﴾ (سورة المؤمنون/١١٢-١١٤).

**هەروا دەفەرموێ:** ﴿ يَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ۞ يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ عَشْرًا ۞ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ يَوْمًا: **ئەو رۆژی فودەكری بەشەیپوردا تاوانباران بە چاوی شین هەڵگەڕاو كۆ دەكەینەوە، بەسرتەسرت لە نێو خۆیاندا دەڵێن؛ بێجگە لە دە شەوو رۆژ نەماونەتەوە، ئێمە ئاگادارترین بەوەی ئەوان دەیڵێن، كاتێك شیاوترینیان دەڵێ؛ ئێوە هەریەك رۆژتان پێچووە** ﴾ (سورة طه/١٠٢-١٠٤).

**رۆژێكیش پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ هاوەڵانی دەدا، كاتێك لەكاتی رۆژئاوا بوون خۆر گەیشتە سەر تروپكی چیاكان فەرموی:** ((إنه لم يبق من الدنيا فيما مضى

إلا كما بقي من يومكم هذا فيما مضى منه: **دنيا هێندەی ماوە لەچاو ئەوی رویشتوە، بەقەدەر مانەوەی ئەمڕۆکە لەوەی تێپەڕیوە))** رواه احمد في المسند، والترمذي في سننه، وقال الترمذي حديث حسن صحيح.

**جا ئەوی ژیرەو بۆ دەروونی خۆی ئامۆژگارە، با لەو فەرمودەیە رامێنێ، بزانێ چی بەسەر هاتووە و چ کاتێکی پێ بڕاوە لەو کاتە کەمەی کە بۆ هەموو دنیایێ ماوەتەوە، با بزانێ لەخۆباییەو لە زیندەخەونان راچوەو، بزانێ کە ئەو ئاسودەبوونی یەکجاریو تاهەتاییو نیعمەتی هەمیشەیی بە بەشێکی کەمی بێقیمەت فرۆشتووە، ئەگەر داوای خودای بەرزو ماڵی دوایی بکردبا، پشکێکی زۆر فراوانترو تەواوتری پێ دەبڕا، هەروەك لە هەندێك شوێنەواراندا هاتووە:**

**هۆ ئادەمیزاد، دنیا بە قیامەت بفرۆشە هەردوکیان قازانج دەکەی، قیامەت بەدنیا مەفرۆشە هەردووکیان زەرەر بکەی.**

**هێندێك لە پێشینان گوتویانە: ئادەمیزاد، ئەتۆ ئاتاجی بەشی خۆتی لە دونیا، بەڵام زێتر ئاتاجی بەشی خۆتی لە قیامەت، جا ئەگەر بە پشکی دنیایێ دەستت پێکرد؛ بەشی قیامەتت لەدەست دەچیو بەشی دونیاشت دەکەوێتە ترکزە، ئەگەر بەپشکی قیامەتیش دەستت پێکرد، پشکی دونیاشت دەبەیەوەو رێك و راستەڕێیان دەکەی.**

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش ﷺ لە وتارێدا دەیگوت: هۆ خەڵکینە، ئێوە هەوەنتە ئافەرید نەکراون، هەرواش وازتان لێ نەهێنراوە، بەڵکو ژوانێکتان هەیە خودا تێیدا کۆتان دەکاتەوە تا حوکمتان لە نێواندا بگێرێ و لێکتان جودا کاتەوە، جا هەش بەسەری و ناشادی بۆ ئەو بەندەیەی خودا لەو رەحمەتەی خۆی وەدەری دەنێ کە هەموو شتێکی لە خۆگرتووەو، لەو بەهەشتەی دەری**

دەكا كە هێندەی ئاسمانەكان و زەوی بەرینە، بەڵكو سبەینێ ئاسایش و ئارامی هەر بۆ ئەوان كەسانە كە لە خودای بەرز ترساون و تەقواو پارێزكاریان هەبووەو كەمی بەزۆر و، نەمانی بە هەرمان و، ناشادی بە ئاسودەیی فرۆشتووە، نابینن لە پشتی فەوتاوانەوە هاتوون و پاش ئێوەش بۆ ئەوانەی جێ دێڵن كە دەمێننەوە؟! نابینن هەموو رۆژێك یەكێك بەرێ دەكەن كە ئێوە جێ دێڵێ‌و بۆلای خودا دەچێ، مردووەو، هومێدی براوە، جا لەناخی چاڵە زەویەك بێ‌سەرین و دۆشەك دایدەنێن، هۆیەكانی لەخۆ داماڵیون، خۆشەویستانی جێ هێشتوون و، رووبەرووی لێپرسینەوە دەبێ؟

مەبەستیش ئەوەیە كە خودای خاوەن دەسەلات و كاربەجێ لەو ماوە كورتەیدا بەسەربازان فریای بەندەی خۆی كەوتووە، لەگەڵ تفاق و كۆمەك كردنی، ئەوەشی بۆ روون كردۆتەوە چۆن خۆی لە دوژمنەكەی دالدەو پەنا دەداو، چۆن نەفسی خۆی رزگار دەكا ئەگەر كەوتە داوی دیلی‌و یەخسیری، ئەحمەدی پێشەواو تیرمیذی لە فەرمودەی: حاریسی ئەشعەری دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، فەرموی: ((إن الله سبحانه وتعالى أمر يحيى بن زكريا ﷺ بخمس كلمات؛ ان يعمل بها، ويأمر بني اسرائيل ان يعملوا بها، وانه كاد ان يبطيء بها، فقال له عيسى عليه السلام: ان الله تعالى امرك بخمس كلمات لتعمل بها، وتأمر بني إسرائيل ان يعملوا بها، فإما ان تأمرهم، وإما ان آمرهم، فقال يحي: أخشى إن سبقتني بها أن يخسف بي وأعذب، فجمع يحيى الناس في بيت المقدس، فامتلأ المسجد، وقعدوا على الشرف، فقال: إن الله تبارك وتعالى أمرني بخمس كلمات أن اعملهن، وآمركم أن تعملوا بهن: خودای پاك و بەرز بە پێنج وشان فەرمانی بە یەحیای كوڕی زەكەریا ﷺ كرد، كەخۆی كاریان پێ‌بكاو، فەرمان بداتە بەنی‌ئیسرائیلیش كاری پێ‌بكەن، بەلام ئەو خەریك بوو هێدیاتی بنوێنی، جا عیسا ﷺ پێی گوت: خودای بەرز بە پێنج وشان فەرمانی پێكردوی كە بەخۆت كاریان پێ‌بكەی‌و فەرمان بدەیە

بەنیئیسرائیل کاریان پیٚبکەن، جا یان فەرمانیان پیٚبکە، یا من فەرمانیان پیٚدەکەم، یەحیا گوتی: دەترسیٚم ئەگەر تۆ پیٚشم کەوی، من نغرۆبکریٚم و ئەشکەنجە بدریٚم، جا یەحیا خەڵکی لە بەیتولمەقدیس کۆکردەوە، تا مزگەفت پڕ بوو، لەسەر سواندان دانیشتن، ئەوجا فەرموی: خودای پاك و بەرز فەرمانی داومیٚ بە پیٚنج وشان کە من کاریان پیٚبکەم و فەرمان بەئیٚوەش بدەم کاریان پیٚبکەن)).

جا پیٚنجەمین شت کە فەرمانی پیٚداوە یادی خودایە ((وآمركم ان تذكروا الله تعالى، فإن مثل ذلك كمثل رجل خرج العدو في أثره سراعاً حتى أتى على حصن حصين، فأحرز نفسه منهم، كذلك العبد لا يحرز نفسه من الشيطان إلا بذكر الله تعالى: فەرمانتان پیٚدەکەم یادی خودای بەرز بکەن، چونکە ئەمە وەك پیاویٚك وایە لە ترسی دوژمنی هەڵاتبیٚ و دوژمن بەخیٚرایی بەدوای کەویٚ تا دەگاتە قۆنگرەو قەڵاتیٚکی پتەو و خۆی لیٚیان پەنادەدا، بەندەش ئاوایە بە یادی خودا نەبیٚ ناتوانیٚ خۆی لە شەیتانی پەنابدا)) قال الترمذي هذا حديث حسن صحيح.

هەروەها لە فەرمودەکەیدا فەرمانی نویٚژکردنی پیٚدان: ((وآمركم بالصلاة، فإذا صليتم، فلا تلتفتوا فان الله ينصب وجهه لوجه عبده في صلاته مالم يلتفت: فەرمانتان پیٚدەکەم نویٚژ بکەن، ئەگەر نویٚژتان کرد ئاوڕ مەدەنەوە، چونکە خودا رووی خۆی لە ئاست رووی بەندە رادەگری لە نویٚژدا، هەتا ئاوڕی نەدابیٚتەوە)).

ئەو ئاوڕدانەوەیەی نەهی لیٚکراوە لەنویٚژدا دوو جۆرە؛ یەکیٚکیان روو وەرگیٚڕانی دڵە لەخوداو ئاوڕدانەوەیەتی لە بیٚجگە لەخوا، دووەمیش ئاوڕدانەوەی چاوە، هەردووکیش نەهییان لیٚ کراوە.

خودا هەر رووی لە بەندەیە هەتا بەندە لەکاتی نوێژدا رووی لەخودا بێ، بەڵام ئەگەر بەچاو یان بەدڵ رووی لێ وەرگێڕا، خودای بەرزیش روی لێ وەردەگێڕێ، پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەبارەی ئاوڕدانەوەی پیاو لە نوێژدا، ئەویش فەرموی: ((اختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد: ئەمە دزینێکە شەیتان لە نوێژی بەندان دەیرفێنێ)).

لە شوێنێکشدا هاتووە، کە خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ الى خير مني، إلى خير مني: ئایا بۆلای یەکێکی لە من چاکتر ئاوڕ دەدەنەوە؟ ﴾.

جا ئەو کەسەی چاوی یا دڵی وەردەگێڕێ لە نوێژدا، وەکو پیاوێکە سوڵتان بانگی کردبێ‌و، لەبەر دەستانی خۆی رایگرتبێ‌و، هەر بانگی بکاو قسەی بۆ بکا، کابراش لە میانەی هەندێدا روو لە سوڵتان وەرگێڕێ‌و ئاوڕ لەراست و چەپ دەداتەوەو، دڵی لەلای سوڵتان نەماوەو، تێناگا سوڵتان چی پێدەڵێ، چونکە هۆش و دڵی لەوێ نیە، جا ئەو پیاوە گومان دەبا سوڵتان چی لێبکا؟ بۆیە ئەم جۆرە نوێژکەرە یەکسان نابێ لەگەڵ یەکێکی کە بە دڵ ئامادەبێ‌و رووی لە خودای بەرز بێ لە نوێژەکەیداو لەدڵ و دەروونەوە هەست بە مەزنێتی ئەو زاتە بکا کە لەبەر دەستانی راوەستاوە، جا دڵی لەسامی وی پڕ دەبێ‌و ملی بۆ کەچ دەبێ‌و لە خودای بەرز شەرم دەکا کە رووی بکاتە یەکێکی دی، یا لای لێکاتەوەو رووی تێ بکا، جیاوازی نێوان نوێژی ئەو دوانەش وەکو ئاسمان و زەویە، حەسسانی کوڕی عەتیە دەڵێ: دوو پیاو لەیەك نوێژدا دەبن و، پایەی نێوانیان وەکو ئاسمان و زەمینە، لەبەر ئەوەی یەکێکیان بەدڵ روو لەخوایەو، ئەوی دیکەش خافڵاو و بێئاگایە، جا ئەگەر بەندە رووی لە ئافەریدێکی وەکو

خۆی کرد، بەڵام پەردەیەکیان لەنێواندا بوو، نەبە ڕوتێکردن دەژمێردرێ نەبە نزیك بوونەوە، چ جای ئافەریدگاری بەرزو بەدەسەڵات و کاربەجێ؟!

جا ئەگەر رووی لە ئافەریدکاری مەزن کردو، پەردەیەکی ئارەزو و وەسوەسەکان و دەروونێکی پێوەپەیوەست و پڕ لەنێوانیاندا بوو، ئەمە چۆن رووتێکردنێك دەبێ لە کاتێکدا وەسوەسەو بیرکردنەوە خافڵاندویانەو بەهەموو ڕاڕەوێکیاندا بردووە؟ کە بەندەش لە نوێژێدا راست دەبێتەوە شەیتان ئێرەیی پێدەبا، چونکە لە مەزنترین پایەگا راوەستاوە لە هەموو شتێك توندترە بۆ شەیتان و پتر دەیوروژێنێ، بۆیە مکوڕەو تەواو تێدەکۆشێ بەندە لەو پایەگایەدا نەوەستێ، بەڵکو هەر خەریکێتی بەڵێنی هیوابەخشی پێ دەداو لەبیری دەباتەوەو، بەسوارو پیادەوە بۆی دێتە مەیدانێ، تا نوێژی لەلا بێبەها کاو ئەوجا ساردەی تێدا بکاو پاشان وازی لێ بێنێ، ئەگەر ئەوەشی پێ نەکراو بەندە لێی یاخی بوو لەو پایەگایە راوەستا، ئەوا دوژمنی خوا دێتە نێوان بەندەو نەفسیو، دڵی لێ دادەبڕیو لە نوێژدا شتی وای بیر دەخاتەوە کە پێش نوێژەکە لەبیری نەبووە، تەنانەت وا دەبێ شتێکی پێویستی لەبیرچووبێو لێی هومێدبڕ بووبێ، لەنوێژێدا بیری دەخاتەوە تا دڵی پێ مژیل کاو لەخودای بەرزی بستێنێو، بەبێ دڵ لە نوێژەکەیدا راوەستێ، جا ئەو رووتیکردنەی خودا دەست ناخا، کە یەکێك وەدەستی دێنی تەواو دڵی روو لەخوا بێ لە نوێژەکەی ئامادەبێ، جا چۆن بەباری کۆڵێك گوناه و تاوانان دێتە ناو نوێژەکەی هەر ئاواش جێی دێڵێ و چ بارێکی لێ کەم نابێتەوە، چونکە نوێژ دەبێتە گوناه شۆری ئەوانەی تەواو مافی دەدەن و تەواو تێیدا دڵکزن و بەدڵ و لاشە لەبەردەستی خوای بەرز دەوەستن، جا ئەمانە کە لەنوێژێ دەبنەوە، هەست بە سووکیەك دەکەن لە دەروون و هەست دەکەن باری گرانی لەسەرشان لابردون، بۆیە چالاکی و هەسانەوەو گیانێکی تازە بە دی دەکەن، تاوا دەخوازن

هەر تەواو نەبوایە، چونکە نوێژ ئارامی چاوو نیعمەتی جانیانە، هەروەك بەهەشتی دڵ و شوێنی هەسانەوەییانە لەدونیا، بەردەوام وا هەست دەکەن لە تەنگی و لە زیندانیدان، تا دەچنە نێو نوێژی و پێی دەحەسێنەوە، نەك لێی دەحەسێنەوە، جا ئەوانەی خودایان خۆش دەوێ دەڵێن: نوێژ دەکەین و بە نوێژەکەمان دەحەسێینەوە، هەروەکو پێشەواو رابەرو پێشەنگ و پێغەمبەرەکەیان ﷺ فەرمویەتی: ((یا بلال ارحنا بالصلاة: هۆ بیلال بە نوێژێ بمانحەسێنەوە))، نەشی فەرموە: لە نوێژێ بمانحەسێنەوە، هەروەها فەرمویەتی: ((جعلت قرة عيني في الصلاة: ئۆقرەی چاوانم لە نوێژیدایە))، جا هەر کەسێکی ئۆقرەی چاوانی لە نوێژیدابێ چۆن چاوانی بێ نوێژ ئۆقرە دەگریو، بێ نوێژ ئارامی دەبێ؟

دەگێڕنەوە کە بەندە بۆ نوێژکردنی هەڵدەستێ، خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ ارفعوا الحجب: پەردەکان بەرزکەنەوە ﴾ ، بەڵام ئەگەر بەندەکە ئاوڕی دایەوە، دەفەرموێ: دایدەنەوە، لێرەدا ئەم ئاوڕدانەوەیە بەروگۆڕینی دڵ لەخودای گەورە لێکدراوەتەوە، جا ئەگەر ئاوڕی لە بێجگە لەخودا دایەوە، پەردەی نێوان خۆیو بەندە دادەداتەوە، ئەوجا شەیتان لێی وەژوور دەکەوێ و، کاروباری دونیای بۆ ریز دەکاو، وەکو ئاوێنە دەیهێنتە بەرچاوانی، بەڵام ئەگەر بەدڵ روو لەخوا بو و ئاوڕی نەداوە، شەیتان ناتوانێ بێتە نێوان خودای بەرز و ئەو دڵەوە، بەڵکو ئەو کاتە شەیتان دێتە ژوور کە پەردە بەردرابێتەوە، جا ئەگەر بەندە رای کردە لای خوداو دڵی ئامادەبوو، شەیتان هەڵدێ، کە روشی وەرگێڕا شەیتان دێتەوە، ئەمەش ئیشی خۆی و ئیشی دوژمنەکەیەتی لەکاتی نوێژدا.

**نوێژکەر چۆن وا دەکا دڵی لە نوێژدا ئامادەبێ:**

ئەگەر بەندە بەسەر ئارەزووەکانیدا زاڵ بوو، هێز پەیدا دەکا لە ئامادەبوونی لەنوێژو خەریك بوونی بە پەروەردگاری تێیدا، دەنا دڵێك ئارەزوو بەسەریدا زاڵ بێو، هەوەس یەخسیری کردبێو، شەیتان کورسیەکی بۆ خۆی تێدا وەدۆزیبێو خۆی لەسەر جێگیر کردبێ، چۆن لە وەسوەسەو بیری پوچ رزگاری دەبێ؟!

**دڵەکانیش سێ جۆرن:**

دڵێکی خاڵێ لە باوەڕو لەهەموو چاکەیەك؛ ئەمەیان دڵێکی تاریك و نوتەکەو شەیتان لەوەی حەساوەتەوە کە وەسوەسەی بهاوێتێ، چونکە بۆتە ماڵ و نیشتمانیو، چۆنی بیەوێ وای هەڵدەسوڕێنیو تەواو دەستی لێ ستاندووە.

جۆری دووەم: دڵێکە بەرووناهی باوەڕ رووناك بۆتەوەو چرای ئیمانی تێ داگیرساوە، بەڵام تەم و مژی ئارەزو و گەردەلولی هەوەسەکانی لەسەرە، شەیتان هاتوچۆی بۆ ئەوێ هەیەو شەڕی تێدا بەرپایەو سەرەدەکەوێ و بن دەکەوێ.

باری ئەم جۆرەیان بەکەمی و زۆری دەگۆڕێ؛ هی وا هەیە کاتی سەرکەوتنەکانی بەسەر دوژمنەکەی زیاترەو، هی واش هەیە کاتی سەرکەوتنی دوژمنەکەی بەسەریدا زیاترەو، هی واش هەیە نۆرە بەنۆرەیە.

جۆری سێیەم؛ دڵێکی پڕ لە بڕوایەو بەرووناکی باوەڕ ئاوایەو، هەوری ئارەزووەکانی رەویتەوەو، تاریکیەکان جێیان هێشتووە، جا رووناهیەکەی لەسینەدا پرشنگ دەداو، ئەو پرشنگەش هەڵبونێکی هەیە گەر شەیتان لێی نیزیك ببتەوە پێوەی دەسوتێ، وەکو ئاسمان وایە کە بەئەستێران پاسەوانی لێ دەکرێ و ئەگەر شەیتان پێیدا تێپەڕی بە ئەستێران راودەنرێ و دەسوتێ،

ریزی ئاسمانیش مەزنتر نیە لە هی بڕوادار و، پاسەوانی خودا بۆ وی تەواوترە لـە پاسـەوانی ئاسمـانیۆ، ئاسمـانیش پەرسـتگەی فریشـتان و ئارامگـەی نیگایـەو، رووناـهی تاعەتـەکانی تێدایــە، دڵـی بڕوادارانیــش ئارامگــەی یەکخواپەرستیو خۆشویستێن و زانیاری و بڕوایـە، بۆیـە شایانە نۆبـەتداری لێبکرێ و لەفێڵ وتەڵەکەی دوژمن بپارێزرێ کە هەر شتێکی تێیدا دەستکەوێ دەیرفێنێ، نمونەیەکی جوانیش بۆ ئەمە هەیە، کە نمونەی سێ ماڵانە:

ماڵی پاشا کە گەنجینەو تفاق و گەوهەرەکانی شای تێدایە.

ماڵێ بەندە کە گەنجینـەو تفاق و گەوهـەرەکانی بـەندەی تێدایـە، نـەك هـی پاشا.

ماڵێ خاڵیش کە هیچی تێدا نیە، ئەگەر دزێك هات تا لە یەکێك لەو ماڵانـە دزی بکا، لە کامەیان دەدزێ؟

ئەگەر بڵێی؛ لەماڵە خاڵیەکە، ئەوە مەحاڵە، چونکە ماڵی خاڵی شتێکی تێدا نیە بدزرێ، بۆیەش کە ئیبنیعەبباس ﷺ گوتی: جولەکە دەڵێن کە لە نوێژدا وەسوەسەیان بۆنایێ، ئەویش گوتی: جا شەیتان چ لە دڵێکی کاول بکات؟

ئەگەر بشڵێی: لە مـاڵی پاشـای دەدزی، ئـەوەش هـەر مـەحاڵ و نـەکراوە، چونکە هێندەی پاسەوان و نۆبەتدار بەدەورەوەن، دز هـەر ناتوانێ لێـی نزیـك بێتەوە، چۆن دەتوانـێ لـەکاتێکدا پاشا خۆی پاسـەوانەو، سەربازو پاسـەوانی زۆریش دەوریان تەنیوە؟ جا لە ماڵی سێیەم بترازێ هیچ بۆ دزەکە نامێنێتـەوە، هێرشەکانی هەر بۆ ئەوێ دەبن.

جا ئەوی ژیرە با چاك لەو نمونەیە رامێنـیۆ، بـەدڵ تێـی بڕوانـێ چونکە بۆ خۆشی ئاوایە.

دڵێك لەهەموو خێرو چاكەیەك خاڵی بێت، كەدڵی بێباوەڕو دەغەڵانە، ئەو دڵانـە مـاڵی شـەیتانن، بـۆ خـۆی داگیری كـردون و كردوونـی بـە نیشـتمانی نشـینگەو ئارامگـە، چـی لێ بـدزێ لـە كـاتێكدا گەنجینـەو تفـاق و گومـان و ئەندێشەو وەسوەسەكانی خۆی تێدایە؟

دڵێكیش كە بەشكۆی پەروەردگاری مەزن و دەسەڵاتدارو، بەخۆشویستن و چـاوەدێری كـردن و بەشـەرمكردن لـە خـودا لێوانلێـو بووبـێ، چ شـەیتانێك دەوێرێ لەو دڵـەی نـێزیك كـەوێ؟ ئەگـەر بیـەوێ شـتێكیش بـدزێ چ دەدزێ؟ مەبەستیشی هـەر ئەوەیە ئەگەر جارجارە بۆی بڕەخسێ لـە كـاتی بێئاگـایی بەندەدا چنگوڕكێكی لێداو بڕێكی لێ بڕفێنێ، ئاساییە بەندەش تووشی ئەو بڕە بێئاگاییە بێ، چونكە مرۆڤەو حوكمەكانی مرۆڤی لەسەر دێتەدی لە بێئاگایی و خافڵ بوون و هەڵەكردن و دەخەیاڵ راچوون و سروشت بەسەردا زاڵ بوون.

لەوەهـەبی كـوڕی مونەبیـە ﷺ دەگێڕنـەوە كـە گوتـی: لـە هـەندێك كتێبـە خوداییەكاندا هاتیە: ((لست أسكن البيوت، ولا تسعني، وأي شيء يسعني والسموات حشو كرسي؟ ولكن أنا في قلب الوادع التارك لكل شيء سـواي؟ لـە مـاڵان نیشتەجێ نیم و من لـەخۆ نـاگرن، چـی مـن لـەخۆ دەگـری كە ئاسمانـەكان لـە كورسیەكەم ئاخنراون؟ بەڵام من لـەدڵی یـەكێك دام وازی لەهـەموو شـتێك هێنـاوە بێجگـە لـە من))، ئەمەش واتای شوێنەوارێكی دیكەیە: ((ما وسـعني سمـوائ ولا أرضـي، ووسعني قلب عبدي المؤمـن: ئاسمانـەكان و زەمینـەكـەم فراوانـی منیـان نیـە، بـەڵام دڵی بەندەی بڕوادارم من لـە خـۆ دەگـرێ)). دڵێكـیش تـەوحیدی خودای بەرزو ناسـین وخۆشویسـتن و بـڕوا بـەخوداو بـاوەڕی بـە بەڵێنـەكانی تێدابـێو، ئارەزووەكانی دەروون و رەوشتەكان و بانگەشەكارانی هـەوس و سروشتیشی تێدابێ.

**دڵێکیش لە نێوان ئەم دوو بانگەوازکارەیە؛ جارێکیان دڵی بەلای بانگەوازکاری بڕواو خوداناسین و خۆشویستنی خودای بەرزو تەنها ویستی ویدا دەشکێو، جارێکیش دڵی بەلای بانگەوازکاری شەیتان و هەوس و سروشتەکاندا دەچێ، ئەمە دڵێکە شەیتان چاوی تێ بڕیوە، خوداش کێی بیەوێ سەری دەخا** ﴿وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ: **وە سەرکەوتن هەر لەلای خودای دەسەلاتدارو حەکیمە**﴾ (سورة آل عمران/١٢٦).

**شەیتانیش دەست لەمە ناسێنێ مەگەر بە چەك و تفاقی خۆی نەبێ، کە شەیتان لێی وەژوور دەکەوێ چەکەکەی لە کنەوی دەدۆزیتەوەو هەڵی دەگرێو پێی دەجەنگێ، چەکەکانیش ئارەزو و گومانەکان و هومێدە درۆکانە، کە لە دڵدا هەن، جا شەیتانی لێ دەچنە ژوورێ و ئەوچەکانەی دەست دەکەون و شەڕەنگێزی خۆی پێ دەکاو شالاوی پێ دێنێتە سەر دڵ، جا ئەگەر بەندە تفاقێکی زۆر پتەوی لەبڕوا هەبوو کە بەرەنگاری لێ بکا لەگەڵ شەیتان نیواو نیو دەبێ، ئەگەر نا زاڵی بۆ دوژمنەکەی دەبێو هەوڵ و تواناو هێزیش هەرتەنێ لە خوداوەیە، چونکە ئەگەر بەندە موڵەتی دوژمنی خۆی داو دەرگەی ماڵی بۆ ئاوەلاکرد و لەخۆی وەژوور خست و چەکەکانی خۆی خستە بەردەستان تا دژی بجەنگی ئەوا هەر لۆمەی خۆی دەکرێ.**

**فَنَفْسكَ لُم ولا تَلُم المطـايا**

**ومت كمــداً فلـيس لك**

**واتە: هەر تەنیا سەرکۆنەی خۆت بکەو لۆمەی کەسی دی مەکە، بەدڵتەنگی بمرە، چونکە هیچ بیانو و هەنجەتێکت نیە.**

# دانایی له ئەفراندنی شەیتان

شەیتان چاوگی خراپەکاری و ژانانە، هەر ئەو رابەرە بۆ بەهیلاك چوون لە دونیا قیامەت و، لەهەموو کات و شوێنکدا بەیداخی هەڵداوەو، بۆ کوفرو بێباوەڕی ویاخیبوون لەخودا بانگەوازی خەڵکی دەکا، جا ئایا دانایی لە ئافەریدکردنی هەیە؟ وە ئەگەر هەیە چ داناییەکە؟

ئیبنیقەییم لە کتێبی (شفاء العلیل /٣٢٢)دا، وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوەو دەڵێ:

(داناییەکی زۆر لە ئەفراندنی ئیبلیس و سەربازەکانیدا هەیە کە هەر خودا ئاگایە لەوردو درشتیان).

## ١-ئەو پایانەی بەندایەتی کە لەسەر تێکۆشان دژی شەیتان و دەست وپێوەندەکەی بنیات دەنرێ:

خودای گەورە پایەکانی بەندایەتی بۆ پێغەمبەران و دۆستانی خوا تەواو دەکا، بەکۆشین دژی دوژمنی خوداو کۆمەڵەکەی و، پێچەوانە بوون و ناکۆك بوون لەگەڵیدا لەپێناوی خودای گەورەو خۆ پەنادان بەخودا لەشەیتان و پەنا بردنە بەر خودا تا لە شەڕو فێڵ و تەڵەکەی شەیتانی پەنایان دا، جا گەلێك بەرژەوەندی ژین و ژیانەوە لەسەر ئەمە رادەوەستێو بێ ئەوە بەدی نایەن..

بوونی شتێکیش کە پابەندو راوەستاوبێ لەسەر شتێکی دیکە، بەتەنێ پێک نایە.

**٢- لەگوناە ترسانی بەندان:**

ترسانی فریشتەکان و بڕواداران لە گوناهەکانیان پاش ئەوەی لەحاڵی ئیبلیس ئەوەی دیتیان دیتیان و، بەربوونەوەی لە پایەی فریشتەیی بۆ مەنزڵگەی ئیبلیسی لەهەمووی کاریگەرتر بو، گومانیش لەوەی نیە کە فریشتەکان ئەوەیان دیت بەندایەتیەکی دیکەو مل کەچ بونێکی دیو ترسێکی‌تریان بۆ پەروەردگاری بەرز لەلا دروست بوو، هەروەکو لەحاڵی کۆیلەکانی پاشایەك دێتە بەر چاوان، کە دەبینن لەبەرچاوی وان زۆر خراپ یەکێکیان لێ ریسواو روشکێن دەکا، دیارە بەمە ترسان و ئاگا لەخۆ بوونیان زێتر دەبێ.

**٣- خودا شەیتانی کردۆتە پەندێك بۆ ئەوانی پەند ومردەگرن:**

خودا شەیتانی کردۆتە پەندێك بۆ ئەوانەی پێچەوانەی فەرمانەکانی رەفتار دەکەن و زلفیزی دەنوێنن لەئاست تاعەت کردنی‌و مکوڕن لەسەر یاخی بوون، هەروەك گوناهی باوکی مرۆڤی کردۆتە پەند بۆ ئەوانەی نەهیەکانی ئەنجام دەدەن یا لە فەرمانی یاخی دەبن و، پاشان دەگەڕێنەوەو ژیوان دەبنەوەو بۆلای خودا دێنەوە، هەردوو باوکی جنۆکەو مرۆڤ بە گوناە ئەزموە، باوکێکی کردۆتە پەند بۆ کەسێك پێگیرو بەردەوامە لەسەر گوناهەکەی و، باوکەکەی دیکەشی کردۆتە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆلای خوداو ژیوان دەبنەوە، جا توخوا چەند حیکمەتی درەوشاوەو ئاماژەی ئاشکراو دیار لەمەدا هەیە.

**٤- خودا شەیتانی کردۆتە ئەزمون و تاقیکردنەوە بۆ بەندەکانی:**

هەروا خودای بەرز شەیتانی کردۆتە مەحەکێك و ئافەریدەکانی خۆی پێی دەئەزموێ، تا پیس و پاك و چاك و خراپیان پێ لێك هاویڕ دەکا، چونکە خودای گەورە جۆری مرۆڤی لەسەر زەویدا ئەفراندووە، کەسانایی و دڵتەنگی و، پاك و پیسی تێدایە، بۆیە دەبوا ئەوە بخاتەروو کە لە کەرەستەکانیاندا هەیە، هەروەکو لەو فەرمودەیەدا هاتووە کە تیرمیذی بە مەرفوعی دەیگێڕێتەوە: خودا ئادەمی لە چنگە خۆڵێك ئەفراندووە کە لەهەموو زەوی هەڵیگرتووە، ئادەمیزادانیش بە هەمان شێوە هاتوون، پاك و پیس و سانا و دڵتەنگ و هی دیکەیان تێدایە، ئەوی لە کەرەستە بنەڕەتیەکەشدا هەبێ لەوەشدا هەیە کە لێی ئەفرێنراوە، حیکمەتی خودایی وای خواستووە کە دەرکەوێ‌و ببێتە روکەش، جا پێویستی بە هۆکارێك هەیە کە دەری بخا، ئیبلیسیش سەنگی مەحەکە کە چاکی‌و خراپ و پاك وپیسی پێ لێك جودا دەکرێتەوە، هەروەك خودا پێغەمبەرانی خۆی (علیهم السلام) کردۆتە سەنگی مەحەك بۆ ئەم جیاکردنەوەیە، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ: بۆ خودا شیاو نیە کە بڕواداران هەروا بهێڵێتەوە بەو بارەی ئێوەی تێدان، تاکو پاك و پیسان لێکتر جیا دەکاتەوە ﴾ (سورة آل عمران/١٧٩)، پێغەمبەرەکانی بۆ ئەرکباران ناردووە کە باش و خراپیان تێدایە، جا باش دەچێتە پاڵ باش و خراپیش دەچێتە پاڵ خراپ.

دانایی خوداش وای ویستووە کە لە خانەی ئەزموونندا تێکەڵیان بکا، کە دەگەنە خانەی دواییش لێکدی جودا دەکرێنەوە، ئەمیان بەتەنێ دەچێتە خانەیەك و ئەویان خانەیەك، جا حیکمەتێکی بالاْو توانایەکی گەورە لەمەدا هەیە.

**٥- دەرخستنی تەواوێتی توانای خودای پاك بە ئەفراندنی دژەكان:**

داناییەكی دیكەش ئەوەیە كە تەواوێتی توانای دەربخا بە ئەفراندنی وەكو جیبریل و فریشتەكان و ئیبلیس و شەیتانەكان، ئەوەش لە مەزنترین نیشانەكانی تواناو ڤانی دەسەلاتی خودان، چونكە خودا ئافەریدگاری دژەكانە وەك ئاسمان و زەوی و، رووناكی و تاریكی و، بەهەشت و دۆزەخ و، ئاو و ئاگرو، گەرماو سەرماو، پاك و پیس.

**٦- دژ جوانی دژەكەی دەردەخا:**

حیكمەتێكی تریش ئەوەیە كە ئەفراندنی یەكێك لە دژەكان لە تەواوێتی جوانی دژەكەیەتی، چونكە جوانی دژ بە دژەكەی دەردەكەوێ و، ئەگەر ناشرین نەبا بەهای جوانی نەدەزانراو، هەژاریش نەبا بەهای دەوڵەمەندی نەدەزانرا.

**٧- ئەزموناندن بە ئیبلیس رێگەیەكی وەدیهێنانی سوپاسگوزاریە:**

داناییەكی تریش ئەوەیە، خودای گەورە دەیەوێ كە بە سوپاسگوزاری راستەقینەو جۆرەكانی سوپاس بكرێ، گومانیش لەوەدا نیە كە دۆستانی خودا بەهۆی بوونی ئیبلیسی دوژمنی خواو سەربازەكانیو ئەزموناندنیان، بەهۆی ئەمانەوە جۆرەها سوپاسگوزاری وایان بۆ رەخساوە بێ وان نەدەهاتە دی، جیاوازی چەند زۆرە لەنێوان سوپاسگوزاری ئادەم كە لە بەهەشتیدا بوو، لەگەڵ سوپاسگوزاریەكەی پاش ئەوەی بە دوژمنەكەی ئەزمونرا، پاشان خودای گەورە هەڵیبژاردو تۆبەی لێ قبوڵ كرد.

**٨- گەرم بوونی بازاڕی بەندایەتی، لە ئەفراندنی ئیبلیسدایە:**

داناییەكی تر ئەوەیە كە خۆشویستن و ژیوانبونەوەو پشت بەخوا بەستن و ئارامگرتن و خۆشنودی و.... تاد، خۆشەویسترین پەرستشن لەلای خودای

بەرز، ئەم بەندایەتیەش بە جیهادو خۆبەخشین وەدی‌دێ، لەگەڵ پیشخستنی خۆشویستنی خودا لە هەموو خۆشەویستیەکی تر، چونکە جیهاد ترۆپکی بەندایەتیەو لەلای خودای پەروەردگار لەهەموو جۆرەکانی بەندایەتی خۆشەویستره، جا بە ئەفراندنی ئیبلیس و کۆمەڵی هاودەمانی بازاڕی ئەم بەندایەتیەو پاشکۆکانی گەرم بووە، کە هەر خودا دەزانێ حیکمەت و سوودو بەرژەوەندیەکانی چەندن.

### ٩- دەرکەوتنی نیشانەو تواناکانی خودا بە ئەفراندنی ئیبلیس دێتە دی:

داناییەکی دیکە ئەوەیە کە بە ئەفراندنی کەسێك کە دژایەتی پێغەمبەرەکانی خودا بکاو وەدرۆیان بخاتەوە، بەتەواوی نیشانەو تواناکانی خوداو جوانی دەسکردەکانی دەردەکەوێ، کە هەبوونیان بەسوودتره بۆ دۆستانی خودا لە نەبوونیان، وەك ئەو نیشانانەی کە خودای مەزن بە پێغەمبەرەکانی خۆی بەخشی بوو لە؛ لافاوی نوح و، داردەست و، دەست و، دەریا شەق بوونی موساو، خستنە ناو ئاگری ئیبراهیم (علیهم السلام)، لەگەڵ چەندان و چەندان نیشانەی دیکەو، بەڵگەی تواناو، زانین و، دانایی خودا دیارە هەموو ئەوانەش دەبێ هۆو ئەنگێزەیان هەبێ تا بێنە دی.

### ١٠- ئەفراندنی شەیتان لە ئاگر نیشانەیەکە:

یەکێکی دی لە حیکمەتەکانی ئەوەیە کە کەرەستەی ئاگر سوتاندن و بەرزگیری و گەندەڵی تێدایە، هەروەها بریقەو تیشك دان و رووناکی تێدایە، جا خودای گەورە ئەمیش و ئەوەشی لێ دەرهێناوە، هەروەکو کەرەستەی خۆڵی زەوی پاك و پیس و، سانایی و ناخۆشی و، سورو رەش و سپی تێدایە، جا خودای گەورە بە حیکمەت و توانایەکی مەزن، ئەمانەی لێ دەرهاویشتووە،

ئەمەش بەڵگەیەکە ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ: هیچ هاوکوف و هاوشێوەیەکی نیەو هەر خوا بیسەرو بینەرە ﴾ (سورة الشوری/١١).

**١١- دەرکەوتنی پەیوەستیەکانی ناوە پیرۆزەکانی:**

یەکێکی تر لەو دانابیانە ئەوەیە کە لەمیانەی ناوە پیرۆزەکانیدا ئەو ناوانە هەن (الخافض: نەویکەرەوە)و (الرافع: بەرزکەرەوە)و (المعز: سەربەرزکەر)و (المذل: سەرکزکەر)و (الحکم: فەرمانڕەوا)و (العدل: دادپەروەر)و (المنتقم: تۆڵەسێن)، جا ئەم ناوانە دەبێ ئەو پێداویستیانەیان هەبێ کە حوکمەکانی تێدا دەرکەوێ، وەکو ئەو ناوانەی بە چاکەکاری و ڕۆزیو میهرەبانیو هاوشێوەکانی پەیوەستن، جا دەبێ پێداویستی هەردوو جۆر دەرکەون.

**١٢- دەرکەوتنی شونی تەواویتی موڵك و گشتگیری لەسەر ڕشتەداری:**

دانابیەکی دیکەش ئەوەیە کە خودای بەرز پادشایەکە موڵکی تەواوە، لە تەواوێتی موڵکیدا سەر ڕشتەداری و جۆراو جۆر کردنی پاداش و سزاو ڕێزانەو سووك کردن و دادپەروەری و چاککاری و سەربەرز کردن و سەرشۆڕ کردنە، جا چۆن جۆرێکیان هەن پێویستە جۆرەکەی دیکەش هەبن.

**١٣- هەبوونی ئیبلیس لە تەواویتی حیکمەتی خودای بەرزە:**

دانابیەکی دیکە ئەوەیە کە، یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی خودا (الحکیم: داناو کاردروستە)، هەروەها دانایی سیفەتی خودای بەرزیشە، دانایی و کاردروستیش ئەوەدەخوازێ کە هەر شتێك لەشوێنی خۆی دابنێ کە لەوی بترازێ بۆ شتێکی دیکە شیاو نەبێ، ئەمەش پێویستی بە ئەفراندنی دژەکان

هەیە، لەگەڵ تایبەتمەندکردنی هەریەکەیان بەو سیفەت و جیاکەرەوەو حوکمانەی کە بۆ بێجگە لەوی شیاو نیە، ئەگەر واش نەبێ دانایی وەدی نایێ، جا هەبوونی ئەم جۆرە لەتەواوێتی حیکمەت و داناییە، هەروەك لە تەواوێتی توانایە.

**١٤- خوای بەرز لە قەدەغەکردن و نەویکردن ستایش کراوە:**

هەر لەو حیکمەتانە ئەوەیە کە خودای بەرز لە هەموو روویەکەوە شایانی ستایشە، جا لەسەر دادەوری و قەدەغەکردن و نەویکردن و بەرزکردن و تۆڵەستاندن و سووك كردن ستایش دەکرێ، هەروەك لەبەهرەو بەخشین و بەرزکردنەوەو رێزدانێ ستایش دەکرێ، جا بۆ هەردوکان ستایشی بێپایان و تەواو دەکرێ، جا خودای بەرز لەسەر هەمووی ستایشی خۆی دەکا، هەروەها فریشتەکانی و پێغەمبەرانی و دۆستانی و ستایشی دەکەن و، هەموو خاوەن هەڵوێستان لەسەر ئەمانە ستایشی خودا دەکەن، جا هەر شتێکی پێویستی تەواوێتی ستایشی خودا بێ، لە هێنانە دی و ئەفراندنیدا داناییەکی تەواوی هەیە، هەروەك شیاوی ستایشی تەواویشە، جا نە دەبێ ستایشی لەکار بخرێ نەکاردروستی و دانایی.

**١٥- بە ئەفراندنی شەیتان، خودا هێمنیو ئارامی خۆی بۆ بەندانی دەردەخا:**

حیکمەتێکی تر ئەوەیە کە خودای گەورە ڤانی وایە، نیانی و، ئارامی و، لەسەرەخۆیی و فراوانی میهرو بەخشینی خۆی بۆ بەندانی وەدیار بخا، جا ئەمەش پێویست بووە کەسێك ئافەرید بکا کە هاوبەشی بۆ دانێ و لە حوکمەکانیدا دژی بێو هەوڵدا پێچەوانەی فەرمانەکانی رەفتار بکاو، بۆ تورەکردنی بکۆشێو، تەنانەت خودای بەرز بە ئافەریدانیشی بچوێنێ، ئەوجا ئەو خودایە بەبەزەییە جۆرەها شتی باشی بۆ برەخسێنیو رۆزی بداو،

تەندروستی بكاو، ئەو هۆكارانەی بۆ دابین بكا كە چێژ لە نیعمەتی جۆراوجۆر وەرگرێ‌و دوعای گیرا بكاو خراپەی لێ لاداو بە چاكەكانی خۆی دەگەڵی مامەڵە بكا بە پێچەوانەی مامەڵەی وی كە كوفرو شیرك و بەدكاریە، جا هەر خودا دەزانێ ئەمە چەندی حیكمەت و ستایش كردن تێدایە.

هەروەها بەهۆی كەمالاتی جۆراوجۆری لەلای دۆستانی خۆشەویست دەبێ‌و دەناسرێت، لە صەحیحدا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((لا أحد أصبر علي أذى يسمعه من الله، يجعلون لـه الولـد وهـو يرزقـهم: كەس هێندەی خودا ئارامگرنیە لەئاست ئەو ئەزیەتانەی دەیبیستێ، منداڵی بۆ بڕیار دەدەن كەچی ئەو رۆزیان دەدا)).

هەروەها بە صەحیحی لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە، كە لە پەروەردگاری دەگێڕێتەوە: ((شتمني ابن آدم، وما ينبغي له ذلك، وكذبني ابن آدم، وما ينبغي له ذلك، اما كذبه إياي، فقوله: اتخذ الله ولداً، وانا الأحد الصمد الذي لم ألد ولم أولد ولم يكن لي كفؤاً أحد، وأما تكذيبه إياي فقوله: لن يعيدني كما بدأني، وليس بأول الخلق بأهون عليه من اعادته: ئادەمیزاد جوێنی پێ دام، نەدەبوا واش بكا، وە ئادەمیزاد بەدرۆی خستمەوەو، نەدەبوا واش بكا، هەرچی جوێندانەكەیە ئەوەیە كە دەڵێ: خودا منداڵی هەیە، كەچی من تاك و تەنیاو جێی مەبەستم نەكەسم لێ بووەو نە لەكەس بویمەو نە هیچ هاوشانێكیشم هەیە، هەرچی بەدرۆ خستنەوەكەشمە ئەوەیە كە دەڵێ: نامگێڕێتەوە وەك چۆن دروستی كردووم، كەچی دووبارە ئەفراندن لەوەی جاری یەكەم زەحمەتتر نیە لەلای من))، جا خودای مەزن لەگەڵ ئەو جوێندان و وەدرۆ خستنەوانەش بژێو داداتە جوێندەرو وەدرۆخەرو تەندروستی دەكاو بۆ بەهەشتەكەی بانگی دەكاو ئەگەر ژیوان بۆوە تۆبەكەی قبول دەكاو ئەوجا خراپەكانی بۆ بەچاكە دەگۆڕێ‌و لە هەموو بارێكیدا بە پەنهانی چاكەی دەگەڵدا دەكا، وە بۆ ناردنی پێغەمبەرانی ئامادەی دەكاو،

فەرمانیان پێدەکا بەنەرمی بیدوێنن و، چاویان لێی‌بێ، فوضەیلی کوڕی عیاض دەڵێ: (هەر شەوێك کە تاریك دادێ خودای بەرز بانگ دەکا؛ کێ لە من بەخشندەترە، ئافەریدان لێم یاخین، منیش لەنێو نوێنەکانیاندا پاسیان دەکەم و موڵەتیان لێ دەگرم، هەروەك یاخی نەبووبن، هەر خۆم دەیانپارێزم، هەروەك گوناهیان نەکردبێ، چاکە لەگەڵ یاخیان دەکەم و گەورەیی و میهرم لەئاست بەدکار دەبێ

من ذا الذي دعاني فلـــم البه؟

ومن ذا الذي سألني فلم اعطه؟

واتە: کێیە ئەوی بانگی کردم و بە هانای نەهاتم، کێیە ئەوەی داوای لێکردم و نەمدایێ.

مـن پەخشندەم و بەخشندەییش لە منەوەیە، مـن بەرێزم و رێزدارییش لەمنەوەیە، لەرێزی منە کە هەرشتێکی بەندە داوای بکا پێی دەبەخشم و ئەوی داواشی نەکا هەر دەیدەمێ‌و هەر لە رێزی خۆم وا بە تۆبەکار دەبەخشم وەك گوناهی نەبێ، جا ئافەریدان لە من هەڵدێنە کوێ و، یاخیانیش لە ئاستانەی منەوە روو دەکەنە کوێ؟

لە فەرمودەویەکی قودسیدا هاتووە: ((إني والأنس والجن في نبأ عظيـــم: أخلـــق ويعبد غيري، وارزق ويشكر ســـــواي: من و مرۆڤ و جنۆکە لە هەواڵێکی مەزن داین؛ من ئافەریدەکەم، غەیری من دەپەرسترێ، من بژیو دەبەخشم و بێجگە لە من سوپاس دەکرێ)).

لە شوێنەوارێکی حەسەنیش هاتووە: ((ابن آدم ما أنصفتني؛ خيري إليك نـــازل، وشرك إلي صاعد، كم أتحبب إليك بالنعم، وأنا غني عنك، وكم تتبغض إلي بالمعاصي وأنت

فقير إلي، ولا يزال الملك الكريم يعرج إلى منك بعمل قبيـــح: هۆ ئادەمیزاد، لـە ئاست مندا دادگەر نەبووی، خێری من بۆت دادەبەزێ و شەڕی تۆ بۆ من هەڵدەکشێ، چەند بەهۆی نیعمەتەکانم خۆشەویستی خومت پێدەبەخشم، لەگەڵ ئـەوەی لێت بێنیازم، تۆش چەند خۆتم لا بوغزاو دەکەی بەهۆی تاوانەکانت، لەگەڵ ئەوەی کە بەمن ئاتاجی، هەمیشە ئەو فریشتە ڕێزدارە کاروکردەی ناشرینی تۆ بۆ من بەرز دەکاتەوە)).

لە فەرمودەیەکی صەحیحیشدا هاتووە: ((لو لم تذنبوا لذهب الله بكـــم، ولجـــاء بقوم يذنبون فيستغفرون فيغفر لهم: ئەگەر گوناهتان نەکردبا، خودا لەناوی دەبردن و، قەومێکی دیکەی دەهێنا گوناهیان دەکرد جا داوای لێخۆشبوونیان دەکردو لێیان خۆش دەبوو)).

**خودا ئافەریدانی ئەفراندون بە شێوەیەك کە حوکم و شوێنەوارەکانی ناو وسیفەتە پیرۆزەکانی تێدا ڕەنگ بداتەوە:**

خودای پاك و بەرز لەبەر تەواوێتی خۆشویستنی بۆ ناوو سیفەتە بەرزو پیرۆزەکانی، ستایش وکاربەجێیەکەی وای خواستووە ئافەریدەی وا بئەفرێنێ کە حوکم و شونەکانی ئەو ناو سیفەتە پیرۆزانەیان تێدا ڕەنگ بداتەوەو لێیان دەرکەوێ، جا لەبەر خۆشویستنی بۆ لێبوردن، هی وای ئەفراندووە لێیان ببورێ، لەبەر خۆشویستنی بۆ لێخۆشبوون، هی وای ئەفراندوە کە لێیان خۆشبێ و لە ئاستیان هێمن بێ و ئارامیان لەسەر بگرێو پەلەیان لێ نەکا، بەڵکو مەزنە موڵەت دان و ئارام کردنی دەکات.

وە لەبەر خۆشویستنی بۆ دادپەروەریو کاردروستی هی وای ئافەریدەکردووە دادپەروەریو دانایی خودایان لێ دەرکەوێ.

لەبەر خۆشویستنی بەخشین و چاکەکاری، هەی وای ئەفراندووە کە بەخراپەو تاوان مامەڵە لەگەڵ خودا بکەن و، ئەو زاتە پاکەش بە لێخۆشبون و چاکەکاری مامەڵەیان لەگەڵدا بکا، جا ئەگەر خودا خەڵکێکی وای نەئەفراندبا کە جۆرەها خراپەو گوناه ئەنجام بدەن ئەم هەموو حیکمەت و بەرژەوەندی و چەندان و چەندان هێندەی دیکە دەفەوتان، جا پاکیو پیرۆزی بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان، خاوەن دانایيو کاردروستی بێپایان و، بەهرەو نیعمەتی فراوان، کە داناییەکەی گەیشتۆتە ئاستی دەسەلاتی و، لە هەموو شتێکدا داناییەکی دیاری هەیە هەروەك توانا زاڵەکەیو رێنوێنیەکانی.

**ئەوجا: بە ئەفراندنی ئەونەفرەت لێکراوە گەلێك دانایی هاتنە دی و زۆر خۆشویستنی خودا هاتنە ئارا:**

بەهۆی ئەو ئافەریدە بوغزێنراوە لەلای پەروەردەگارەوە، گەلێك لە خۆشویستنەکانی خودا هاتونەتە ئارا، چونکە شتی بوغزێزێنراو نەبن شتی خۆشویستراو هەرگیز وەدی نایەن.. ئەگەر بە هۆی ئیبلیسی دوژمنی خودا زۆر خراپە و تاوان روویان دابێ، ئەوا بەهۆی بوونی ئەو و سەربازدکانی گەلێك تاعەت هاتوونەتە دی کە لەلای خودا گەلێك خۆشەویست ترن و زیاتر جێگای رەزامەندی ئەون هەروەك جیهاد لەپێناوی خوداو، پێچەوانە بوون و نەگونجان دەگەڵ نەفس و ئارەزووان لەپێناو خوداو، خۆراگری لەبەرامبەر سەختيو ناخۆشی بۆ وەدەست هێنانی خۆشنودی و رەزامەندی خودا، خۆشەویست ترین شتێکیش بۆ خۆشەویست ئەوەیە کە خۆشەویستیەکەی ببینێ لە پێناو ویدا بەرگەی ئازارو هیلاکی دەگرێ کە خۆشەویستییەکەی دەسەلمێنێ.

من اجلك قد جعلت خدي أرضا

للشامت والحسود حتى ترضى

**واته: لە پێناو تۆ ڕوومەتی خۆم کردە زەوی ، بۆ جوێن دەران و حەسودان تا تۆ خۆشنودو ڕەزامەند بی.**

**لە شونێکی خوداییشدا هاتووە:** ﴿ بغيتي ما يتحمل المتحملون من اجلي: **مەبەستم ئەو شتەیە کە ئیمانداران لە پێناو مندا بەرگەی دەگرن** ﴾ .

**جا ئەوە چەند لای خودا خۆشەویستە کە خۆشەویستان لەپێناو ڕەزامەندی وی خۆ لەئاست ئازاری دژمنان ڕاگرن، ئەمەش چ سوودێکی بێپایانی بۆ ئەو بەندانە هەیە لە پاشەڕۆژدا چ ڕێزو شکۆیەکیان لەلایەن خودای خۆشەویستیانەوە پێ دەبەخشرێ، بەڵام ئەمە لەوان کەسانیش حەرامە کە خۆشویستنی پەروەردەگار ئینکار دەکەن، نە بۆنی دەکەن و نە لەو دەرگەیە دەچنە ژوورێ‌و نە لەو خۆشاوە دەخۆنەوە.**

قل للعيون العمى للشمس أعين
سواك يراها في مغيب ومطلع
وسامح بؤساً لم يؤهل لحبهم
فما يحسن التخصيص في كل موضع

**واته: بە چاو کوێران بڵێ چاوی دیکە هەن ڕۆژ لەکاتی ئاوابوون و هەڵاتندا ببینن و هەموو کەسێکیش شیاو نیە تایبەتمەند بکرێ لە هەموو شوێنێکدا.**

**جا ئەگەر ئەو ئافرەیدەیە پەروەردگاری خۆی تورەکرد، ئەوا پێغەمبەرو نێرداوانی‌و دۆستانی ڕازی دەکەن، ئەو ڕازی بوون و خۆشنودیەش مەزنترە لەو توڕەییە، ئەگەر ئەنجامدانی گوناه و تاوان ڕقیشی هەستێنی، ئەوا خودای بەرزو پاك زێتر بە ژیوانی بەندەی خۆی شادە لەو کەسەی چارەوێکەی بزر کردبێ کە خواردن و خواردنەوەکەی لەسەربێ و لەرێی هات و نەهاتدا بێ و**

بیدۆزتەوە، ئەگەر لەوەش تورە بوبێ کە بەهۆی ئەو نەفرەت لێکراوە بەسەر پێغەمبەرەکانیدا هاتووە، ئەوا شادو خۆشنودە بەوەی ئەو پێغەمبەرانە ئەنجامیان داوە کە لەگەڵ شەیتان جەنگیون و لێی یاخی بوون و هەژمەت و خەمیان داوەتیو ئازاریان داوە، ئەم خۆشنودیەش لەلای خودا مەزنترو چاکترە لەوەی بەفەوتانی ئەم مەکروهە ئەم کارە چاکانەش فەوتابان، ئەگەر رقیشی هەستابێ بەوەی کە ئادەم لە دارەکەی خوارد، لەوە خۆشنودبووە کە پەشیمان بۆوەو گەڕاوەو ملکەچ و کزبوو لەبەر دەمیدا.

ئەگەر بەوە تورە بووبێ کە دوژمنانی بەم شێوەیە پێغەمبەرەکەیان ﷺ وەدەرنا لە شارو حەرەمی خۆی، زۆر رەزامەندو خۆشنود بووە بە گەڕانەوەو چونەوە ناوی بەو شێوەیە.

ئەگەر رقی لەوەش هەستابێ کە دۆست و خۆشویستانی کوژرابن و گۆشتیان پارچە پارچە کرابێ و خوێنیان رژا بێ، بەوەی رازی بووە کە ژیانێکیان دەست کەوتووە لەنێزیك خوادا کە هیچ ژیانێکی وا شیرین و پڕچێژ و پڕنیعمەت چنگ ناکەوێ.

ئەگەر رقی لە تاوانی بەندەکانی هەستابێ، بەوەی خۆشنود بووە کە فریشتەکان و پێغەمبەرەکانیو دۆستەکانی فراوانی لێخۆشبوون و لێبوردن و چاکەو رێزو بەخشندەیی وی دەبینین و پێیدا هەڵدەڵێن و ستایشی دەکەن و بەمەزنی دەگرن، جا ئەو سیفەتە پیرۆزانەی کە ستایشی پێی کراوەو پێی هەڵگوتراوە خۆشویستترە لەلایو پتر لێیان رازیە لەوەی بە فەوتانی ئەو گوناهانە ئەو خۆشویستنانە دەفەوتان.

جا بزانە کە ستایشی خودا ئەو بنەڕەتەیە کە سەرجەم ئەوانە لەخۆ دەگریٚ، ئەوە گریٚی رژیٚمی ئەفراندن و فەرمانە، سەرجەم ستایشیٚکیش بەهەموو رو و لیٚکدانەوەکانی بۆ خودای پەروەردگارە، هەر شتیٚکی ئەفراندبیٚ و حوکمی بەهەر شتیٚك کردبیٚ ستایشی وی تیٚدایە، جا ستایشی راستەقینەی گەیشتۆتە هەموو ئافەریدەو فەرمانەکانی ستایشیٚکی وا کە خۆشویستن و خۆشنودی و رازی بوون لیٚی و رازی بوون پیٚی گرتۆتە خۆ لەگەڵ بریاردانی کاربەجیٚیی و دانایی لەبن نەهاتو و بیٚپایانی لە هەموو ئافەریدەو فەرمانیٚکی جا لە کارخستنی کاردروستی وی جودایە لە لەکارخستنی ستایشی، هەروەك چۆن هەر دەبیٚ ستایش کراو بیٚ هەر دەبیٚ کاربەجیٚو داناش بیٚو ستایشی دانایی وەکو زانست و توانای وان، ژیانیشی لە پیٚداویستی خودایەتی و خودا چۆن خاوەن ستایشە ئاواش دانایەو ستایش و دانایییەکی وەك زانایی و توانایی لیٚی دانابریٚن، لە کارخستنی هەر بڕیٚکی سیفەت و ناوەکانی و پیٚداویستی و شونەکانی دروست نیە، چونکە ئەوە کەم و کوڕی گەرەکە، کە پیٚچەوانەی تەواویٚتی و بیٚهاوتاییو مەزنیٚتی خودایە.

**وە لەبەر ئەوەی خودا حەزدەکا ببیٚتە پەناگای دۆستانی:**

لەم بارەیەوە ئیبنیقەییم دەڵیٚ: دیسان وەك ئەوەش لە سیفەتەکان تەواویٚتی وکردارەکانی ستایشی خودایە کە دەبەخشیٚو ویٚدەدا خودا پەنادەداو سەردەخاو وەهانادیٚ، هەروەك پیٚی خۆشە پەناگران پەنای وەبەرببەن و هانابەران هانای وەبەر ببەن.

لە تەواویٚتی پاشایانیش ئەوەیە کە دۆستانیان پەناو هانایان ببەنەبەر، هەروەك ئەحمەدی کوڕی حوسەینی کیندی لە هەڵنانەکەیدا دەڵیٚ:

يــا من ألــوذ به فيما أؤمــله
ومن أعــوذ به مما أحـــاذره
لايجبر الناس عظماًأنت كاسره
ولا يهيضون عظماً أنت جابره

واته: هۆ ئەوەی لە ئاواتەكانم هانای وەبەر دەبەم و لەكاتی ترساندا پەنای پێدەگرم، خەڵكی هێسكیان پێ ناگیرێتەوە كە تۆ شكاندبت، ئەو هیسكەشیان پێ ناشكێتەوە كە تۆ گرتوتەوە.

جا ئەگەر ئەوەی بۆ پەروەردگاری ئافەریدگاری خۆی گوتبا پێ ئاسودەتر دەبوو لەوەی كە بۆ ئافەریدێكی وەك خۆی گوتووە.

مەبەستیشی ئەوەیە كە بەندەكان دەبێ پەنا بە شای شایان بگرن هەروەك فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووە خۆی پێ پەنا بگرێ لە شەیتانی دەركراو هەروەك لە زیاتر لە شوێنێكی قورئاندا هاتووە، جا بەهرەو سیفەتی تەواوی بۆ بەندەكانی بەوە دەردەكەوێ كە پەنای بداو بەهانای بێ، وەهانا هاتن و پەنادانیشی دوو نیعمەتی بەرزن، خودای مەزن دەیەوێ نیعمەتەكانی خۆی بۆ بەندەكانی پێیان تەواوكا، و پێشانیان بدا كە سەریان دەخا بەسەر دوژمنەكانیان و دەیانپارێزێ، جا وای لەو نیعمەتە بەرزەی كە بەهرەو نیعمەتەكانی پێ تەواو كردووەو لەو دادەی لە ئاست دوژمنانی دەریخستووە.

ومــا منهــا إلا له فيه حكمة
يقصر عن إدراكها كل باحث

واتە: هەر شتێك هەبێ دانایيەكی وی تێدایە، كە هەموو تۆژەرێكلەپەی پێ بردنی كورت هەڵدێنێ.

**حیکمەت لە مانەوەی ئیبلیس تا ئاخیر زەمان:**

ئیبنی‌قەییم (بەرمیهری‌خودابیٚ) لە (شفاء العلیل) لاپەرە ٣٢٧دا وەرامی ئەوەی داوەتەوەو روونی کردۆتەوە:

**ئەزمونی بەندان:**

لەوەی کە ئیبنی‌قەییم باسی کردووە؛ کە خودای بەرز شەیتانی کردۆتە سەنگی مەحەك و بێژنگێك کە باشی پیٚ لە خراپ جودا دەکاتەوەو دۆست و دوژمنانی خۆی پیٚ جیا دەکاتەوە، جا بۆیە حیکمەتی خودا وای ویستووە کە بیهێڵێتەوە تاکو مەبەستی ئەفراندنی بێتە دی، جا ئەگەر بیمراندبا ئەو مەبەستە دەفەوتا، هەروەك کاربەجێیی خودا وای ویستووە کە دوژمنە بیٚباوەڕەکانی تا ئاخیر زەمان لە زەویدا بهێڵیٚ و ئەگەر بنبڕیشی بکردبان، کاردروستیەکی و حیکمەتێکی زۆر لە کاردەکەوتن، چونکە چۆن حیکمەتی خودا وابووە باوکی مرۆڤ بئەزمویٚ، واش پێویست بووە زاڕۆڵەکانی پاش خۆی بئەزمویٚ، جا کامەرانی و ئاسوودەیی بۆ ئەوان وەدی بیٚ کە پێچەوانەی شەیتان دەبن و، ئەوانی دەگەڵیشی کۆك بن بەدەردی وی بچن.

**هەروەها لەبەر چاکەکاری پێشتری هێشتیەوە:**

هەروەها چونکە نیانی‌و دانایی خودا پێشتر وابووە کە شەیتان هیچ پشکێکی لە دوایيندا نیە، پێشتریش تاعەت و پەرستشی هەبووە، بەوە لە دنیادا پاداشتی داوەتەوە کە تا دواکات بیهێڵی، چونکە خودای بەرز ستەم لە هیچ کەس ناکا کە چاکەیەکی کردبیٚ، هەرچی بڕوادار بیٚ خودا بەهۆی چاکەکانی لەدنیاو دواین پاداشت و رێزانەی دەداتەوە، هەرچی کافرو بێبڕواش بیٚ لەدنیادا پاداشی ئەو کارەچاکانەی دەداتەوە کە کردونی، کە دەگاتە دواییینیش هیچی نابیٚ هەروەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بەم مانایە هاتووە.

### جڵەوی بەردراوە تا گوناهی زیاد بێ:

جا مانەوەی تا ڕۆژی رابوون لەبەر ڕێزی وی نەبووە، چونکە ئەگەر بمردبا بۆ وی چاکتر بو و شەڕی کەمتر دەبوو ئەشکەنجەشی سووکتر دەبوو، بەڵام کە گوناهی ئەستور بوو بەهۆی پێگیری و مکوڕی‌و دژاتی ئەو زاتەی کرد کە دەبووا خۆبداتە دەست حوکمەکانی وەهەروەها بەهۆی روشاندنی حیکمەتە بەرزەکانی و سوێند خواردن بۆ ڕێگرتن و لەمپەرخستنە پێش بەندەکانی لە پەرستشی خوادا، بۆیە سزاکانی بەپێی گەورەیی گوناهەکانی مەزن بووەو، لە دنیادا هێشتراوەتەوەو جڵەوی بۆ شۆڕکراوە تا گوناهی پتر بیٚ‌و شیاوی ئەو سزایە بیٚ کە بەتەنیٚ لەوی دەوەشێتەوەو، تا ببێتە سەرکردەی شەڕخوازان لە سزاداندا هەروەك لە شەڕی بێ‌باوەڕیدا سەرکردەیانە، لەبەر ئەوەی کەرەستەی هەموو شەڕێکیشە لەنێو ئاگری‌دا بەپێی کردارەکانی سزا دەدریٚ، جا هەر ئەشکەنجەیەك بۆ دۆزەخییان دابەزیٚ لەویرا دەست پێدەکا ئەوجا بۆ شوێنکەوتوانی تەشەنە دەکا وەك دادێکی ئاشکراو حیکمەتی هەرە بەرز.

### بۆیەی هێشتۆتەوە تا سەرداریٚتی تاوانباران بکا:

یەکێکی دیکە لە حیکمەتەکانی هێشتنەوەی تا ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە لە دژی پەروەردگاری گوتی: ﴿ قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلاً: ئایا دیتت ئەوەی لەباتی من هەڵتبژاردوە، ئەگەر تا ڕۆژی رابون زندوم راگری، لە ژمارەیەکی کەم بترازیٚ هەموو زارۆکەکانی لاڕیٚ دەکەم و ڕەگوڕیشەی چاکیان لەبن دەردێنم ﴾ (سورة الاسراء/٦٢).

جا كه خودا زاناو ئاگایه هێندێك له نەوەی ئادەم بۆ هەندێ ناشێن له خانەی ویدا نیشتەجێ بن و تەنیا شیاوی ئەوەن لە نێو دڕك و پاشەڕۆیان بگوزەرێنن، بۆ وان هێشتیەوە، جا بەزمانی قەدەر پێی فەرموو ئەوانە هاوەڵ و دۆستی تۆن، جا لە چاوەڕوانی ئەوان دانیشەو هەرکاتێك یەکێکت لەوان بەلادا ڕەت بوو، چی لەگەڵ دەکەی بیکە، چونکە ئەگەر بۆ من بشیایا نەمدەخستە بەردەستی تۆ، چونکە من پشتیوانی کارچاکانم و ئەوان بۆ من دەشێن، تۆش پشتیوان و سەرداری ئەو تاوانبارانەی کە پشتیان لە دۆستایەتی من کردووەو بێ نیازن لە خۆشنودی من خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ: شەیتان دەسەڵاتی بەسەر ئەوان کەساندا نیە کە بڕوایان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، بەڵکو دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدایە کە دۆستایەتی دەکەن و هاوبەشی بۆخودا دادەنێن ﴾ (سورة النحل/٩٩-١٠٠).

هەروەها ماندنی پێغەمبەران لەبەر هەندێ نەبووە کە لەلای خودا سووك و بێبەهان، بەڵکو بۆ هەندێ بووە تا بگەنە شوێنی ڕێزی خوداو لە پەشێوی و ماندوو بوونی دنیا بحەسێنەوەو لە ئازاری دوژمنانیان ڕزگاریان بێ، جا ماندنیان بەرژەوەندی ئەوان و ئومەتەکانیان تێدایە، بۆ پێغەمبەران حەسانەوەیە لە دنیاو گەیشتنە بە هاوەڵی بەرز لە تەواوترین چێژو خۆشیدا بەتایبەتی کە خودا سەرپشکی کردوون لەنێوان مانەوە لە دنیاو گەڕانەوە بۆ لای وی، بۆ ئومەتەکانیش تا بزانرێ هەر لە کاتی ژیانی پێغەمبەران تاعەت و گوڕایەڵیان نەکردوون، بەڵکو پاش مردنیشیان هەروەك پێشو تاعەتیان کردوون و تا بشزانن کە شوێنکەوتووانیان ئەوانیان نەپەرستووە بەڵکو خودایان پەرستووە بەپێی فەرمان و بەرهەڵستی پێغەمبەران.

خودای بەرزیش هەمیشە زندووی نەمرە، جا چەند حیکمەت و بەرژەوەندی لە مراندنی پێغەمبەراندا هەیە بۆ خۆیان و ئومەتەکانیان.

ئەوەی کە ئەوانیش مرۆڤن و، خوداش لە دنیادا هیچ مرۆڤێکی ئافەرید نەکردووە بە شێوەیەکی شیاو بۆ مانەوە، بەڵکو کردونی بە جێنشین لەسەر زەویداو یەك جێی ئەوی دی دەگرێتەوە، جا ئەگەر بیانهێڵێتەوە، بەرژەوەندی و دانایی کردنیان بە جێنشین دەفەوتیّو زەوییان لێ تەنگ دەبێتەوە، جا مردن تەواوێتی هەموو بڕواداریکە، ئەگەر نەبا ژینی دونیا خۆش نەدەبو و کەسیش ئارامی تێدا نەدەبوو، جا دانایی‌و کاردروستی مردن وەکو دانایی‌و کاردروستی دنیایە.

## تا چ ئاستێك شەیتان توانیتی ئادەمیزاد تونا کا؟

کاتێك شەیتان ڕەتی‌کردەوە سوژدە بۆ ئادەم ببات و، خودا لەمیهرو بەهەشتی خۆیّ وەدەری ناو، توڕەیی و نەفرەتی بەسەردا باراند، شەیتان لەبەردەم پەروەردگاری مەزندا گفتێکی‌دا کە گومڕامان کاو فریومان داو، بمانکاتە بەندەی خۆی: ﴿لَعَنَهُ اللَّهُ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَفْرُوضًا ۝ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ.....: خودا نەفرەتی لە شەیتان کردو، ئەویش گوتی: بەشێکی دیاریکراو لە بەندەکانی تۆ دەکەمە بەندەی خۆم، لە ڕیّ لایان دەدەم و بە ئارەزوو سەرگەرمیان دەکەم﴾ (سورة النساء/١١٨-١١٩).

﴿قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِي إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا: گوتی؛ ئایا ئەوەت دیت کە لە باتی من هەڵت بژاردووە، ئەگەر تا ڕۆژی

رابون زندوم راگری، له ژمارەیەکی کەم بترازی هەموو زارۆکانی گومڕا دەکەم ﴾ (سورة الاسراء/٦٢).

**تا چ ئاستێك شەیتان مرازی خۆی له مرۆڤ دەست خستووه؟**

ئەوی چاو بە مێژووی مرۆڤایەتیدا بگێڕیٚ، سەرسام دەبیٚ لە ئاست گومڕا بوونی خەڵکی کە چۆن کتێبەکان و پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوەو، بە خودای پەروەردگاریان بێبڕوا بوون و ئافەریدەکانیان بۆ کردۆتە هەڤپشك و، هەروەك خودای بەرز دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ: هەرچەند تیٚبکۆشی و مکوڕ بی ، زۆربەری خەڵکی بڕوانا هێنن ﴾ (سورة یوسف/١٠٣).

بۆیە بەڕەوایی شیاوی توڕەیی و تۆڵەستاندنی خودا بوون ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَى كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُمْ بَعْضًا وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِقَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ: لە پاشان پێغەمبەرانی خۆمان یەك لەدوای یەك هەنارد، هەر کاتێك پێغەمبەرێك بۆ ڕێنوینی هۆزێك دەهات وەدرۆیان دەخستەوە، جا ئێمە ئەو ئومەتە سەرکێشانەمان یەك لەدوایەك لەناو بردو ئەوانمان کردە قسەی سەرزار، جا دوری لەبەزەیی خوا بۆ ئەو هۆزەی بڕواناهێنن ﴾ (سورة المومنون/٤٤).

ئێستاش لە کویٚ بڕوانین دۆستانی شەیتان دەبینین پڕی ئەم ژیانەن، بەیداخی شەیتانیان هەڵگرتووەو ڕێبیرەکانی بلاٚودەکەنەوەو، ئەشکەنجەو ئازاری دۆستانی خودا دەدەن، ئەوەش دەبتە بەڵگە کە شەیتان چەند مرازی خۆی لەگەڵ ئادەمیزاددا وەدی هێناوە، کە ڕۆژی رابوون خودای مەزن فەرمان بە ئادەم دەدا نێردەی دۆزەخ لە زارۆکانی خۆی دەربێنی، جا کە ئادەم لە بڕی ئەو نێردەیە پرسیار دەکا، پێی دەفەرمویٚ: نۆهەت ونۆ بۆ ئاگرو یەکێك بۆ

بەهەشت، لە گێڕانەوەیەکی دیکەشدا هاتووە: نوسەدو نۆهەت ونۆ بۆ ئاگرو یەکێك بۆ بەهەشت.

ئینجا بە هۆی ئەمە گومانەکەی راست دەبێ کە ئەم زارۆکانەی ئادەم نەپەندیان لە بەسەرهاتی بابیان وەرگرتووە، نە لە هی پێشینەکانیان، جا ئەو نەفرەت لێکراوە بەردەوام بەرەو تونابوون رایان دەماڵێ و دەیانهاژوا، بەڵکو جار هەیە پێشبڕکێ دەکەن بۆ دۆزەخ. چەند کرێتیشە کەگومانی دوژمن بە دوژمنەکەی راست دەرچێ: ﴿ لَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلاَّ فَرِيقًا مِنْ الْمُؤْمِنِينَ: شەیتان گومانی خۆی لەبارەی ئەوانەوە جێبەجێ کرد، لە دەستەیەکی بڕواداران بترازێ، ئەوانیدیکە هەمو پەیڕەویان لەشەیتان کرد ﴾ (سورة سبأ/٢٠).

دزێویە بۆ مرۆڤ کە گومانی شەیتانی لێ بەدی بێ‌و گوێڕایەڵی ئەو دوژمنەی بێ و لەپەروەردگاری خاوەن میهری یاخی بێ، مەسەلەکەش گەیشتۆتە ئاستێکی وا کە وەسف ناکرێ، دەبینین تایەفەی وا هەن لە عیراق و لە شوێنی دیکە خۆیان بە شەیتان پەرست ناو دەبەن، هەندێك نوسەرانیش دەبینین سوێند دەخۆن بە (حەقی شەیتان)، جا چ ماڵوێرانیەکە تێی کەوتوون.

**بیر لەزۆری تونابووان مەکەوە:**

وا چاکترە مرۆی ژیرو ئاوەزمەند بە زۆری تونابوان نەخەڵەتێ، چونکە زۆری هیچ بەهایەکی لە تەرازوی خودا نیە، بەڵکو بایەخ و بەها لە هەق دایە هەر چەند ژمارەی شوێنکەوتوانیشی کەم بن.

جا تۆ لە شوێنکەوتووانی حەق بە کە رازی بوون بەخودا وەك پەروەردگارو بەئیسلام وەك دین و بەموحەممەد وەك پێغەمبەر، ئەوانەی کە شەیتان یان شوێنکەوتووانی شەیتانیان ناسیوەو بەبوعزی دڵان و، گوفتاری زمان و،

نوسینی دەستان و، کرداری رەوان و، بەڵگەی بیانووان و، بەشیرو رمان، لە گەڵیاندا جەنگان، لە پێش ئەمانەشدا بە پەنا بردنەبەر خودای میهرەبان و دەست گرتن بە ئاینە پیرۆزەکەی.

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ، فَإِنْ زَلَلْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْكُمُ الْبَيِّنَاتُ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ: ئەی کەسانێکی کە بڕواتان هێناوە، هەمووتان بچنە نێو دینی ئیسلام، و ئاشتی و پەیڕەوی ڕێبازی شەیتان مەبن، بە راستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە، جا ئەگەر دوای ئەو هەموو نیشانە رۆنانە بخزێن و لاڕێ بن، بزانن کە بەڕاستی خودا توناو دانایە ﴾ (سورة البقرة/٢٠٨-٢٠٩).

لەخودا دەپارێینەوە بە منەت و ڕێزی خۆی بمانکاتە یەکێك لەوانەی بە تەواوی چونەتە نێو ئاشتیو، درودو سلاوی بێ پایانیش پێشکەش بە موحەممەدی بەندەو پێغەمبەری و یاروهاودەمانی.

# سەرچاوەکان


١) اغاثة اللهفان    لابن القيم.

٢) الإيمان بالملائكة    لأحمد عزالدين البيانوني.

٣) البداية والنهاية- لابن كثير.

٤) تفسير ابن كثير.

٥) تلبيس ابليس- لابن الجوزي.

٦) جامع الرسائل   لابن تيمية.

٧) دائرة المعارف الحديثة- لأحمد عطية.

٨) الروحية الحديثة- لمحمد محمد حسين.

٩) شرح العقيدة الطحاوية.

١٠) شفاء العليل- لابن القيم.

١١) صحيح الجامع- لناصرالدين الألباني.

١٢) العقائد الإسلامية- لسيد سابق.

١٣) الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان- لابن تيمية.

١٤) لوامع الأنوار البهية (عقيدة السفاريني).

١٥) مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية- جمع ابن قاسم.

١٦) الوابل الصيب من الكلم الطيب- لابن القيم.

١٧) جريدة القبس الكويتية.

١٨) جريدة الوطن الكويتية.

# فەرهەنگۆك

## تكایە ئەگەر واژەو دەستەواژەی نامۆت هاتنە بەرچاوان لەم فەرهەنگۆكە واتاكانیان بدۆزەوە.

## أ

**ئۆقرە:** ئارامی، هەدا، ئۆخژن.

**ئۆین:** فێڵ و مەكر، (كید)

**ئاخاوتن:** ئاخافتن، قسەكردن، پەیڤین، گوتن، وتویژ.

**ئاخیرزەمان:** دوایین دەمی دنیایێ.

**ئاستانە:** دەربار، بارەگا، پەنا.

**ئاشوب:** هەرا، پشێوی، (فتنة)

**ئاگرودو:** ئاگرو دوكەڵ، سوتمان، سوتەمەنی، دارودەوەنی سوتاندنیَ.

**ئافەرید:** وەدیهێنان، (خلق).

**ئافەریدە:** وەدیهێنراو، (مخلوق).

**ئافەریدكردن:** داهێنان، لەنوێوەدروستكردن، وەدیهێنان، خوڵقاندن.

**ئافەیدگار:** خودای وەدیهێنەرو داهێنەر.

**ئاكار:** خو، رەوشت، كردەوە، (اخلاق).

**ئالیك:** جەمەجۆی یەكسم.

**ئامۆژگار:** ئامۆژیار، پەنددار، نسحەتكار، (ناصح).

**ئاهۆ:** دەرد، پەتا، (هوام).

**ئاوارتن:** هەڵاواردن، جوایەزكردنەوە، (استثناء).

**ئاوەر:** یەقین، باوەڕێكی بەدڵنیایی، بڕواو متمانە.

**ئاوەز:** هۆش، فام، ژیری، عەقڵ.

**ئاوەزمەند:** خاوەن ئاوەز

**ئەریَ:** بەڵێ، ئاخۆ.

**ئەرخەیان:** ئارخەیان، خاترجەم، بێخەم، (مطمئن)

**ئەرژەنگ:** دێو، شەیتان، جنۆكەی زل و قەبەو ناشیرین و لەندەهۆر، عیفریت.

**ئەركبار:** ئەوكەسەی ئەرك و فەرمانێكی لەسەر شانە، (مكلف).

**ئەز:** من

**ئەزبەر:** لەبەر

**ئەزموناندن:** تاقیكردنەوە

**ئەزموندار:** خاوەن تاقیکردنەوە،(مجرب).

**ئەستێلك:** ئاسنێکە بۆ ئاگرتێکوەردان.

**ئەگینا:** ئەگەرنا، دەنا، ئەگین.

**ئەفراندن:** ئافەریدەکردن.

**ئەمشۆ:** ئەمشەو

**ئەنگۆ:** ئێوە، تۆو خەڵکیتر.

**ئەنگێزە:** هەڵایسێن، دنەدەر، هۆ، مایەی سەرەکی.

**ئەوەن:** ئەوەمان

**ئەوجە:** ئینجا

**ئیتقات:** بیروباوەڕ، (اعتقاد)

**ئیسرائیلزادە:** نەوەکانی ئیسرائیل، (بني اسرائیل)

**ئێشك:** پاس، (حراسة)

## ب

**بۆرژان:** بیرەخەو، نێوان بێداریو خەو، وەنەوز.

**بۆڵەبۆڵ:** پرتەپرت، بۆڵەی زۆری بەدوایەك.

**بۆمە:** بۆ ئێمە.

**بادی:** دەفر، جامی گەورە، قاپی مس.

**باربەر:** هەرچی باری بکەن و باری پێ بگوێزنەوە.

**بانگبەر:** بانگەوازکار، (داعي).

**بانگەشە:** چاوڕاو، شاتوشوت، (ادعاء).

**بانگەواز:** جاڕدان، بانگدان، (دعوة).

**باوێشك:** دەم داچەقاندن لەبەر خەوهاتن یا خاوبونەوە، بەنزین.

**بەتانچون:** بەتانوپۆداچون، تێداقوڵبونەوە.

**بەپێز:** بەماك و رەگەز.

**بەخورتی:** بەزۆری، بەزەبری هێز.

**بەدفەر:** بێفەڕ، شوم، بەدوم.

**بەر:** میوەی دارو بێستان، بەروبوم، (ثمرة).

**بەردار:** خاوەن بەر، (مثمر).

**بەرزگیری:** خۆبەرز گرتن، (علو).

**بەزایەدان:** فەوتاندن (تفریط).

**بەگژداچون:** مل دەبەر مل نان.

**بەنتکە:** ئەو متوموروەی بۆ چاوەزار دەکرێتە مل.

**بەندیواری:** پێکوە پەیوەستی، پەیوەندی، ( ملازمة).

**بەهەویاکردن:** بەهیواکردن، ئاوات وەبەرنان.

**بژێو:** رزق و رۆزی، ئەو خۆراکەی هۆی ژیانی مەردومە.

**برِیشکاندن:** ئامەزرۆیی تێرکردن، تینوێتی شکاندن.

**بلەز:** بەتالوکە، خێرا، بەپەلە، بەلەز.

**بنێشتەخۆشەی سەرزاران:** ئیدیۆمێکە بۆ ئەو کەسە یا شتەی بەکاردێت کە هەمیشە باس و خواسی لەسەرزاران بێت و زۆر قسەی لەسەر بکرێت.

**بوغزاندن:** رك لێبونەوە، (بغض).

**بێبەری:** بێبەش.

**بێژە:** ( لفظ).

**بێژنگ:** هێلەگ، مۆخل، سەرەند، قەلبێر.

**بێزراو:** قێزەون، لەبەرچاوان کەوتو.

**بیمناك:** ترسناك.

**بینا:** چاوساغ، چاوتیژ، زۆربین، ئاگا.

**بێنیاز:** کاربەکەس نا، تێروپر.

## پ

**پۆلیە:** پۆلو، پەنگر، سکل، سکەل، پەرمەنگ، پشکۆ.

**پارچەڵە:** منداڵی دەدوازدەساڵان.

**پارو:** تیکە، باڵۆلە.

**پارێزکار:** خۆپارێز، خاوەن تەقوا.

**پارێزکاری:** خۆپارازتن، تەقواکاری، خۆپارێزی.

**پاز:** ئاگاداری، ئێشك، هەڵبەزو دابەزکردن.

**پاساو:** پاکانە (تعلیل)

**پایان:** دوماهی، دوایی، کۆتایی، (خاتمة)

**پایەگا:** شوێنپایە.

**پەتك:** لەتەگوریس.

**پەتککردن:** گوریس دەمل خستن، هێنان و راکێشان بەسوکایەتی.

**پەرتەوازە:** پەرەوازە، لێك جوداو ئاوارە.

**پەرستش:** عیبادەت.

**پەرچو:** مۆجزات، (معجزة)

**پەرکەم:** خو، فێ، (صرع)

**پەلکێشکردن:** پەل راکێشان.

**پەنهان:** پیوار، نەدیو، شاراوە، بزر، گوم، پۆشراو، غەیب.

**پەنهانزان:** ئەوی بە پەنهانان شارەزایە.

**پەی پێبردن:** ڕێپێبردن، تێگەیشتن، زانین، (ادراك).

**پەیوەست:** بەندیوار، پەیوەند، چتێکە بەیەکی دیەوە نوسابێ.

**پڕێدایێ:** توخنی کەوت، چوەلای؛ پڕێپێداکرد، تێی ڕوهات، لێیەنەوی.

**پسولە:** کارت.

**پشتیوانان:** موسڵمانانی مەدینە کە پاڵپشتی پێغەمبەرﷺ ویارانی مەککەیان کرد، (انصار)

**پشی:** هەناسە، بێهن، پشو، نەفەس.

**پنتك:** خاڵ، پرتك.

**پیتۆڵ:** زۆرزان، بلیمەت، فەیلەسوف.

**پێخوست:** شوێنپێ، شتێکە بکەوێتە ژێرپێیان، شوێنێکە زۆر هاتوچۆی بەسەردا بکرێ.

**پێشاو:** ئاودەست، دەست بەئاو گەیاندن.

**پێشبین:** کاهین

**پێشی:** پێشوو

**پێکان:** هەنگاوتن، (طعن)

**پێناو:** کەسێکە لەبەینی دوان هاتوچۆ بکاو هۆی پەیوەندی بێ، (وسیط).

**پیوار:** پەنهان.

**پیوارزان:** پەنهانزان

**پێی بەغارێوەنا:** هەڵات، بەغاردان ڕۆیشت.

**پێیان هەڵێنا:** سوك و خێرا ڕۆیشتن.



**تۆژەر:** کۆڵەرەوە، ئەو کەسی بەبنج و بناوانی کەسێك یا کارێکدا دەڕوا، (باحث).

**تۆفدان:** لەناوچون

**تارەت:** ئاو بەهتنگەوەدان دوای ڕیان، (استنجاء).

**تازەگەری:** نوێخوازی، (الحداثة).

**تاسە:** ئارەزو، ئەزرەت، حەز.

**تاق:** تاك، بێهاوتاو بێوێنە؛ میچیبەکەوانە؛ دەلاقە.

**تایترازو:** لایەکی تەرازو.

**تایەفە:** تایفە، (طائفة).

**تەرۆك:** لاتەنیشت، (جنب).

**تەشەنە:** تەشەنا، پێوەچون، بەلاڤبون، وەبندانەوە.

**تەڵەکە:** حیلە، گەڕ، گزی، (کید).

**تەماشاگە:** ئەو شوێنەی لێوەی تماشا دەگری، روانگە، (مرصد).

**تەنێ:** تەنیا، لەگەڵ کەس نا.

**تەومزەل:** تەمبەڵ، تەپ، لەشگران.

**ترازان:** جیابونەوە، لێک کلابون.

**ترازو:** ئامرازی کێشان و کێش بەسەنگ کردن.

**ترکزە:** بڤە، خەتەر، (خطر)

**تفاق:** زەخیرەی بژێوی زستان، کاو گیای ماڵات بۆ زستان.

**توخنکەوتن:** چونەلا، لەگەڵ جوتبون.

**تونابون:** لەناوچون، بەهیلاکچون، (هلاك)

**تیپ:** دەستەیەك، (سرية)

**تیختیخە:** وەسوەسە، دەنەدان.

**تێراخوڕین:** بەتوندی خۆ لێتورەکردن.

**تێراو:** تێرئاو، پاراو، ئەوی تینونەبێ.

**تیز:** تەوس و گاڵتەپیکردن.

**تێکچرژاو:** چرووپر، تێکەڵاو.

## ج

**جۆرك:** کیسەی گەورە، تورەگە.

**جارومیە:** جاری واهەیە

**جان:** گیان، رەوان.

**جاویدان:** ئەمر، هەرماو، (خالد).

**جەلجەلوت:** دوعاو پرتەپرتی جادوگەر.

**جەور:** ستەم، زۆلم

**جوڵنلە:** ئەوی بەسەر زەویدا دەڕواو دەجمێ، (دابة)

**جیاڕایی:** بیروڕای لێك جودا (اختلاف).

## چ

**چۆلەوانی:** چۆل، بیابان، خاڵی، پێچەوانەی ئاوەدانی.

**چارەساز:** چارەکار، (معالج).

**چایکاتەوە:** چارەی بکا، تیماری بکا.

**چەپاڵە:** پارازتن، بەهاناوەهاتن، فریاکەوتن.

**چەپەڵ:** ناخاوێن، پۆخڵ، چڵکن، گەن، بەد، پیس.

**چرەدوکەڵ:** دوکەڵی زۆر توندو بەپێت.

**چرپەچرپ:** سرتەسرت.

**چنگ:** مشت، مست، چەنگ، چنگورك، پەنجەونینۆك پێكەوە.

**چنگورك:** چنگ.

**چنینەوە:** بژاردن، کۆکردنەوەی دەنکیرژاو، (التقاط).

**چونکی:** چونکە.

**چینە:** ملوموشی باڵندە لەزەویدا بەشوێن خواردن و دانەوێڵە، دان هەڵگرتنەوە.

ح

**حەشارگە:** جێگەی خۆلێشاردنەوە، مکۆ، شاردگە.

**حەوا:** بڵند، بەرز، بەرەوژور، لای ژوری سەر، ئاسمان، بەرزی، بڵندی، هەوا.

خ

**خۆتێکردن:** لێنەوین، خۆ لەکاروبارو کێشەیەکەوەدان.

**خۆراوا:** رۆژاوا، رۆژئاوا.

**خۆرەلات:** رۆژەلات، رۆژهەلات.

**خۆشخواز:** (مستحب)

**خۆشنود:** شادمان، رازی.

**خۆشنودی:** شادمانی، رەزامەندی.

**خافلاندن:** سەرقالکردن، سەرلێتێکدان، مژیلکرن، فریودان.

**خەمسارد:** خەمسار،گوێنەدەر بەکار، خۆلەکاربوێر، سستەپەلە.

**خەیالپلاو:** خەیالیخاو.

**خراتر:** خراپتر

**خزان:** خزین

**خنحوك:** قورگ

**خو:** نەریت، خدە، فێ، پەرکەم.

**خودێ:** خودا

**خودار:** خاوەن نەریت، نەخۆش بەخو، پەرکەمدار.

**خێو:** خاوەن، خودان، مێردەزمە.

د

**دۆز:** کێشە، (قضیة).

**داب:** عادەت، نەریت، دامودەستور، یاقت.

**داخۆ:** داخوا، ئاخۆ

**داکردن:** بردنەژور.

**دامرکان:** داسەکنان، هەدادان، نەمانی گڕیئاگر، لەبزوتن کەوتن.

**دانوسان:** خۆڵ‌مەڵاسدان، کەمین گرتن.

**داهات:** قازانج، سود، دەرامەت.

**داوێنتەڕ:** داوێنتەڕ، داوێن پیس، زیناکار.

**دەبەنگ:** حۆل، گێژ، هێز، وڕ، کاس،(احمق)

**دەراسا:** لەناسایی بەدەر، سەراسا، (خارق).

**دەرامەت:** داهات، ئەو دەسکەوتەی گوزەرانی پێدەکرێ.

**دەرەقەت:** وێران، باشار، پێوەستان، دەرۆست.

**دەرداوێژرێن:** دەردەهاوێژرێن، دەکرێنەدەرەوە، (یستثنون).

**دەستبازی:** گەپوگاڵتەکردن بەدەست.

**دەستەبەری:** یاریکاری، یارمەتیدان، وەخۆگرتن، لەملەخۆگرتن.

**دەستەمۆ:** کەوی، رام.

**دەستەوسان:** ناچار، بێچارە، مەحتەل ماو.

**دەستساردی:** دەستگرانکردن لەئەنجامدانی کارێك، فێرەکارنەبون.

**دەستلێستاندن:** بەسەردازاڵبون، (تمکن).

**دەستومکەری:** دەست کردنەوە، دەست وەشاندن، داکۆکی‌لەخۆکردن.

**دەسکورت:** نەدار، هەژار، بێمایە.

**دەشتەکی:** لاگەیی، چۆڵنشین، سارانشین، (اعرابي).

**دەنگۆ:** (الشائعة).

**ددانەجیرە:** ددان بەگری نیشاندان.

**دڵاوا:** بەخشندە، دژی رژد و چروك.

**دڵراستی:** دڵپاکی (اخلاص).

**دڵکزی:** (خشوع)

**دنێ:** دنیا

**دنەدان:** هانەدان، هاندان، تاوتێدان.

**دیان:** خاچپەرست، فەلە، گاور، (نصراني).

**دێتەگۆ:** دەئاخێوێ، قسان دەکا.

**دیتن:** بینین.

**دێختە:** دەخاتە.

**دێو:** درنج، (غول).

ر

**رۆژهەڵاتچی:** رۆژهەڵاتناس (مستشرق).

**رۆژی رابون:** رۆژی قیامەت، رۆژی دوایی.

**رۆژیبەرێ**: رۆژی دوایی، رۆژی رابون، قیامەت.
**رۆزی**: رۆزی، زاد، بژێو.
**رابون**: قیامەت، هەستان، هەستانەوە، وەئاگاهاتنەوە.
**راتلەکان**: راوەشان، هەژان.
**راژە**: خزمەت.
**راز**: مەبەستی نهێنیو پەنهان؛ شاخیبڵند، تیشەبەردی سەرکێو.
**راستاڵی**: جێگەبرِواو متمانەیی، (استقامة).
**راستەقانی**: راستەقینە، حەقیقەت.
**راڤە**: لێکدانەوە، شرۆڤە.
**رام**: کەوی، کەمۆ، دەستەمۆ، خەرۆ.
**رایگوێزم**: بیگوێزمەوە
**رەشۆکی**: خەڵکی هەمەکی، (عوام)
**رەشاتی**: رەشایی، (سواد).
**رەها**: ئازاد، بەرەڵا، رایی، (مطلق).
**رشت**: مکوری لەسەر کاروبار، ئارەزویکارکردن، سوربون.
**رکەگرتن**: جنەگرتن، قینگرتن.
**رەوزن**: ناحەز، ناشیرین، دزێو، ئێسك قورس، (مسخ).
**رواڵەت**: (مظهر)
**روتەمەنی**: (خلاعة).
**روشکێنی**: تەریقکردنەوە، بەخۆداشکاندنەوە، (نهر).
**روکەش**: (ظاهر)
**روناهی**: روناکی، رۆشنایی.
**رێخت**: سروشت، تەحرودیدار، (فطرة).
**رێزانە**: پاداشت، بەخشش لەبەرامبەری کاری چاکدا.
**ریزپەڕ**: (شاذ).
**رێزپەری**: (شذوذ).
**رێنما**: رێنیشاندەر، رێشاندەر، (دلیل)

## ز

**زۆرانێ**: تێکومگلانی دوکەس بۆ یەکتر لەزەویدان، ملانە، ملانێ.
**زاخاودان**: مشتومالّ، جیلومو جەوهەر پەیداکردن.
**زادە**: فرزەند، بێچو.
**زارۆ**: فرزەند، منداڵ، وەچە.

**زارۆك:** زارۆ.

**زارۆڵە:** زارۆ.

**زەبەند:** زۆر، فرە، گەلێك، زەوەند.

**زەلام:** مرۆ، پیاو، مەردوم؛ گەورە، زل، مەزن، زەبەلاح.

**زەین:** هێزیبیرو تێگەیشتن، هۆش، (ذهن).

**زیادەڕۆیی:** پێهەڵبڕین، شولێهەڵكێشان، تێپەڕین، (افراط).

**زیانبار:** زەرەرمەند، زیانكار، زەرەرپێگەییو.

ژ

**ژەقنەموت:** زەقنەبوت، (زقوم).

**ژنەوتن:** گوێلێبوون، بەگوێ بیستن، ژنەوین.

**ژوان:** پێكگەیشتن لەجێگەیەكی دیاری، (موعد).

**ژیوان:** پاشگەز، پەژیوان، پەشیمان، گەڕاوە بۆلای خودا، تۆبەكار.

س

**سۆسیالیزم:** هاوبەشی، (اشتراكیة).

**سۆما:** روناكی چاو، هێزی دیتن، بینایی.

**ساغلەم:** ساخی، راستی، بێفێڵی، بێگەموكوڕی.

**سام:** ترس، زەبروزەنگ.

**سەراسا:** سەرئاسا، دەرئاسا، (خارق).

**سەرەنجام:** سەرئەنجام، ئەنجام، (عاقبة).

**سەرپشك:** هەڵبژاردن بەدەستەخۆ، (مخول).

**سەرڕشتە:** سەرپۆتك، سەردار، لێهاتو، سەرتا، لەكارزانین.

**سەرزەنشت:** سەرخستنەسەر، لۆمە.

**سەرسەخت:** كەللەڕەق، سەرڕەق.

**سەرگەردان:** سەراسیمە، سەرلێشێواو، پەشێو.

**سەركۆنە:** سەرزەنشت.

**سەركێشی:** سەرپێچی، پركێشی، پەتپسێنی، (كنود).

**سەرناسی:** (فراسة).

**سەرهاتی:** بەسەرهات.

**سەمەرە:** سەیر. سەرسوڕهێن.

**سەمەندۆك:**جلەوكردن، پەتككردن، بریتیە لەبەستنەوەی دەستوپێیەكی وڵاخی بەرزە.

**سەهەندەیی:** لاساری، بێگوێیی، (جحود).

**سرتەسرت:** سرپەسرپ، چرپەچرپ، پسەپس، بەنهێنی یەكتری دواندن.

**سرتەکردن**: ئەنجامدانی سرتەسرت، (نجوی).

**سروە**: **شنە**، بایەکیسوك، (نسمة).

**سمین**: کونکردن.

**سو**: سوێ، ئێش، ژان، پەرۆشی، زێدەبایی، سود.

**سواندە**: کەناریبانی، گوێسوانە، هەورەبان، (شرفة).

**سوتەنی**: سوتەمەنی.

**سوخۆری**: زێدەبایی خواردن.

**سود**: قازانج، سو.

## ش

**شاپ**: زللە، شەق بەپشتەپێ، (صفعة).

**شاخ**: قۆچ

**شاند**: رەوانکراوان، (وفد)

**شەپلە**: ئیفلیجی

**شەڕانی**: شەڕخوازی، شەڕاوی.

**شەڕەنگێز**: شەڕهەڵایسێن.

**شپرزەیی**: پشێوی، پەشۆکاوی، ئاڵۆزی، سەرلێشێواوی.

**شڵەژان**: شێوان، تێکچون، سەرلێتێکچون، شپرزەبوون، داچڵەکان.

**شمەك**: شتومەك، کاڵا، کەلوپەل.

**شوبهاندن**: پێچواندن.

**شوڵەدار**: شولك، توڵ، لکەداری باریك و درێژی براو.

**شون**: شوێنپا، شوێنەوار، شوێن، دوا.

**شوێنەکەوتە**: بەشوێنکەوتوو، (تابع).

**شوێنەوار**: شون، کەرخ.

**شێو**: جەمی ئێوارێ، (عشاء).

## غ

**غاریدا**: هەڵات

**غلۆرکردنەوە**: گلان، خلۆربونەوە، (دحرجة).

## ف

**فێ**: خو، پەرکەم.

**فریشتەی مەرگەوان**: (ملك الموت).

**فریودان**: خاپاندن، تەفرەدان، خەڵەتاندن.

**فیدار**: نەخۆش بەفێ، پەرکەمدار.



**ڤان**: ویستن، ئارەزو، (ارادة، مشیئة).



**قۆرت**: چاڵایی زەوی؛ بەڵاو چورتم.

**قۆزتنەوە**: لەحەواگرتنەوە.

**قۆنگرە**: بورجی سەرقەڵات.

**قاپقاپ**: پێڵاوی لەداردروستکراو.

**قەت**: هەرگیز، چجار.

**قەرتارە**: قەرتاڵە، تریان.

**قەشمەری**: تیزو گاڵتەجاڕی.

**قوتارکردن**: رزگارکردن، خەلاسبون، دەربازبون.

**قێزەون**: ئەوشتی مرۆ بێزی لێبکا.

**قیچ**: بڕ، کەمۆڵە، پیچ.



**کۆڕا**: کۆی راو بۆچونان پێکەوە.

**کۆڕایی**: کۆڕابون، (اجماع).

**کۆڵ**: تێڵەکە، بار، سەرشان، قەڵاندۆش؛ نوک پەڕیو.

**کۆمۆنیزم**: شیوعێتی.

**کۆمەك**: یارمەتی، ئاریکاری.

**کارا**: زۆرکارکەر، (فاعل، فعال).

**کارنامە**: بەرنامەی کار، پسولەی کارکردن، بەڕاویکردەوان(صحیفة الأعمال).

**کازاندە**: گلەیی.

**کەتیرە**: شیرەی وشکەوەبو، (صمغ).

**کەلەبەر**: دەرەتانی تەنگ، قەڵش لەشاخی بەردین.

**کەلێن**: کەلەبەر، چەپەر، دەرفەت.

**کەمین**: بۆسە، خەل، خۆداگرتن لەبۆسەدا.

**کەمینە**: کەمایەتی، (قلة).

**کەنیزەك**: قەرەواش، ژنی بەپارەکڕراو، (جاریة).

**کەوی**: رام.

**کردە**: (عمل).

**کردەنی:** (عملي)

**کلۆ:** کولله

**کلۆر:** ناوبەتاڵ.

**کو:** چۆن

**کوشتی:** ئاژەڵی سەربڕاو، (ذبیحة)

**کوندە:** دەفری زەلام لەچەرم بۆ ئاوتێکردن و کێشان.

**کوندەبۆ:** بومی زل، ئەو باڵندەیەی شەوان دەردەکەوێو بەشوم بەناوبانگە.

**کێشمەکێش:** نێوان ناخۆشیو زەناوچەقە.

## گ

**گۆشەنشینی:** دوورەپەرێزی، خانەنشینی، دورلەخەڵکی، (خلوة، اعتكاف).

**گۆکار:** بزوتن و کارکردنی زمان و دەست، قسەکردن و دوان.

**گۆلك:** گوێرەکە.

**گۆنگەل:** گۆنگەر، زەنازەنا.

**گۆوار:** گۆڤار

**گۆوانن:** نەرموشلکردن بەگوشین.

**گازکردن:** بانگکردن.

**گاڵەدان:** داخستن، قەپاتکردن.

**گاڵدان:** دنەدان، هاندان.

**گەف و گوڕ:** هەڕەشە.

**گەلەکۆیی:** گەلەکۆمەکی.

**گەمە:** گاڵتە، یاری

**گەندەخۆری:** پیسخۆری، کەسێك خۆراکی خراپ بخوا.

**گەندەڵی:** گەندی، رزیوی، (فساد).

**گەندی:** گەندەڵی.

**گەنی:** رزیو، گەنیو.

**گەنیو:** گەنی.

**گەوزین:** گەڤزدان، تلخواردن لەسەر تەنیشت.

**گردبوونەوە:** کۆبوونەوە

**گروازە:** لول

**گلان:** بەسەرڕوداکەوتن، پەرتبون، جوڵان لەجێگە، خلۆربونەوە.

**گنخان:** خۆگرانکردن، ترشان.

**گیانانیەکان:** (روحانیون)

**گیانیەکان**: (روحیون).

**گیروبەند**: پێومندبون، پەیوەستبون.

## ل

**لارێبون**: ناڤەرێبون، لەرێدەرچون، (انحراف).

**لاوەکی**: (جانبي)

**لەباتی**: لەجیاتی، لەبری.

**لە پای**: لەبەرامبەر، لەباتی، (مقابل).

**لەگەن**: دەفری زل، قاپی گەورە.

**لەقەە**: لوشکە، جوتە، شاپ.

**لەمەچێتر**: لەناوخەڵکی رەشۆکیدا بەجنۆکانی دەڵێن.

**لەمپەر**: بەرگر، کۆسپ.

**لێولانلێو**: پڕاوپڕ، دارماڵ.

## م

**مۆتەکە**: خەونی بەترس کە هەناسەی پیاو سوار دەکا، (کابوس).

**مۆرك**: (طابع).

**مۆڵگە**: جێگەی پشودانی گاران.

**مادەلایی**: مەرایی، کلکەسوتە، ماستاوکردن، چاپلوسی، کوسکێشی.

**مارانگاز**: مارگەزتو، (لدیغ).

**ماندی**: ماندو.

**ماهین**: ماین

**مایە**: ماوە، سەرمایە، دەسمایە.

**مەحەك**: عەیارپێو.

**مەزەب**: رارەو، (مذهب).

**مژیل**: سەربەکار، بەکارەوەخەریك.

**مژین**: مژتن، قوتدانی تەڕایی، (مص).

**مرۆ**: مرۆڤ، پیاو.

**مرۆزادە**: وەچەی مرۆڤان، (بني الانسان).

**مراز**: نیازیدڵ، (مراد).

**مکور**: سور لەسەر، یاخی، سەرسەخت.

**منداڵەهورتکە**: منداڵە ورتکە.

## ن

**نابەجێ**: نەشیاو، کارێك یا شتێکی نابەجێ.

**ناتەوانی**: دەستەوسانی، بێتوانایی، کەنەفتی، (عجز).

**ناچیز**: نارێك، خوێڕی، نابەجێ.

**نامۆ**: بیانی، بێگانە، غەریبە، غەوارە.

**ناهەموار**: نارێك.

**ناوزەدکردن**: ناودێرکردن، ناوبردن.

**نەبان**: خۆبوێر، دەنگ لێگۆڕیو.

**نەست**: پێچەوانەی هەست، (لاشعور).

**نەقۆلا**: زل و نالەبار، چەتەوڵ زلحۆرت، ناساز، نارێك، زەبەلاح.

**نەنگی**: شورەیی، عەیبە.

**نەینۆك**: ناوێنە

**نشینگە**: جێگەی دانیشتن، نیشتمان.

**نقرۆ**: نقوم، رۆچو.

**نوتەك**: تاریکایی خەست.

**نوشتە**: دوعای نوسراو، نوشتی، (تعویذ).

**نوێن**: پێخەف، کەلوپەلی‌خەو.

**نیان**: نەرم، (حلیم).

**نێردە**: گەلی رەوانەکراوان، (بعثة).

## و

**وادە**: بەڵێن، پەیمان، (وعد).

**وەئاگاهاتن**: بەخەبەرهاتن، رابون، هۆشیاربونەوە.

**وەبەرداکردن**: پەردەپۆش، (تلبیس).

**وەدەرمانێ**: دەرمانبکاتە دەرێ.

**وەگێڕە**: بگێڕەوە

**وێزە**: زگ، گیان، پەلاماری پەنامەکی بۆبردن.

**ویشك**: وشك، هیشك.

## ه

**هۆگر**: خوپێوەگرتو.

**هاتەڕایێ**: رازیبوو، ملیدا.

**هاتیە**: هاتوە

**هاژۆتن**: لێخوڕین، هاژوان، ئاژۆتن.

**هاموشۆ:** ئاموشۆ، هاتوچۆ.

**هاودرن:** هێنان.

**هاوشان:** هاوکوف، لەقەدرو پایەدا بەرامبەر، (کفوء)

**هاونشین:** هاونیشتمان، هیهەمان نشینگە.

**هاوێر:** لێك جوداکردنەوە، لێکدابڕین.

**هەتەری:** سوربون لەسەر مەبەست، (حرص).

**هەژمەت:** حەژمەت، تاو، سوێ.

**هەرێ:** پەیمان، بەڵێن، ئەرێ، بەڵێ، (استجابە).

**هەرزە:** هەرچیوپەرچی، لەوجڕ، خوێڕی، لاسار.

**هەرمان:** هەمیشەمان، بەردەوامی، نەمری.

**هەڕون:** بڕۆن

**هەس:** هەیە

**هەسارە:** ئەستێرەی گەڕۆك، ستارە، (کوکب).

**هەشبەسەر:** قوڕبەسەر، بەدبەختی.

**هەڤیشك:** هاوبەش

**هەڵاوارتن:** هاوێرکردن.

**هەڵپە:** تاسەی زۆر، پەلە، تالوکە.

**هەڵپشافتن:** پشاوتن، هەڵگلۆفتن.

**هەڵگێڕو وەرگێڕ:** ژێروژورپێکردن، ئەملاولاپێکردن.

**هەڵفریواندن:** فریودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن.

**هەڵمژین:** هەڵمژتن، قوم لێدان، (استنشاق).

**هەنجەت:** پەڵپ، بیانو، بەهانە.

**هەنگاوتن:** پێکان، لێدان.

**هەنگی:** ئەودەمی، ئەوکاتی، ئەوسا.

**هەوەنتە:** هەوانتە، خۆڕا، بێلێپێچانەوە.

**هەوێز:** کۆز، ئەوجێی لەبەهارو هاوین و پایزاندا ماڵاتی لێبکەوێ.

**هومێد:** ئومێد، هیوا، هەویا، ئاوات.

**هێنکەبڕان:** پشیسواربون، هەناسەبڕکێ.

## ی

**یەخسیر:** دیل، گیراو، ئەسیر.

**یەکدەنگی:** (اتفاق).

# رشتەی بابەتان